عەلی باپیر

# پوختەیەک دەربارەی ئیسلام

## لە ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا



## گووتەیێک دەربارەی بە (Pdf)کردنی ئەم کتێبە!

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان...

*ئەم کتێبە تەنها لە پێناو ئەوەدا کراوەتە (Pdf)، تاکوو خوێنەران و سوودلێوەرگرانی زیاترین، وە ئاسانکارییێکیش بێت بۆ ئەوانەی ناتوانن کتێب بکڕن، یا کتێب هەڵگرنین و، تەنها بە (Pdf) مەیلی خوێندنەوەیان هەیە. نەوەک بۆ ئەوەی کڕیارانی کەمبن لە کتێبخانەکاندا و، مەبەستمان بێت زەرەرو زیان بدەین لە نووسەر یا وەرگێڕ یا دەزگای بڵاوکەرەوە، یا هەر بابەتێکی نەخوازراوی تری لەم شێوەیە.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزو سوپاس و ستایش بۆ: نووسینگەی تەفسیر و جەنابی مامۆستا عەلی باپیر کە نووسەری کتێبەکەیە).

ئومێدەوارین: پارێزگاری لەم کێبەکە بکەن و، گرنگی بە خوێندنەوەی بدەن. وە (ببورن لە هەر هەڵەو کەم و کوتیێکمان). A.U.J

## بەرچاوڕوونیێک دەربارەی کێشەیەک لە کتێبەکەدا:

خوێنەری ڕێزدار... ئەم چاپەی کتێبە، کە چاپی ساڵی (2006)، نزیکەی (20)لاپەڕەی کێشەی تێدایە (هەندێکیان ناخوێندرێنەوە و بەتەواوی سپین) وە (هەندێکیشیان بە زەحمەت واتای ڕستەکانت بۆ ڕۆشەن دەبێت). کە هۆکاری ئەو کێشەیەش ئێمەی بە (pdf)کەرانی کتێبەکە نین، بەڵکوو کێشەکە لە دەزگای چاپەمەنییە، (ئەوەندەی ئێمە لێی ئاگاداربین) لەگەڵ ڕێزدا.

Scanned by CamScanner

# پوختەیەک دەربارەی ئیسلام

## لە بەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا

عەلی باپیر

تەفسیر

١٤٢٧ هەولێر ٢٠٠٦

Scanned by CamScanner

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ

**نوسینگەی تەفسیر**

ناوی پەرتوک: پوختەیەک دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا

ناوی نوسەر: عەلی باپیر

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی

نۆرە و ساڵی چاپ: ١٤٢٧ك – ٢٠٠٦ز

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن (٣٥١) لە کتێبخانەی گشتی هەولێری ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر لوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

Scanned by CamScanner

## پێشکەش بێ

- بە نەوەی ئیسلامی نوێ
- ئەوانەی کە تێدەکۆشن و دەیانەوێ
- سەری مرۆڤ بێجگە لە خوا (عزّ وجلّ) بۆ هیچکەش و بۆ هیچ شتێك دانەنەوێ
- تا لە دنیا:
- لە سەوداو مامەڵەی ژیان دا براوەبێ و نەدۆڕێ و، لە ئازادەمیزادیی نەشۆرێ لە دوا ڕۆژیش :
- لەبەردەم دادگای خوادا سەرفراز و سەر بڵند بێ، نەك ڕوو زەرد و شەرمەزار و تك تك ئارەقەی لێ بچۆڕێ !

Scanned by CamScanner

# پێشەکی چاپی نوێ

الحمد لله رب العالمين و صلى الله تعالى وسلّم و بارك على رسول الله محمد وآله أجمعين من الصَّحب والأزواج والقرابة و التابعين لهم بأحسانٍ إلى يوم الدين .

خوێنەری سەنگین و شیرین :

کتێبی ( پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) کە ئێستا نووسینگەی تەفسیر هەڵدەستێ بە چاپکردنەوەی وەك سەرجەم بەرهەمەکانی دیکەم . شوێن و پایەیەکی تایبەتی لە دڵی بەندەدا هەیە ، چونکە :

یەکەم : ((پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)) یەکەمین کتێب و نووسراوو نۆبەرەی بەرهەمەکانمە و کاتی خۆی - واتە بیست و سێ ساڵ لەمەوبەر- هەوڵم داوە گوشراو و شیلەی تێگەیشتنی خۆمی لەبارەی ئیسلامەوە تێدا بخەمەڕوو .

دووەم : ((پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)) تەفسیرو لێکدانەوەی سوورەتی (الفاتحة) یەو ، سوورەتی فاتیحەش وەك پێرست وایە، بۆ سەرجەم قورئانی بەرێز و هێڵە گشتی و سەرەکییەکانی ئیسلامەتی گرتۆتە خۆی، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ بەگەورەترین سوورەتی قورئانی داناوە، وەك لەم فەرمایشتەدا دەبینرێ :

{ عن أبي سعيد بن المُعَلّى رضي الله عنه قال : قال لي رسول الله ﷺ : ألا أعَلّمكَ أعظَمَ سورةٍ في القرآن قبل أنْ تخرج من المسجد ؟ : فأخذ بِيَدي فلما أردْنا



Scanned by CamScanner

أن نخرج ، قلت : يا رسول الله إنك قلت : أعَلّمكَ أعظَمَ سورةٍ في القرآن ! قال : ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ هي السبع المثاني والقرآن العظيم الذي أُوتيته}[1] .

جا لەم رۆژنەدا کە برایانی نووسینگەی تەفسیری بەرێز ئاگاداریان کردمەوە کە کتێبی ناوبراویان سەرلەنوێ تایپ کردۆتەوە و دەیانەوێ چاپی بکەنەوە ، سەرەڕای پرنیشیی و سەرقاڵیی زۆریشم پێیداچوومەوە و چاوم پێداگێڕایەوە ، بەڵام جگە لە چەند شوێنێکی کەم کە دەستکاری هەندێك وشەو تەعبیرم کردوە و هەندێك پەراوێزم بۆ زیاد کردوە، کتێبەکە کت و مت وەك خۆی هێڵراوەتەوە.

لێتان ناشارمەوە کە لە کاتی پێداچوونەوەی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) دا هەستم بە تام و چێژێکی تایبەتی دەکرد و گەلێك جار کلافەی بیروزەینم دەیگێڕامەوە بۆ هەندێك لە رووداوو بەسەرهاتەکانی ئەو ساکە ـ واتە چارەگە سەدەیەك لەمەو بەر ـ ، جا کاتێك بەراوردم دەکرد لە نێوان واقعیی ئەوسا و ئێستای کوردستان و خەڵکی کوردستان دا ، کۆمەڵێك جیاوازی گەورە گەورەم دەهاتەوە بەرچاو، لە هەموو بوارەکان دا : فیکریی ، سیاسیی ، نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، ئابووریی ...هتد ، کە دەتوانین بەگشتی بە (دەرووی خێر لێکردنەوە) تەعبیر لەو جیاوازییە گەورە گەورانەی نێوان واقعیی ئەوسا و ئێستای میللەتەکەمان بکەین ، هیواداریشم بەهەموو لایەکمانەوە بتوانین

---

(١) رواه البخاري و رواه إبن حبّان و الحاكم عن أنس ﷺ بلفظ قريب منه ، وقال الحاكم : صحيح على شرط مُسْلِم .



Scanned by CamScanner

سوپاسگوزاریی و وەفا بۆ خوای دادگەرویەخشەر (سبحانه و تعالی) بەجێ بێنین لەبەرانبەر چاکە و نیعمەتە لە ژمێرە نەهاتووەکانی دا .

هەروەها بوارێکی دیکەی تێدا دەرکەوتنی ئەو جیاوازییە گەورەیە لە ژیانی میللەتەکەمان دا بواری هۆشیاریی ئیسلامی و مسوڵمانەتی و دینداریی کردنی بەرچاو روونانەیە ، کە بێگومان لەوساوە تا ئێستا قۆناغی زۆر بڕاون و ئومێدیش وایە کە کاروانی بێداریی و جم و جۆڵ و چالاکی ئیسلامیی بەردەوام لەگەشەکردن و و پێش چوون دابێت تاکو گەیشتن بە دوا هەوارومەنزڵی خۆی کە هاتنەدی کۆمەڵگایەکی مسوڵمانی وایە کە بۆ هەموو کاروبارێکی ژیان و گوزەرانی شەریعەتی دادگەرانەی خوای بە بەرزەیی و کاربەجێ دەکاتە سایە و سێبەر و بەرنامە و رێبازی خۆی ، بۆ ئەوەی هەر بەختەوەریی دنیا و هەم سەرفرازیی و سەربەرزی داوڕۆژیش مسۆگەر بکەین .

کۆتایی ئەم پێشەکی یەش بەم چەند سەرنجەم دێنم :

١- خوێندنی سوورەتی فاتحە بە خێرایی و بێ حیکمەت نەکراوە بە مەرجی دروست بوونی نوێژ و بەشێکی هەرە گەورە و بنەڕەتی ، بۆیە پێویستە بەو پەڕی تێوەڕامان و لێورد بوونەوە و بیر لێکردنەوە وە بیخوێنین ، تاکو لە رووناکیی و بەرەکەتەکەی بەهرەمەندبین و پەی بەگەوهەرو مرواریە لەژمێر نەهاتووەکانی ببەین .

٢- ئەو کتێبەش کە لە زیندانی ئەمریکادا نووسیومە : (الإسلام يتجلى في كتاب الله) واتە (( ئیسلام لە کتێبی خوادا دەدرەوشێتەوە)) هێڵەگشتیەکانی هەر لەبەر رۆشنایی سوورەتی فاتحەدا نووسراون . واتە



Scanned by CamScanner

(مَتْن) ەکەی لە (الفاتحة) وەرگیراوە و (شرح) ی لە خستنەڕووی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە : کە سووڕەتی فاتحە ـ هەروەها سووڕەتەکانی دیکەش ـ دەریایەکی بێ سنوورە و هەرگیز گەواهی راستیەکانی کۆتایی یان نایەت و مرواری رازو نهێنی یەکانی تەواو نابن .

٣- رەنگە هەندێك وشەو تەعبیری ئەم کتێبە بۆ هەندێك لە خوێندەواران نامۆبن، بەڵام بەهۆی ئەو (فەرهەنگیلە) یەوە کە لەکۆتایی کتێبەکەدا هاتووە، ئەو گرفتە چارەسەر کراوە و هیوادارم خوێنەرانی بەڕێز لەو رووەوە دووچاری سەر ئێشە نەبن .

٤- لەکۆتاییدا هەموو لایەکتان بەو خوایە دەسپێرم کە سپاردە زایەناکات .

علی باپیر

٩ صفر ١٤٢٧/ ٩ ئازار ٢٠٠٦

سلێمانی

Scanned by CamScanner

# پێشەکی چاپی یەکەم

سوپاس و شوکرانە بۆ خوای پەروەردگاری کائینات، بەزەیی و ئاشتی لە خواوە پەخش بێت بەسەر گیانی پاکی موحەممەد و خزم و برادەر و شوێن کەوتووانی دا.

زۆر جاران دیتوومانە لۆمە و سەر کۆنەی باوکێك کراوە و رووی رەخنەی تێ کراوە، چونکە منداڵەکانی خۆی پشت گوێ خستوە و بەرهەڵدای کردوون و گوێی نەداوەتە پەروەردە کردن و ئامۆژگاری کردنیان.

هۆی ئەوەش ئاشکرایە،باوك مادام خۆی بە خاوەنی منداڵەکانی دەزانێ و ئەوانیش حەوجێی پەند دادان و رێنمایی کردنی وین، پێویستە لەسەری خۆیان لێ بەخەبەر نەکا و مشووریان لێ بخوات.

بێ گومان پەروەردگاری باڵا دەستیش خاوەن و بەدی هێنەری مەیە و ، ئەو نەبایە نە ئێمە و نە هیچ شتێکی دیکەش ناومان لە کوولەکەی تەریش دا نەدەبوو لە تاریکستانی نەبوون (عدم)دا بێ سەر و سۆراغ دەماینەوە.

ئینجا شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە ئێمە و هەر شتێکی تری ئەم بوونەوەرە حەوجێی رێنمایی و یارمەتی ئەو پەروەردگارە مەزنەین، وەك بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿یَاأَیُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ..﴾ ئەی خەڵکینە ئێوە گشت ئاتاجی خوان.



Scanned by CamScanner

بەڵێ وەدی هێنراوەکان تێکڕا هەروەك چۆن بۆ وەدی هاتنیان پێویستیان بە خوا هەیە، بۆ بەڕێوە چوون و بەردەوامیشیان بە هەمان شێوە.

بۆیە دەبینین ورد و درشتی ئەم جیهانە سەر لەبەر بە گوێرەی دەستوور و بەرنامەیەك بەڕێوە دەچن، کە لە لایەن خوای بە بەزەیی و باڵا دەستەوە بۆیان دیاری کراوە و بە موو لێی لانادەن.

سەیری گەردیلە و توخمەکان دەکەی یان خانە و شانەکان، سەیری زیندەوەر و مەگەزان دەکەی یان پەڕەوەر و ئاژەڵان، سەیری گژوگیا دەکەی یان دار و درەخت سەیری زەوی و مانگ دەکەی یان ڕۆژ و ئەستێرەکان ...هتد.

سەیری هەر شتێك بکەی دەبینی پابەند و گەردن کەچی ئەو یاسا و دەستوورانەیە کە لە لایەن بەدی هێنەرەوە بۆی دانراون و توانای سەرپێچی کردنی نیە.

باشە هەیاران ئینسانیش کە یەکێکە لە دانیشتووانی ئەم بوونەوەرە، دەبێ ڕیزپەڕ بێت لەم یاسا گشتییە؟!.

مرۆڤێك کە جێ نشینی خوا و سەرقافڵەی کاروانی بوونەوەر و سەر تۆپی کائینات و هەڵبژێرداوی خوایە، دەبێ بەرهەڵدای وڵاتی کرابێ و خەمی لێ نەخورابێ و هیچ حیسابی بۆ نەکرابێ؟!.

مرۆڤێك کە لەوی دا لە هەموو شتێك زیاتر سیفەتەکانی خوا دەدرەوشاونەتەوە و ڕەنگیان داوەتەوە دەگونجێ وێڵ کرابێ و پشت گوێ خرابێ. ؟!.



Scanned by CamScanner

ئینسانێك كە لە نێو هەموو كائیناتی خوادا دیاری كراوە و پەسەند كراوە بۆ تاقیكردنەوە لەسەر شانۆی زەوی و ماقوولە هێندەی ڕووەك وپەڕەور و ئاژەڵانیش مشووری لێ نەخورابێ و نەخشەی بۆ نەكێشرابێ؟!.

نە.....نە........شتی وا مەحاڵە و ناكرێ و نابێ.

چونكە ئێمە لە ژیانی دنیاماندا دەبینین ئەگەر بابەیەك بە تەنگ شتێكی ئاسایی‌یەوە بێ و خەمی‌ی لێ بخوات بۆ شتێكی گرنگ و بایەخ دار گەلێك بە تەنگەوە بوو وخەم خۆرترە، ئەو كەسەی خەم لە زەوی و زار ومەڵك و ماڵەكەی دەخوات حەوجار حەوجاریش خەم لە كەس وكار و ماڵ و منداڵەكەی دەخوات!.

خوای گەورە و كاربەجێش بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ... ﴾[1] واتە: هەرچی لە بوونەوەردایە تێكڕا بۆ وەی مەیسەر كردوە.

دیسان فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً ﴾[2] واتە: بێگومان ڕێزمان لە ئادەمییان گرتوە...وە بەسەر زۆر لە دروست كراوانمان دا ئیمتیازمان داونێ.

كەوابێ خوایەك خەم لە دار وبەرد وڕووەك و ئاژەل و ڕۆژو مانگ و.. هتد بخوات حەوجار حەوجار خەم لە ئینسان دەخوات، چونكە ئەو شتانەی تر لە ئەسڵدا بۆ خاتری ئینسان هێنراونەدی!

---

[1] الجاثية : ١٣

[2] الإسراء : ٧٠ .



Scanned by CamScanner

بەڵێ.......خوێنەری بەڕێز:

مادام پەروەردگاری مەزن مشووری لەم دنیایە خواردوە و یاسا و پەیڕەوی بۆ داناوە دەبێ مشووریشی لە مرۆڤ خواردبێ و بەرنامە و پەیڕەوێکی بۆ دانابێ، چونکە وەك پێشتر گوتمان: شت هەتا بایەخ دارتر و گرانمایەتر بێ زیاتر شیاوی پاراستن و چاوەدێری و بە تەنگەوە بوونە.

هەر بۆیەشە کە دەبینین خوای بە بەزەیی و باڵا دەست لە بەرەبەیانی نیشتەجێ بوون و ژیان دەست پێ کردنی ئینسانەوە لەسەر ئەم خڕۆکەیە پەیتا پەیتا بە چەند مرۆڤێکی شایستە و لە باران دا هەبوودا ڕێنموونی و پەیڕەوی خۆی بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانە کردوە و پێی ڕاگەیاندون و تێی گەیاندون کە :

کێ ئەم بوونەوەرەی خوڵقاندوە و چۆن و بۆچی؟!.

ئینسان لە کوێوە هاتوە و کێ هێناویەتی و بۆچی؟!

ئینسان پێویستە لەم سەر زەوی‌یە چ بکا و چۆن بژیەت و پاش مردن بۆ کوێ دەچێ و چی لێ بەسەردێت؟!.

بەڵێ..کتێبەکانی خوا بریتین لە دەستوور و بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤایەتی و پێغەمبەرانیش گەیەنەری نێوان خوا و مرۆڤایەتین.

هەڵبەتە هیچ کەسێکیش نیە وەك دروست کەر دروست کراوی خۆی بناسێ و لێی بەڵەد بێ ، تەنها خوای گەورەش بەدی هێنەر و پەروەردگاری مەیە و بێجگە لەویش هیچ کەسێکی دیکە ڕێی ناکەوێ بەرنامە بۆ بەندەکان دابنێ و سەرپەرشتی‌یان بکات، چونکە ئەو شارەزا و پسپۆرانەی کە ئامێران دروست



Scanned by CamScanner

دەکەن هەر بۆ خۆشیان (کەتەلۆک)ی ڕەگەڵ دەخەن و ڕوونی دەکەنەوە کە ئەو نامێرە ئاوایە وبەم شێوە کار دەکاو ئاوا سوودی لێ وەردەگیرێ و ئاوا تێك دەچێ و...هتد.

کەواتە پێویستە بەدی هێنەری هەر شتێك کێیە، سەرپەرشتی کەریشی هەر ئەوبێ نەك یەکێکی دیکە.

بێگومان هیچ کەسێکیش نیە هەرچەند گاورایەتی و بێ باوەڕیی فرە ژووڕا چووبێ و گەیبێتە پلەی فیرعەون بتوانێ بڵێ: ئەمن مرۆڤەکانم دروست کردوون!!.

جا هەر بروا بوونم بەم ڕاستیەش بوو وای لێ کردم بکەومە بیری نووسینی کورتەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر تیشکی سوورەتی فاتیحەدا.

بەم جۆرە لە تەفسیر و توێژینەوەی ئایەتی یەکەم دا دەرمان خستوە و سەلماندووشمانە کە بڕوا بەخوا بوون شتێکی سروشتی و خوارسکە لە دڵ و دەروونی ئینسانەکان دا، بۆ سەلماندنی ئەو راستیەش سێ بەڵگەی فەلسەفی بەهێزمان هێناونەوە کە هەر کەسێك بە بێ لایەنی لێیان تێ بگات بایی ئیقناع کردنی دەکەن.

هەر لە هەمان ئایەت دا ڕاستیەکی ترمان خستۆتە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە زاتی خوا بەر هەست (محسوس) نیە و ناتوانین ڕاستەوخۆ لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە بی ناسین، بەڵکو ناچارین لە ڕێی ئەو سیفەتانەیەوە بی ناسین کە لە شوێنەوارەکانیدا دەدرەوشێنەوە.



Scanned by CamScanner

لە ئایەتی دووەمیشدا ڕوونمان کردۆتەوە کە پەروەردگاریەتی خوا یانی چی؟ وە دەرمان خستوە کە سوپاس و ستایش بە تەنێ لایقی خوایە، وە ڕێزی هەست کردنمان بە منەت باریەتی و قەرزداریەتی لە ئاقار خوادا پەیوەندییەکی ڕاستەوانە (طردي) ی هەیە لەگەڵ ڕێژەی شارەزایی و بەڵەدیمان دا بەو دیاردە سروشتیانەی کە وەك ئاوێنەیەك وان بۆتێدا درەوشانەوەی سیفەتی سۆز و بەزەیی خوادا، دیسان ڕوونمان کردۆتەوە کە لە نێوان زانیاری و بڕوادا ئاشنایەتییەکی بێ وێنە هەیە و ئینسان هەتا پتر زانیار و شارەزا بێت زیاتر خوا دەناسێ و سەری بەندایەتی بۆ نەوی دەکات.

لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتی سێیەمیش دا ڕوونمان کردۆتەوە کە خوای بێ هاوەڵ و هاوتا لە ئەنجامی سۆز و بەزەیی و بەخشندەیییەوە بوونەوەری خولقاندوە و ویستوویەتی چاکە لەگەڵ غەیری خۆی دا بکا و لە کانی بوون بەشیان بدات. وە ڕامان گەیاندوە کە هەر تابلۆیەکی ئەم سروشتەی خوا گیان بکەینە جێی سەرنج و ڕامان بێجگە لە دەریای سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی خوای مەزن سەبارەت بە بەندەکانی هیچی ترمان ئایەتە بەر نیگا.

وە لە تەفسیری هەمان ئایەتدا ڕوونمان کردۆتەوە کە پەیوەندی نێوان خوا و ئینسان لەسەر بنچینەی خۆشەویستی دوو سەرە ڕۆنراوە و کۆشکی خواپەرستی لەسەر بناغەی دۆستایەتی و یەکتر خۆشویستن لە نێوان خوا سبحانەوتعالی و بەندەدا بیناکراوە.

لە دەمی تەفسیر کردنی ئایەتی چوارەمیش دا باسمان کردوە کە دوا ڕۆژ چیە و چۆنە و چۆن دێ و ئەنجامی چ دەبێ، وە سەلماندوومانە کە شتێکی



Scanned by CamScanner

پێویست و حەتمی‌یە و ڕوونمان کردۆتەوە کە بڕوا بە دوا ڕۆژ بوون چ کارێک دەکاتە سەر ژیانی مرۆڤ و چ تاوو تەئسیرێکی هەیە لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا.

لە تەفسیری ئایەتی پێنجەمیش دا ئاشکرامان کردوە کە پەرستن و خوا پەرستی یانی چی و بەکێ دەگوترێ خواپەرست و بنچینەی خوا پەرستی چیەو، ڕێی خوا پەرستی چۆنە و سیما و نیشانەی تاک و کۆمەڵی خواپەرست چیە و، پەیوەندی نێوان بڕوا و کردەوە چۆنە؟!

لە ئایەتی شەشەمیش دا ئاماژەمان کردوە بۆ ئەم ڕاستییە کە بێجگە لە خوا کەس شایستەی ئەوە نیە بەرنامە بۆ ئینسان دانێ و، هەموو ئەو بەرنامەو پەیڕەوانەی ئینسان دایناون بێجگە لە ڕۆژ ڕەشی و کوێرەوەری و سەرگەردانی هیچی دیکەیان لە هەگبەیدا نیە و، بێجگە لە ئیسلام گشت ڕێچکەکان هەڵەو ناتەواوو خوار و خێچن و بە کەڵکی ژیان نایەن.

لە تەفسیری ئایەتی حەوتەمیش دا ڕامان گەیاندوە کە بەرنامە و ئایینی خوا هیچ کاتێک بە بێ هەبوونی کۆمەڵێک کە لە ڕەفتار و کردەوەکانیان دا ئەو بەرنامەیە ڕەنگ دەداتەوە و جوودی نیە و قەت قەت لە شوێنێک دا مرۆڤی موسڵمان و کۆمەڵگای موسڵمان نەبێت، ناتوانێ دان بێنێ بە هەبوونی ئیسلامەتی‌دا لەو شوێنەدا، چونکە ئیسلام بیروباوەڕێکی میسالیانە نیە کە تەنیا لە دنیای بیر کردنەوە و خەیاڵدا هەبێ و هیچی دی، بەڵکو دەستوور و بەرنامەی ژیانە و دەبێ لە کردەوە و ڕەفتار و هەڵوێستی شوێن کەوتوانی‌دا هەبوونی بخاتە ڕوو بی سەلمێنێ.



Scanned by CamScanner

ئەمانەی گوتمان برێک بوون لەو ڕاستیانەی کە لە (پوختەیەک دەربارەی ئیسلام) دا خراونە ڕوو، ئومێدەواریشم ئەم کتێبە توانیبیەتی کەلێنێک لە کتێبخانەی کەم دەرامەتی کوردیمان دا پڕ کاتەوە و، توانیبیەتی ڕێی ڕزگاری و ژیانێکی مرۆڤانە بۆ کەسانێک ڕوون بکاتەوە کە گەرەکیانە وەک ئینسانان بژین .

هەر کەسێکیش بە خستنە ڕووی تێبینی‌یەک یان ڕەخنەیەکی بیناکەر یادم بکات، با سوور بزانێ قەڵس نابم و گەلێک گەلێک خۆشحاڵ دەبم و منەت بارم دەکات، خواش پشتیوانی هەموان بێت.



Scanned by CamScanner

# ئەم کتێبە و سوورەتی فاتیحە

چوومە خزمەت قورئانی قسە لە جێ و لە گوڵزاری لالەزاری شاگوڵێکی حەوت پەڕیم خواست، بە دەستی بەدەست نوێژەوە بە بن تفنگی ژێریم هەڵبردو بەربوومە هەڵمژینی بۆن و بەرامەی و بەسەرە پیتەکەی باریکی قامکی خەیاڵو بیر لە گوشینێی وەخۆ کەوتم، زۆری پێ نەچوو ئەوەندە گوڵاوەم لێ وەرگرت کە لە نێو شۆرشەی وشەی بە گرشە و ورشەی زمانی کوردی دا پێش کەشتانی دەکەم.

بەشکم خوا بکا جێی ڕەزامەندی خوا و سوود لێ وەرگرتنی گەل و پڕ کەرەوەی کەلێنێك بێت لە تا تەرازووی خێراندا لەو ڕۆژەی دا کە کەس دەفریا کەس نایە و منداڵی شیرە خۆرە لە حەژمەتان سەری سپی دەبێ و بابای لامەزەب و لە ڕێ هەتڵە بوو پەنجەی پەژیوانی دەگەزێ و خۆزگە دەخوازێ هەر گڵێ بایە و ڕووحی وەبەر نەهاتبایەوە و ئەو ڕۆژەی بە چاوان نەدیبایە.

بەڵێ خوێنەرانی ئازیزم !

بۆ خاتری وەی پوختەیەك دەربارەی ئیسلام بنووسم هانام بردە بەر قورئان و سوورەتی فاتیحەم لێ خواست، ئەو سوورەتەی کە لە نێو دوو توێی حەوت ئایەتان دا بە کورتی مەبەست و چەمکە سەرەکییەکانی قورئانی حاواندۆتەوە، وە لە ڕاستیدا دەتوانم بڵێم: فاتیحە وەك پێڕستێك وایە بۆ مەبەستەکانی قورئان، واتە هەر وەك چۆن پێڕستی کتێبێك ڕێ نموونیت دەکات بۆ هەموو ئەو



Scanned by CamScanner

مەبەست و واتایانەی لەوێدا باسکراون، فاتیحەش سەبارەت بە قورئانی گەورە و کشگێڕ (معجز) بە هەمان شێوە.

فاتیحە ئەو سوورەتە مەزنەیە کە لە گەورەترین دروشمی ئیسلام دا و لە پتەوترین پایەی بەرنامەی خوادا _کە نوێژە_ لە هەر شەوو ڕۆژێك دا پتر لە (١٧) کەرەتان بە سەر زاری موسڵمانان دا دێت!! وە نوێژێك ئەم سوورەتەی تێدا نەخوێنرێت وەرناگیرێ وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((لا صلاة لمن لم یقرأ بفاتحة الکتاب))[1] ، وە فاتیحە سروودێکی ئیسلامیيە بەسەر زاری ملیۆنەها موسڵمانەوە لە سەرانسەری دنیادا.

ئەمن یەکەبارێ خۆم زۆر جاران ڕاماوم و دەبیر کردنەوێ ڕاچووم، خوایە دەبێ بۆچی ئیسلام ئەو هەموو گرنگییەی بەو سوورەتە دابێ و هێندە موچبۆ بێ لەسەر دوو پات کردنەوەی؟!

هەڵبەتە ئەوەشم لە پێش چاو گرتوە کە ئیسلام بەرنامەی خوایە و هەموو یاسا و دەستوورەکانی لە شوێنی شیاوی خۆیاندا ڕۆنراون، چونکە هەموو شتێك لە شوێنی گونجاوی خۆیدا ڕۆنان یەکێکە لە سیفەتە بەرزەکانی خوایەتی خوای مەزن.

---

[1] بخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە لە (عبادە بن صامت)ەوە.



Scanned by CamScanner

## جا بەڕێزان:

ئەم نوسراوەی بەردەستتان ئەنجامی ئەو تێوە ڕامان و بیرکردنەوەیە، کە لەو بڕوایەدام هەر کەسێك سەرنجی بدات نهێنی گرنگی دانی ئیسلامی بەم سوورەتە بۆ دەردەکەوێ و دەزانێ ئەو ماستە چ موێکی تێدایە.

هیواداریشم ئەم نووسراوە بە ئارامی و بە وردی موتالآ بکرێ و ئەوەندە وەختەتان لێ وەچاو نەبێت کە لە گەڵی دا بەسەر دەبرێت، چونکە بە ڕاستی گفت و گۆو ئاخاوتنێك کە موسڵمان لە گەورەترین دروشمی ئیسلامیدا هەر شەوو رۆژێك چەند جار لە خزمەت پەروەردگاریدا دەیڵێ ، هەڵدەگرێ کە کتێبێکی چەند لاپەڕەیی دەربارە بخوێنێتەوە، تا بزانێ لەو گفت و گۆ و ڕاز و نیازەی دا چ دەگوترێ.

دەفەرموون خوێنەرانی موسڵمان با تاوێکی خۆش لە سێبەری یەکێك لە درەختە پڕ پیت و پیرۆزەکانی باخی قورئان دا بەرینە سەر.

با تۆزێك گوێ بۆ ئەو دەنگە نەمرەی قورئان ڕادێرین کە پتر لە چواردە سەدەیە بانگ دەکات، بانگی مرۆڤایەتی دەکات، تا ڕێنمایی بکات بۆ ژیانێك....بەڵام چ ژیانێك !

ژیانێك کە لەگەڵ سروشتی ئینسان دا دەسازێ!!

ژیانێك کە ئینسان تێیدا خەلیفە (جێ نشینی)ی خوایە!!

ژیانێك کە ئینسان تێیدا ڕێزی لێ دەگیرێ و وەك پاتاڵێکی خوێری و بەرهەڵدا سەیری ناکرێت!!



Scanned by CamScanner

ژیانێک کە مرۆڤ لە سێبەریدا تاقە هەڵوێستی ژیرانەی ڕاست دەنوێنێ لە ئاقار خوا و خەڵک و بوونەوەردا !!

ژیانێک کە دادگەری کۆمەڵایەتی ڕاستەقینەی تێدا دەچەسپێ لە نێو کۆمەڵدا !

ژیانێک کە هەموو ئینسانێک تێیدا ئازادە و خێوی بیر و ڕاو هەست و نەست و دەربڕینی خۆیەتی!

ژیانێک کە گەل ـتاک و کۆمەڵی ـ سەر بۆ هیچ هێزێک نەوی ناکا و چ بتان ناپەرستێ و بەتەنێ گەردن کەچی بەرنامەی خوادایە.

ژیانێک کە ئینسان تێیدا دوورە لە هەر چەشنە نەخۆشییەکی بیری و دەروونی و هەست بە ئاسوودەیی دڵ و ئارامی گیان و بەختیاری دەکات.

ژیانێک کە ئینسان تێیدا دەزانێ کێ خوڵقاندوویەتی و لەبەرچی و پێویستە چ بکا و چ نەکات و چۆن بژی و چۆن نەژی.

بە کورتی و بە کوردی ژیانێک کە لە ئینسان بوەشێتەوە، ئەو ئینسانەی کە لە لایەن خواوە بە چاکی خوڵقێنراوە و ڕێزی لێ گیراوە و بە سەرقافڵەی کاروانی بوونەوەر و خەلیفەی خوادا حسێب کراوە.

بەڵێ با تۆزێک لە بن سێبەری یەکێک لە درەختە پڕ پیت و فەڕەکانی باخی تەڕ و پاراوو گەشاوەی قورئانی مەزن دا ئارام بگرین و ئیسراحەت بکەین، خوای بە بەزەیی و باڵا دەستیش خونچەی دڵمان بە ئاوازی سروودی هەق پشکوێنێ و هەستی قورئان ویستی و ئینسان دۆستیمان بجووڵێنێ.

# سەرنج دانێکی گشتی لەم سوورەتە

وای بە چاك دەزانم بەری تونژینەوە و لێکۆڵینەوە دەربارەی هەر یەك لە حەوت (٧) ئایەتەکانی ئەم سورەتە سەرنجێکی گشتی لێ بدەین:

ڕێبازی ئیسلام بە ورد و درشتەوە بۆ ڕوون کردنەوەی دوو شتان هاتوە:

١. هەڵوێستی خوای گەورە لە ئاقار بوونەوەردا بە گشتی و ئینسان بە تایبەتی.

٢. هەڵوێستی بوونەوەر بە گشتی و ئینسان بە تایبەتی لە ئاقار خوای بەخشندەدا.

بەڵێ ئیسلام _ کە بەرنامە و ئایینی گشت پێغەمبەران هەبووە بە درێژایی مێژوو _ بۆ پێناسە کردنی یەك ڕاستی (حقیقە) هاتوە کە وەك سکەیەك دوو دیوی هەیە، دیوێکیان پەیوەستە بە خوداوە و ئەوی دیشیان بە ئینسانەوە ئەو ڕاستییەش بریتییە لە : (پەیوەندی بەندایەتی و خوایەتی).

ڕەنگە کەسانێك کە چاك لە چەمکی زاراوەی : (پەیوەندی بەندایەتی و خوایەتی) حاڵی نەبوون ، بێژن : جا چۆن ئایین و بەرنامەی خوا بەتەنێ بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو ڕاستییە هاتوە؟!

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم سەرسوڕمان و پرسیار کردنە لە مێشکی ئەوان کەسان دا سەر هەڵدەدات کە لە مەبەست و نێوەرۆکی وشەی خوایەتی (الألوهیة) و بەندایەتی (العبودیة) تێ نەگەیون، چونکە لە ڕوانگەی



Scanned by CamScanner

ئیسلامەوە گەورەترین ڕاستی لە بوونەوەردا دوو شتن: یەکەم : خوایەتی خوا، دووەم: بەندایەتی ئینسان.

لە ڕاستی یەکەمیان دوو یاسای گرنگ وەردەگیرێن:

أ- خوا بەتەنێ لە چاکە و بەخشندەیی خۆیەوە بوونەوەری خولقاندوە و غەیری وی هیچ کەس لە دروست کردنی بوونەوەردا داری لەسەر بەردی دانەناوە، کەواتە خودا بە تەنێ بەدی هێنەر و پەروەردگارە.

ب- هەر خوا بەتەنێ شیاوی پەرستن و گەردن بۆ کەچ کردنە، ئاشکراتر بڵێین: هەر ئەو بەتەنێ مافی پەرستران و بەرنامە ڕێژیی و یاسا دانانی هەیە، کەواتە خوا هەر بۆ خۆی فەرمانڕەوا و گەورەیە.

لە ڕاستی دووەمیشیان دا دیسان دوو یاسای گرنگ دەبینرێن:-

أ- مرۆڤ کە لە دوو توخمی گیان و خاك پێك هاتوە هەڵبژێراوی بونەوەر و خەلیفەی خوایە.

ب- ئینسان لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەتەنێ بەندە و خولقێنراوی خوایە، پێویستە تەنیا بەندە و مل کەچ و پابەندی بەرنامە و یاسای ویش بێت.

بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز:

ئەم سوورەتە دەربارەی ئەم دوو مەسەلەیە دەدوێ کە لە ڕاستیدا هەرچەندە بە دیمەن دوو شتن بەڵام وەك دوو دیوی سکەیەك بە هەردووکیان یەك ڕاستی پێك دێنن، کە گەورەترین ڕاستی یە و لەوەتی دنیا دنیایە هەیە و هەتا هەتایەش دەمێنێتەوە و گۆڕانی بەسەردا نایەت چونکە بە ماهیەت و



Scanned by CamScanner

ڕاستەقینەیەکەوە بەندە گۆڕانی مەحاڵە، ئایا ڕێی تێ دەچێت ڕۆژێك لە ڕۆژان خوا لە خوایەتی بکەوێ؟! یان ئینسان لە ئینسانەتی بشۆرێ؟!

دەجا هەتا خوا خوابێت و ئینسانیش ئینسان ئەم ڕاستیەیەش دەمێنێ.

ئێستا بۆ وەی ئەوەی لەمەوبەر گوتمان درەوشاوەتر بێ وەرن با ویکڕا سەرنجێکی خێرا لە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بەرزە بدەین:

لە ئایەتی یەکەم دا ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ ئەوە ڕاگەیەنراوە کە بڕوا بوون بە بوونی پەروەردگار شتێکی خوارسك و سروشتی‌یەو ڕاستی‌یەکە کە سروشتی بوونەوەرو ئینسان گەواهی بۆ دەدات.

لە ئایەتی دووەم دا ﴿الحمد الله رب العالمين﴾ یەکسەر بەندەکان دەڵێن: سوپاس و شوکرانە بۆ پەروەردگاری هەموو شتێك ، لێرەدا ئەوەی جێی تێوەڕامانە ئەوەیە کە هاتنی ئایەتی دووەم بە دوای یەکەم دا زۆر شتێکی گونجاوو مەنتقی یە چونکە ناسرانی خوا _ لە ئایەتی یەکەم دا _ گەورەترین و سروشتی‌ترین ئەنجامی سوپاس کردن و هەست کردنە بە چاکە و بەخشندایەتی یەکەی، وە هەر بابایەك خوا بناسێت بێ سێ و دوو هەست بە ناز و نیعمەتەکانی دەکا و خۆی قەرزدار و منەت بار دێتە بەرچاو.

ئینجا لە ئایەتی سێیەم دا وەك بەڵگە هێنانەوە بۆ دروستی و بەجێیی سوپاس کردنەکەیان دەڵێن: ﴿الرحمن الرحيم﴾ خوا بەخشندە و خاوەن بەزەییە، دیسان باس کردنی سیفەتی ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانی خوا لێرەدا زۆر چاك گونجاوە لەگەڵ بارودۆخی ئایەتەکان دا چونکە پەروەردگاری بوونەوەر ﴿ رب العالمين ﴾ لە ئەنجامی سیفەتی بەزەیی و بەخشندەییەوە کائیناتی لە دەریای نەبوون هێناوەتە دەر و بوونی پێ خەڵات کردوە.



Scanned by CamScanner

ئینجا لە ئایەتی چوارەم دا بەندەکان دانیان هێناوە بە فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵات دارێتی پەروەردگاردا لە ڕۆژی پەسڵان دا ﴿مالك يوم الدين﴾ بۆ هاتنی ئەم ئایەتەش بە دوای ئایەتی پێشوی‌دا دوو هۆی گرنگ هەن:

أ- لە کاتێك دا بەندەکان زانیان خوایەك هەیە و لایق و شایستەی سوپاس و ستایشە و بەخێوکەر و پەروەردگارە و خاوەنی بەزەیی و لوتف و بەخشە، هەستیان بەوە کردوە کە خوایەتی و پەروەردگارێتی و بەزەیی و بەخشندەیی خوا وای لێ چاوەڕوان دەکرێ کە ئەو ماوە کورتەی دنیا تاقە هەل و دەرفەتی تێدا ژیان نەبێت، ئەوە لەلایەکەوە لە لایەکی تریشەوە هەستیان بەوە کردوە کە خوایەتی و پەروەردگارێتی بەزەیی و میهرەبانی و دادپەروەریی خوا تێیرا دەبینرێ کە ڕۆژێك بێتە پێش چاکان بە پاشتی چاکیان و خراپان بەسزای خراپیان بگەن و هەقی بزنێ کۆڵە بەسەر بزنی شاخ دارەوە نەهێڵرێ و زۆر لێکراوو چەوسێنراوان کە لە دنیادا بە ئاواتی هەرە گەورەیان نەگەیون _ کە بریتی‌یە لە تۆڵە ستاندنەوە لە زۆردار و خوێن خۆران _ لەو ڕۆژەدا بە ئاکام بگەن و کرمی دڵیان بمرێ و بڵێن ئۆخەی.

ب- بەندەکان هەستیان بەوە کردوە کە پەروەردگار وێڕای سیفەتی بەزەیی و بەخشندەیی خەسڵەتی توڕەیی و قەهر و غەزەبیشی هەیە و نابێ کەس بە هەویا بەزەیی و میهرەبانی خوادا پشتێنێی لێ وەکا و پاڵی لێ وەدات.

ئەم چوار ئایەتەی ڕابوردن هەر چواریان پێشەکی و ڕێ خۆش کردنێك بوون بۆ ئایەتی پێنجەم ﴿إيّاك نعبد و إيّاك نستعين﴾ هەر ئەتۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش یارمەتی دەخوازین.



Scanned by CamScanner

ئێستا با تۆزێک بە وردی سەرنج بدەین .

چوار ئایەتی پێشوو دوو ڕاستی زۆر گەورەیان خستنە ڕوو کە عەقیدەی ئیسلامی یان لێ پێک دێت، یەکەم، بڕوا بوون بە خوایەتی خوا و پەروەردگاریتی و بەخشندەیی و بەزەییێتی وی، دووەم: بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی و سزا و پاداشت.

ئێستا کە بەم ئەنجامە گەیشتین دەتوانین نێوەڕۆک و کاکڵی ئەم سوورەتە لە چەند قاڵب و شێوەی جوێ جوێدا دارێژین کە لە مەبەست دا یەکن:

دەتوانین بڵێین چوار ئایەتی پێشوو بریتین لە لایەنی عەقیدە و بڕوا و سێ ئایەتی داهاتووش لایەنی یاسا و بەرنامە پێک دێنن، لە هەموانیش ئاشکرایە کە ئیسلام لە دوو بەشی سەرەکی بڕوا و بەرنامە (العقیدة والشریعة) پێک دێت.

وە دەتوانین بڵێین چوار ئایەتی پێشوو بریتین لە لایەنی باوەڕ (ایمان) و سێ ئایەتی دواییش لایەنی (عمل) پێک دێنن، وەک ڕوونیشە ئیسلامەتی باوەڕ و کردەوەیە (الایمان و العمل) .

وە دەتوانین بێژین چوار ئایەتی ڕابوردوو بریتین لە بڕوا (ایمان) و سێ ئایەتی دواییش بریتین لە ئیسلامەتی (اسلام) ئەمما بە مەرجێک کە وشەی بڕوا لێرەدا قەناعەتی دەروونی پێ مەبەست بێ و وشەی (اسلام)یش گەردن کەچی ڕواڵەتی.

Scanned by CamScanner

ئاشکراشە کە ئایین بریتی‌یە لەوە کە ئینسـان بە دڵ و دەروون بـڕوا و قەناعەتی پێ بێ و بە ئەندامەکانیشی فەرمانەکانی جێبەجێ بکا و پابەنـدی بێ.

دەشتوانین بڵێین چوار ئایەتی هەوەڵی (جیهان بینی ئیسلامی) دەخەنە روو و سێ ئایەتی دواییش (ئیدۆلۆژی ئیسلامی)، دیارە کە ئیسلامەتیش لە دوو بەشان پێك دێت: یەکەم جیهان بینی ئیسلامی، یانی هەڵوێستی بیری و تیۆری مرۆڤ بەرامبەر بە خوادا و بوونەوەر و ژیان، دووەم: ئیدۆلۆژی واتە هەڵوێستی کرداری و پراکتیکی مرۆڤ _ لەسەر بنچینەی جیهان بینی _ بەرامبەر بە خوا و بوونەوەر و ژیان.

بۆ ینەوە سەر مەبەستی بنچینەیی، گومان چوار ئایەتی رابردوو پێشەکی و رێ خۆشکەرن بۆ ئایەتی پێنجەم، چونکە کاتێك ئینسان زانی خوایەك هەیە و زانی کە بەدیهێنەرە و پەروەردگارە و شایستەی سوپاس و ستایشە و لە چاکە و بەخشندەیی خۆی بوونی بە بوونەوەر بەخشیوە و بە تەنێ بەڕێوەبەر و گەورەی رۆژی سزا و پاداشتە، ئەو زانین و بڕوایە ناچاری دەکات کە گفت و پەیمانی پێ بدات کە بەتەنێ گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەری وی بکا و یارمەتی هەر لەوی بخوازێ و جگە لەوی چاوی لە دەستی کەس نەبێت.

ئایەتی شەشەمیش ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾ { رێنموونیمان بکە بۆ رێگای راست }. پەیوەندی‌یەکی پتەوی بە ئایەتی پێنجەمەوە هەیە و توند پێکەوە جۆش دراون، چونکە گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەری خوا و گەیشتن بە ڕەزامەندی وی پێ و ڕەسم و بەرنامە و دەستوورێکی گەرەکە کە بریتی‌یە لە (ڕێگای



Scanned by CamScanner

ڕاست)، بۆیە بەندەکان داوا لە پەروەردگاریان دەکەن کە ئەو ڕێیە ڕاستەیان پێشان بدات، دیارە ڕێی ڕاستی ژیانیش تەنیا ڕێباز و ئایینی خوایە.

جا لەبەر ئەوەی بەرنامە و ئایینی خوا قەت قەت بە شێوەی تیۆری و گوفتاری ڕووت نەبووە و نابێ و وێڕای ڕاستە شەقامی خوا و کۆمەڵی چاکان و خوا پەرستان کوێرە ڕێی شەیتان و تاغووت و دەستەی بەدان و خۆپەرستانیش هەیە، بۆیە بەندەکان بەهێندێ واز نایەنن کە داوایان لە خوا کردوە ڕێی ڕاستیان پێشان بدات ، وە دەڵێن: ﴿صراط الذين انعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾ واتە: ڕێی پێڕی چاکان ئەوانەی چاکەت لەگەڵ دا کردوون، نەک ئەوانەی شایستەی قەهر و غەزەبن، وە نەک گومڕا و سەر لێ شێواوان.

ئێستا کە بەشێوەیەکی گشتی تۆزێك سەروسیمای ئەم سوورەتە مەزنەمان ناسی با ناوی خوای لێ بێنین و دەست بکەین بە ورد بوونەوە لە هەر کام لە حەوت پەلکە خنجیلانەکانی ئەم شاگوڵەی گوڵزاری گوتاری پەروەردگاری کائینات.



Scanned by CamScanner

## مانای دەقا و دەقی سورەتەکە

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ(١)الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ(٢)الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ(٣)مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ(٥)اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ(٦)صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ. ﴾ آمين

واتە:

(بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان بە بەزەیی بەخشندەیە، خاوەنی ڕۆژی سزا و پاداشتە، بەس ئەتۆ دەپەرستین و هەر لە تۆ یارمەتی دەخوازین، ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێی ڕاست، ڕێی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ دا کردوون نەک ڕێی لێ تووڕە بوان و نەک گومڕا بوان) دووعامان قبوڵ بکە.

## چەند تێبینیەک دەربارەی ئەم سووڕەتە

یەکەم: ناوەکانی ئەم سووڕەتە:

أ- (فاتحة الكتاب) بۆیەش بەم ناوە ناونراوە چونکە قورئان بەم سووڕەتە دەست پێ دەکات.

ب- (سورە الحمد) چونکە یەکەمین وشەی لە دوای ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ (الحمد)ە.

ج -(امّ القرآن) وشەی (ام) لە زمانی عارەبی دا یانی : ئەسڵ و ماکی شت، هەڵبەتە ئەم سووڕەتەش ئەسڵی قورئان و پوختەی ئیسلامە.



Scanned by CamScanner

د- (السبع المثاني) ، وەك خوای كاربەجێ لە یەكێك لە ئایەتەكانی كۆتایی سوورەتی (الحجر) دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾، هۆی ناونرانی ئەم سوورەتەش بەم ناوەوە توێژەرەوانی قورئان چەند ڕایەكی جۆ جۆێ یان هەیە لەبارەیەوە:

١) چونكە لەم سوورەتەدا ئینسان سوپاس و ستایشی خوا دەكات.

٢) چونكە ئەم سوورەتە لە هەموو ڕكاتێك دا دووبارە دەكرێتەوە.

٣) چونكە دوو جاران نێراوەتەخوارێ لەسەر قسەی هێندێك لە زانایان.

٤) چونكە لە كتێبە ئاسمانیەكانی تردا نیە و هەڵاوێرراوە.

٥) چونكە ئەم سوورەتە دوو بەشە بەشێكی سوپاس و ستایشە لە بەندەوە بۆ خوا و بەشێكیشی بەخشینە لە خواوە بۆ بەندە.

هـ- الكافیە (واتە تێر و تەواو، چونكە ئەم سوورەتە دەتوانێ جێی غەیری خۆی پڕەكات بەڵام غەیری وی جێی پڕناكاتەوە.

و- (الاساس) واتە: بنچینە ، چونكە بنەڕەتی ئیسلامەتی تێدایە.

ز- (الشفاء) شیفا و دەرمان، چونكە دەرمانی ڕوح و نەفسە.

ح- (الصلاة) واتە: نوێژ ، چونكە بەشی سەرەكی و هەرە گرنگی نوێژە.

ط- (الشكر) واتە شوكرانە، چونكە سوپاس و شوكرانەی خوای تێدا دەكرێت.

ی- (الدعاء) واتە: پاڕانەوە وسكالا، چونكە بریتی یە لە پاڕانەوەی بەندە.



Scanned by CamScanner

## دووەم: چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە:

لە چۆنیەتی هاتنە خواری ئەم سوورەتەدا (٣) قسە هەن:

١- دەڵێن لە شاری مەککە هاتۆتە خوارێ تەنانەت هەندێکیان دەڵێن یەکەمین سوورەت بووە کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوە، کە شێخ (محمد عبده) یەکێکە لەوانە و لەو بارەوە دەڵێت:

(بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە کە دەستووری خوا چ لە بواری بەدی هێنان (تکوین) و چ لە بواری یاسادانان (تشریع)دا وایە کە پێشەکی بە کورتی شتێك دەخاتە ڕووەدوایی پلە پلە دەست دەکات بە خستنە ڕوو و شەرح کردنی.

(....فاتیحەش هەرچی لە قورئان دا هەیە بە کورتی دەیگرێتە نێو خۆی، وە هەرچی لە قورئان دا هەیە شەرح و تەفسیری ئەو بنچینانەیە کە لە فاتیحەدا ڕۆنراون.........)[1].

٢- دەڵێن لە شاری مەدینەدا هاتۆتە خوارێ، بەڵام ئەم قسەیە هەڵەیە بە دوو بەڵگـــان:

یەکەم: سوورەتی (الحجر) کە بە ئیتیفاقی زانایان لە شاری مەککەدا هاتۆتە خوارێ باسی سوورەتی فاتیحە و هاتنە خواری دەکات وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ ﴾.

[1] سەیری (الاعمال الكاملة للشيخ محمد عبده) بکە بەرگی (٤) لاپەڕە (٢٤_٢٥).



Scanned by CamScanner

دووەم: زۆر دوورە کە پێغەمبەر و موسڵمانان (١٣) ساڵان لە مەککە بە بێ فاتیحە نوێژیان کردبێ.

٣.قسەی سێیەم : دەڵێن: ئەم سوورەتە کەرەتێکی لە شاری مەککە و جارێکیش لە مەدینە هاتۆتە خوارێ، دەشڵێن بۆیە ناونراوە (المثاني) چونکە هاتنە خوارەوەکەی دووبارە کراوەتەوە.

## سێیەم: حوکمی خوێندنی ئەم سوورەتە لە نوێژدا:

لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کە هەر نوێژێك ئەم سوورەتەی تێدا نەخوێنرێ قبوڵ ناکرێ و ناتەواوە.

بۆ نموونە : بخاری و مسلم لە (عبادە بن صامت)ەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب)).

ئیمامی ڕازی بێجگە لەم ڕیوایەتە دوو ڕیوایەتی تریش لە تەفسیرەکەیدا باس دەکات:

١.((كل صلاة لم يقرأ فيها بفاتحة الكتاب فهي خداج غير تمام)).

٢.((لا تجزيء صلاة لا يقرأ فيها بفاتحة الكتاب)).

هەڵبەتە لە مەزەبی (حنفی) دا بە مەرج نەگیراوە کەئەم سوورەتە بخوێنرێ و دەڵێت ئەگەر لە سوورەتەکانی تریش بخوێنرێ هەر تەواوە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت بەڵگەی ئەوانەی کە خوێنرانی فاتیحەیان بە مەرج گرتووە لە نوێژدا بەهێزترە، ئەمما ئێرە جێی ئەو درێژە پێدانە نیە کێ مەیلی لێ بە پتر ئاگادار بێ لەو بارەوە با سەیری (التفسير الكبير) ی (فخرالدين الرازي) بکات، لەوێدا



Scanned by CamScanner

ئیمامی ڕازی (١٨) بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی ئەوە کە خوێندنی فاتیحە مەرجە لە نوێژدا.

## چوارەم: بەراوردێك لە نێوان ئایەتەکانی فاتیحە و کردەوەکانی نوێژدا[1]:

ئایەتەکانی فاتیحە حەوتن،کردەوەکانی نوێژیش حەوتن و پێکەوە گونجاوین بەرامبەری یەکی تەواو هەیە لە نێوان ئایەتەکانی فاتیحە و کردەوەکانی نوێژدا بەم جۆرە:

١.﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ _ (القيام) ڕاوەستان بۆ خوێندنی فاتیحە.

٢.﴿الحمد لله رب العالمين﴾ _ (الركوع) چوونە ڕکووع و نوشتانەوە.

٣.﴿الرحمن الرحيم﴾ _ (الرفع من الركوع) هەستانەوە لە ڕکووع.

٤.﴿ملك يوم الدين﴾ _ (السجدة الاولى) کڕنووش بردنی هەوەڵ.

٥.﴿إيّاك نعبد و اياك نستعين ﴾_(القعود بين السجدتين) دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکان.

٦.﴿اهدنا الصراط المستقيم﴾ _ (السجدة الثانية) کڕنووش بردنی دووەم.

٧.﴿صراط الذين انعمت عليهم _ (التشهد) خوێندنی تەحیات.

﴿غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾.

(١) ئەم بەراورد کردنەم بە دەستکارییەوە لە تەفسیری (مفاتيح الغيب) ی فخر الدين الرازي وەرگرتووە.



Scanned by CamScanner

ئێستا با سەرنج بدەین داخوا ئەو بەراورد کردنە تا چ ڕاددەیەك لراوە:-

ئایەتی یەکەم لەگەڵ (قیام) دا دەگونجێ چونکە هەروەك چۆن ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ بۆ دەست پێ کردنی هەر کارێك پێویستە ڕاوەستان (قیام)یش بۆ دەست پێکردنی نوێژ پێویستە.

ئایەتی دووەمیش لەگەڵ (رکوع)دا دەگونجێ چونکە ئینسان لە وەختی سوپاس کردن دا لەیەك کات دا سەیری خوا و بوونەوەر دەکات، لەبەر ئەوەی سوپاس و ستایش و مەدح کردنی خوا بەهۆی ئەو نیعمەتانەوەیە کە بە بەندەکانی بەخشیوە مادام وابێ بەندە لە دەمی سوپاس کردن دا چاوێکی لە خاوەنی نیعمەتەوەیە و چاوێکیشی لە خودی نیعمەتەکەوە، کەواتە پێویستە حاڵەتێکی مام ناوەندی هەبێ، دیسان سوپاس کردن دەلالەت لەسەر نیعمەتی زۆر دەکات نیعمەتی زۆریش پشتی ئینسان گران دەکا و دەبێتە هۆی نوشتاندنەوە و دوولا هاتنەوەی.

ئایەتی سێیەمیش لەگەڵ (هەستانەوە لە ڕکوع)دا دەسازێ، چونکە پاش ئەوەی بەندە چووە ڕکوع وا لە ڕەحمەتی خوا چاوەڕوان دەکرێ کە لە دوای ڕکوع بیگێڕێتەوە بۆ حاڵەتی (اعتدال) ڕاست بوونەوە.

ئایەتی چوارەمیش لەگەڵ (کڕنوش بردنی یەکەم) دا دانووی دەکوڵێ، چونکە ﴿ملك يوم الدين﴾ گەورەیی و جەلالی خوای لێ دەفامرێتەوە، بێگومان ئەوەش دەبێتە هۆی پەیدا کردنی ترس و سامێکی زۆر لە دڵی ئینسان دا و وا لە ئینسان دەکات کە لەوپەڕی بەندایەتی و گەردن کەچیدا خۆی بنوێنێ.



Scanned by CamScanner

ئایەتی پێنجەمیش لەگەڵ (دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکان)دا هەڵ دەکات، چونکە ﴿إيّاك نعبد﴾ هەواڵ دانە لە کڕنووش بردنی هەوەڵ و ﴿ إيّاك نستعين﴾ یش کۆمەك خواستنە لە خوا بۆ ئی دووەم.

ئایەتی شەشەمیش لەگەڵ (کڕنووش بردنی دووەم)دا دەسازێ، چونکە لەم ئایەتەدا بەندە داوای بایەخ دارترین شت دەکات لە پەروەردگار کە بریتی‌یە لە (ڕێنمایی کردنی بۆ ڕێی ڕاست)هەڵبەتە ئەم تەکلیفە گەورەیەش گەردن کەچی و بەندایەتی یەکی گەورەی گەرەکە ئەویش کڕنووش بردنی دووەمە.

ئایەتی حەوتەمیش لەگەڵ (دانیشتنی تەحیات خوێندن)دا دەگونجێ، چونکە پاش ئەوەی ئینسان لە سوجدەی دووەم دا ئەوپەڕی بەندایەتی خۆی دەربڕی بەرامبەر بە خوا، خواش لە بەرامبەردا ڕێزی لێ دەگرێ، بۆیە فەرمانی پێ دەکات کە لە خزمەتی‌دا دانیشێ بێگومان ئەوەش نیعمەتێکی گەورەیە و زۆر چاك لەگەڵ ﴿الذين انعمت عليهم﴾دا دەسازێ، بۆیەش لە کاتێك دا خوای بەخشندە پێغەمبەری ﷺ بەرز کردەوە تا گەیشتە پلەی هەرە نزیك لەو کاتەدا فەرمووی: ((التحيات المباركات والصلوات والطيبات لله)).

نوێژیش وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الصلاة معراج المؤمن)) نوێژ پەیژەی بڕوادارە، بۆیە پێویستە موسڵمان لە کاتێك دا لە میعراجەکەی‌دا گەیشتە دوایین پلەی ڕێز و حورمەت ئەو قسانە دووبارە بکاتەوە کە (محمد) ﷺ لە میعراجەکەی دەربارەی خوای مەزن گوتوونی.



Scanned by CamScanner

## دوو ئاگادار کردنەوە:

١. حوکمی گوترانی (اعـوذ بـالله مـن الـشيطان الـرجيم) و واتاکـەی: ئیمـام (نووي) لە کتێبی (الأذکار) دا فەرموویەتی : (بزانە کە (اسـتعاذة) کـردن سوننەتە و فەرز نیە و ئەگەر بابای نوێژکەر تەرکی کرد بە قەستی بێ یان بە سەهوو گوناح بار نابێ، هەڵبەتە کە دەشڵێین سوننەتە مەبەسـتمان لـە گشت کاتێکە واتە: لە نوێژدا چ فەرز بێ و چ سوننەت وە لە دەمی قورئان خوێندنی دەرەوەی نوێژیش دا)[1].

ئێستا کە حوکمی (استعاذة)مان زانی با بزانین چەمکەکەی چمیە؟:

اعـوذ: (ابـو جعفـر الطـبري) کـە بـە (امـام المفـسرين) ناسـراوە فەرموویەتی:

الاستعاذة : الاستجارة ، واتە: هانا وەبەربردن.

الشيطان: (ابو جعفر الطبري) دەڵێت (الشيطان في كلام العرب كـل متمرد من الجن والانس والدواب وكل شيء) واتە: (شيطان) لـە زمـانی عارەبی دا هەریاخی بووێکە لە جند و ئینسان و ئاژەڵ و هەموو شتێك.

الرجيم: (طبري) دەڵێت: (وأمّا الرجيم ، فهو فعيل بمعنى مفعول...و تأويل الرجيم الملعون المشتوم...)واتە: (رجیم) لەسەر کێشی (فعیـل)ە و بە مانای (مفعول)ە ماناى (رجیم)یش نەفرین لێ کراوو جنێو پێ دراوە.

مادام وابێ دەتوانین بڵێین: (اعوذ بالله من الـشيطان الـرجيم) یـانی پەنا وەبەر خوای دەبەم لە شەیتانی دوور لە خوا و نەفرین لێ کراو.

---

(١) سەیری کتێبی (الاذکار) لاپەرە (٤٥)، نوسراوی (النووی) بکە.



Scanned by CamScanner

ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی (استعاذة).

خوای بەخشندە فەرمانی پێ کردوین کە بۆ دوورکەوتنەوە لە شەیتانی بەد و بۆ ڕزگار بوون لە ژێر ڕکێفی هانا بەرینە بەر وی.

ئێستا با بزانین شەیتان لە چ ڕێیەکەوە هێرش دێنێ و ئینسانیش لە چ ڕێیەکەوە توانای بەرگری کردن و لەسەرخۆ کردنەوەی هەیە:

لە سوورەتی (اعراف) دا خوای مەزن فەرموویەتی _ لەسەر زمانی شەیتان _ ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ(١٦) ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَائِلِهِمْ....﴾[1].

واتە: شەیتان گوتی: چونکە گومڕات کردم، دوژمنایەتی بەندەکانت دەکەم و لەسەر ڕاستە شەقامی تۆ _ کە ئیسلامەتی یە _ بۆیان دادەنیشم، ئینجا لە پێشەوە و لە دواوە و لە لای ڕاستەوە و لە لای چەپەوە بۆیان دەچم. کەواتە شەیتان لە چوار لاوە زەفەر بە ئینسان دەبات:

پێشەوە و پاشەوە و لای ڕاست و چەپ ، بەڵام ئایا ئینسان لە چ تەرەفێکەوە توانای بەرگری کردنی هەیە؟ لە وەڵام دا دەڵێین: ئینسان بە شەش لادا دەتوانێ بجوڵێت و هەڵسووڕێ، پێشەوە و دواوە، سەرێ و خوارێ، لای ڕاست و لای چەپ، کەواتە ئینسان دوو لای بە دەستەوە ماوە کە سەنگەری بەرگری کردن لە خۆی تێدا هەڵگەنێ لە ئاقار هێرشی شەیتان دا کە بریتین : لە لای سەرێ و لای خوارێ.

وە ئایەتی (إیّاك نعبد و إیّاك نستعین) چۆنیەتی و ڕێگەی دەسکردنەوەی مرۆڤ دەردەخات لەو دوو لایەوە، چونکە شەیتان هێزێکی

---

[1] الأعراف : ١٦، ١٧ .



Scanned by CamScanner

غەیبی و نەبینراوە و ئینسان لـە ئاقـاری دا دەستەوسـانە و بێجگـە لـە پەیوەندی پەیدا کردن لەگەڵ خوادا چ چارەی دیکـەی نـین و هـیچ شـتێك دادی نادات، پەیوەنـدی بەنـدەش لەگـەڵ خـوادا لـە دوو شـێوەدا خـۆی دەنوێنێ:

یەکەم: گەردن کەچی و گوێ ڕایەڵی و بەجێ هێنانی فەرمانـەکانی، کـە ڕستەی (إیّاك نعبد) دەلالەتی لەسەر دەکات.

دووەم: دووعا و پاڕانەوە وداوای یارمەتی لێ کردن، کە ڕستەی ﴿و إیّـاك نستعین﴾ دەلالەتی لەسەر دەکات.

جا بێ گومان ئەو شتەی کە لە هـەموو شـتێك پـتر گـەردن کەچـی و فەرمانبەری تێدا وەدەردەکەوێ نوێژە بۆیە نوێژ بە کۆڵەکە و پایـەی دیـن دانراوە (الصلاة عماد الدین) گرنگ ترین بەشی نوێژیش کڕنـووش بردنـە بۆیەش لە چاو هەموو ڕوکنەکانی تری نوێژ لەهەر ڕکاتێـك دا دوو جـاران بەڕێوە دەبرێ.

بێگومان کڕنووش بردنیش بەجێ ناهێنرێ بە بێ سەرخستنە سەر زەوی، سەرخستنە سەر زەویش ئەو پەڕی گەردن کەچـی و بەندایـەتی دەگەیـەنێ بۆیە پێغەمبەری مـەزن ﷺ فەرمروویەتی: (( اقرب ما یکـون العبـد مـن ربە وهو ساجد ، فاکثروا الدعاء ))[1]. واتە: بەندە لە وەختی سوجدە بردن دا لە هەموو کاتێك لە خوای نزیك ترە، جا دووعایانی زۆر تێدا بکەن.

[1] (مسلم) (ابی هریرة) وە ڕیوایەتی کردووە.



Scanned by CamScanner

سەبارەت بە بەرگری کردنی ئینسانیش لە تەرەفی سەری وە وەك گوتمان لە دووعا و پاڕانەوەدا خۆی دەنوێنێ ، بۆیە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی : ((الدعاء مُخ العبادة)) یانی: پاڕانەوە کاکڵی بەندایەتی و خواپەرستی یە.

٢.گوترانی (آمین) لە دوای فاتیحە:

بخاری و ابو داود ڕیوایەتیان کردوە: ((کان ﷺ اذا انتهی من قراءة الفاتحة قال: آمین یجهر و یمد بها صوته)) واتە: پێغەمبەر ﷺ کە لە خوێندنی فاتیحە دەبۆوە دەیگوت: (ئامین) دەنگی بەرز دەکردەوە و درێژی دەکردەوە.

ئیمامی (نووی) لە کتێبی: (الاذکار) دا فەرموویەتی: (گوتنی ئامین لە دوای فاتیحە سوننەتە بۆ هەر بابایەك کە دەیخوێنێ چ لە نوێژێ دا و چ لە غەیری نوێژێدا).



Scanned by CamScanner

# تەفسیری ئایەتی یەکەم

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ [1]

**بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە**

پێش دەست کردن بە توێژینەوەی چەمکی گشتی ئەم ئایەتە پیرۆزە پێویستە بڕێك نووکی خامە بگێڕین بە دەور و بەری یەك یەکی وشەکانی دا:

(بِسْمِ): لە ئەسڵدا (باسم) بووە بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کە زۆر بەکارهێنراوە هەمزە (أ) کەی لێ کراوەتەوە تاکو لەسەر زمان سووك بێ. ئاشکراشە کە (بسم) یانی: بەناوی.

الله: زانایان لە چۆنیەتی پەیدا بوون و تەفسیر کردنی ئەم وشەیەدا دوو ڕایان هەیە:

یەکەم: کە لە نێو وان دا (سیبویه و خلیل بن احمد و فخر الدین الرازي...)

هەن دەڵێن ئەم وشەیە (جامد)ە و (مشتق) نیە و لە هیچ چاوگەیەکەوە نەهاتوە و ناوی تایبەتی زاتی خوایە.

دووەم: دەڵێن: داتاشراو (مشتق)ە و لەو چاوگەش دا کە ئەم ناوەی لێوە هاتوە ڕای جۆرێ جۆرێ هەن، بۆ وێنە:

---

(1) بۆ هەرچی لێرەدا دەربارەی (بسم الله) نووسیومە سوودم لە تەفسیری (مفاتیح الغیب) وەرگرتوە. ـ فخرالدین الرازی.



Scanned by CamScanner

١) دەڵێن لە (ألَهَ)وە هاتوە چونکە (ألَهتُ الی فلان) واتە: بەهۆی وی ئارامیم بۆ هات.

٢) دەڵێن لە (ألَهَ الرجل يألَهُ)وەوە هاتوە، واتە: لە ناقار بەلایەك دا دەستەوسان بوون و ڕزگار بوون بەهۆی یەکێکی دیکەوە.

٣) دەڵێن لە (ألَهَ الرجل الی رجل)یەوە هاتوە، واتە: بەهۆی شەوق و خۆشەویستی یەوە ڕووی تێ کرد.

٤) دەڵێن لە (ألَهَ الاهة والوهة)وە هاتوە یانی: پەرستی وبەندایەتی بۆ کرد.

٥) بەعزێکیش دەڵێن لە (لاه یلیه)وەوە هاتوە ، واتە: خۆی پەنهان کرد.

٦) تاقمێکی دی دەڵێن لە (الولَه)ەوە هاتوە، "وَلَه" یش یانی : سەرسامی و مات و حەیران بوون.

کەواتە (الله) ئەو زاتە پاکەیە کە:

یەکەم: ئینسان بەهۆی ویەوە دڵی ئارام دەگرێ ﴿ألا بِذِكرِ اللّهِ تَطمَئِنُّ القُلوبُ﴾[1].

دووەم: ئینسان لە کاتی تەنگانەدا هانای وەبەر دەبا و ڕزگاری دەکات ﴿أمَّن يُجيبُ المُضطَرَّ إذا دَعاهُ﴾.

سێیەم : ئینسان لە ئەلهامی سۆز و خۆشەویستی یەوە ڕووی تێ دەکات ﴿وَالَّذينَ آمَنوا أشَدُّ حُبًّا لِلّهِ﴾[2].

---

(١) الرعد :٢٨.

(٢) البقرة :١٦٥.



Scanned by CamScanner

چوارەم : ئینسان دەی پەرستێ و بەندایەتی بۆ دەکات ﴿إيّاك نعبد﴾.

پێنجەم: ئینسان ناتوانێ بی بینێ و لە پێش چاوانی شێرراوە و پەنهانـە ﴿لا تدركه الابصار﴾[1].

شەشەم: ئینسان لە ئاثار ناسینی دا مات و حەیران و سەرسامە و ناتوانێ پەی بە زات و ماهیەتی بەرێ: ﴿ليس كمثله شيء﴾[2].

الرحمن الرحيم: (طبري) لە تەفسیرە مەزنەکەی‌دا دەڵێت: (أما الرحمن، فهـو فعلان من رَحِمَ، والرحيم فعيـل منـه)[3]. کەواتـە: (الـرحمن) و (الـرحيم) هەردووکیان لە یەك چاوگەوە هاتوون، بەڵام کێشەکانیان جودان ئەوە جێی مشت و مڕو دمێ و ناکۆکی نیە لە نێوان زانایان دا بـەڵام ئـەوەی جـێی کێشەیە لەم بارەوە ئەوەیە کە ئایا جیاوازی نێوان ئەم دوو وشەیە چی یە لە رووی واتاوە؟

ئەوەش پوختە و ڕاپازنەراوی قسەی توێژەرەوانە لەم بارەوە:

١- (رحمن) بریتی‌یە لە ڕەحمـەت و بـەزەیی خـوادا لـە دنیـادا و کـافر و موسڵمان دەگرێتەوە بەڵام (رحیم) سیفەتی خوایـە لـە قیامـەت دا و تەنیا موسڵمانان دەگرێتەوە.

٢- (رحمن) سیفەتێکی تایبەتی خوایە و دروست نیە بۆ غەیری وی بەکار بێت بەڵام (رحیم) وا نیە.

---

[1] الانعام : ١٠٣

[2] الشورى : ١١

[3] سەیری کتێبی (الاعمال الكاملة للشيخ محمد عبده) بکە بەرگی چوارەم لاپەڕە (٣٢).



Scanned by CamScanner

٣- (رحمن) ئەو زاتەیە کە جۆرە نیعمەتێك بەسەر غەیری خۆیدا بڕژێنێ کە کەسی تر لە توانایدا نەبێ، بێگومان ئەو زاتەش هەر خوایە، بەڵام (رحیم) وانیە.

٤- کە ڕای (شیخ محمد عبدە)یە لەم بارەوە دەڵێت[1]:

ڕێژگە (صیغە)ی (فعلان) دەلالەت لەسەر وەسفێکی کردەوەیی دەکات لەگەڵ زیادەڕەویدا، وەك (فعّال)، لە بەکارهێنانی زمانیش دا بۆ ئەو چەشنە سیفەتانەیە کە بەر قەرار نین و نامێننەوە، وەك (عطشان) تێنوو، (غضبان) تووڕە، (سکران) سەرخۆش، دیارە هیچ کام لەم سیفەتانە بەر قەرار نابن، ئەما ڕێژگەی (فعیل) دەلالەت لەسەر مانای نەگۆڕراوو جێ گرتوو دەکات وەك ڕەوشت و ئاکار و خوو خدە بۆ وێنە:

(علیم) زانا، (حکیم) کاربەجێ، (جمیل) جوان، کەواتە (رحمن) ئەو زاتەیە کە ڕەفتار و کردەوەی بەزەییانەی تێدا وەبەرچاو دێن، (رحیم)یش ئەو زاتەیە کە سەرچاوە و چاوگی بەزەیی و چاکە و خێر خوایی یە...... بەم جۆرە هیچ کام لەم دوو وشەیە جێی ئەوی تر پڕ ناکاتەوە و وەك هێندێك دەڵێن دووەم پاڵپشتی یەکەم نیە و هیچی دی.

پوختەی قسان ئەوەیە: کە مرۆڤ بە بیستنی وشەی (رحمن) بۆی دەردەکەوێ کە خوا ڕژێنەری ناز و نیعمەت و بەزەیی یە بەڵام بۆی دەرناکەوێ کە ئەو ناز و نیعمەت و بەزەیی یە هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام وەختێك وشەی (رحیم)ی بیست دەزانێ کە بەردەوام دەبێت و سیفەتی بەزەیی و بەخشندەیی شتێکی بنەڕەتی یە لە خوای مەزن دا.

---

[1] سەیری کتێبی (الاعمال الکاملة للشیخ محمد عبدە) بکە بەرگی چوارەم لاپەرە (٣٢).



Scanned by CamScanner

## ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ یانی چی؟

بە پێویستی دەزانم بۆ وەلامی ئەم پرسیارە قسەیەکی زۆر دلگیری شێخ (محمد عبده) نەقل بکەین لەو بارەوە دەڵێت:

(ئەو چەشنە تەعبیرە شتێکی ئاسایی و خووپێوە گیراوە لە کن هەموو گەلان کە عارەبیش یەکێکن لەوان.

....لە کاتیك دا یەکێك دەیەوێ کارێك بە جێ بێنێ لە پێناوی سەرۆکێك یان گەورەیەك دا بە جۆرێك کە ئەو کارە پاڵ نەدرێتە لای خۆی و تەنیا بۆ سەرۆکەکەی بێت دەڵێت: ئەم ئیشەم کرد بە ناوی فلان کەس و ناوی ئەو سەرۆکە دێنێ چونکە ناوی شت عینوانیەتی ، ئینسان کاتێك ئیشێك دەکات بە ناوی کەسێکەوە کە ئەگەر ئەو کەسە نەبوایە نەی دەکرد دەڵێت: ئەم ئیشەم کرد بە ناوی فلان کەسەوە، واتە ئەم ئیشەم ناوونیشانی وی پێوەیە و ئەگەر ئەو نەبوایە ئیشەکەی لەمەڕ منیش نەدەبوو.

کەواتە مانای ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ یانی: ئەم ئیشە دەکەم بە فەرمانی خوا و بۆ خاتری خوا نەك بۆ خۆم یان کەسێکی تر)[1].

ئێستا با بێینە سەر واتا و چەمکی بەرفراوانی ئەم ئایەتە پیرۆزە و بن ئاوێك لە دەریای بێ پایانی پڕ گەوهەر و مرواریدا لێ بدەین و بزانین چی تێدایە:

---

[1] سەیری (الاعمال الكاملة) بکە بەرگی چوارەم لاپەڕە (٢٩٤، ٣٠٠).



Scanned by CamScanner

# گەوهەری یەکەم

## خواناسی و خواپەرستی شتێکی خوارسك و سروشتی یە لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا

١- یەکەمین گەوهەری ئەم دەریا بێ سنوورە ئەوەیە کە:

خواناسی و خواپەرستی شتێکی خوارسك و سروشتی یە و لە دڵ و دەروونی هەموو ئینسانێك دا چەسپێنراوە، ئێستا بەر لەوەی بێ ینە سەر سەلماندنی ئەم قسەیەمان با بزانین ئەم یاسایە چۆن لەم ئایەتە پیرۆزە دەفامرێتەوە؟ دەتوانین لە دوو خاڵدا ئەوە روون بکەینەوە:

یەکەم: ئەم سوورەتە خوای بە بەزەیی لەسەر زمانی بەندەکانی گوتوویەتی، دیارە ئەویش لە هەموو کەس چاکتر بەندەکانی دەناسێ کەواتە ئەم وتووێژەی لەم سوورەتەدا دەبینرێ زادە و هەڵقوڵاوی سەرچاوەی سروشت و ماهیەتی مرۆڤە، چونکە وەك گوتمان پەروەردگار لێرەدا لەسەر زمانی ئینسان دواوە خۆ ئاشکراشە کە خوا شتێك بە زمانی ئینسانەوە نالێ کە لەگەڵ میزاج و سروشتی دا هەڵنەکا و نەگونجێ چونکە ئەو کاتە ـپەنا بە خوا_ بە درۆزن دێتە دەر (پاکی بۆ خوا) ! دیسان نابێ ئەوەش لە بیر بچێ کە پەروەردگار لەم سوورەتەدا بە ناوی دەستە و تاقمێکی تایبەتیەوە نەدواوە، بەڵکو بە ناوی گشت مرۆڤایەتی یەوە دواوە، کەواتە هەر قسەیەکی کە لێرەدا کراوە هەڵقوڵاوی کانی سروشت و نەفس و ماهیەتی مرۆڤە.

دووەم: بەندەکان کە بەری هەموو قسان ناوی خوا دێنن و لەگەڵی دا دەکەونە گفتوگۆ دیارە بڕوا بوون بە خوا و ناسینی وەك یاسایەکی بەڵگە



Scanned by CamScanner

نەویست[1] لە دڵیاندا چەسپێنراوە، بۆیە بێ هیچ چەشنە پێشەکی و پێ پێلکە دروست کردنێك لەگەڵی دا دەست دەکەن بە ئاخاوتن، دیقەتت نەگرتوە وەختێك لەگەڵ باباپەکی بیانی و نامۆدا ڕوو بە ڕوو دەبی ناچاری لە ناوو شۆرەت و کەسایەتی و جێ و ڕێی بپرسی بەر لەوەی لەگەلی دا بکەویە گوتار، بەلاّم لەگەڵ دۆستێکی ناسیاوو ئاشنادا ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا و ئەم لاو لا کردن لەگەڵیدا دەست دەکەی بە گفت و گۆ، لێرەش دا کە لەگەڵ خوای مەزن دا بەو شێوازە دەدوێی کە لەگەڵ ناسیاوو ئاشناکەت دا دوای مانای وایە خوای پەروەردگاریش وەك دۆستێکی نیزیك پێت ئاشنایە و لەلات ناسراوە.

ئەوەی ڕاستی بێ هەر ئەوەش لە پەروەردگاری گەورە و بە بەزەیی ڕەچاو دەکرێ، ئایا ماقووڵە خوای میهرەبان و خاوەن سۆز بەڕێزترین خوڵقێنراوو جێ نشینی خۆی بە جۆرێکی وا بخوڵقێنێ کە نەیناسێ؟!

پێغەمبەری پێشەواش ﷺ لە فەرموودەیەکیدا لەم بارەوە فەرموویەتی:
((ما من مولود الا يولد على الفطرة فأبواه يهوِّدانه أو ينصِّرانِهِ او يمجسانه))[2]
واتە: هەموو منداڵێك لەسەر سروشتی خوا پەرستی لە دایك دەبێت، دوایی دایك و بابی دەیکەن بە جوولەکە، یان دەیکەن بە نەصرانی، یان دەیکەن بە ئاگر پەرست. ئێستا ڕەنگە یەکێك بپرسێت باشە ئەگەر ڕاستە هەموو کەسێك بیەی خوا پەرستی لە دڵیدا شتێکی سروشتی و خواڕسکە بۆچی بەعزە کەسێك لاڕێ دەبن و وا پێشان دەدەن کە بێ بڕوا و لامەزەبن؟!

---

(١) هەڵبەتە ئێمە نالێین بڕوا بوون بە خوا بەڵگە نەویستە چونکە ئەگەر بەڵگە نەویست برایە پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نەدەکرد.

(٢) بخاري و مسلم و ترمذي و نسائي لە (ابي هريرە) ڕیوایەتیان کردوە.



Scanned by CamScanner

هەرچەندە ئێمە کتێبی (گەورەترین ڕاستی)[1] مان تەرخان کردوە بۆ هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەندی‌یان بە خوا ناسی‌یەوە هەیە و لەوێدا بە تێروتەسەلی ئەم چەشنە باسانە توێژراونەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت لێرەش دا وەڵامێکی کورتی ئەم پرسیارە دەدەینەوە:

بێگومان هەر کامێکمان چەندین جار دیتوویەتی خۆرهەڵاتوە و تیشکی زێڕینی لە هەموو لایەکی دنیادا بڵاو کردۆتەوە، بەڵام لە نەکاوڕا هەر هێندەی زانیوە پەڵە هەورێکی چڵکن و پیس هاتۆتە عاسمانێ و بەربینگی بە ڕۆژێ گرتوە و بێ ئاسەواری کردوە.

خۆ ئاشکراشە هیچ کەس زات ناکات بڵێت وەڵڵا خۆر هەر لەو دەمەی دا کە لە چاوان ڕاون بووە لە دنیای واقعیش دا ماهیەت و خودی خۆی لە دەست داوە و نەماوە، مەسەلەی بڕوا بە خوا بوونیش هەر بەو پێ و دانگەیە، بڕوا بە خوا بوونیش خۆرێکی پڕشنگ دارە و تیشکی ڕووناکی خۆی بەسەر دنیای سروشتی مرۆڤدا پەخش دەکات بەڵام لە سۆنگەی چەند هۆیەکی تایبەتی و لە چەند بارودۆخێکی تایبەتی‌دا پەڵە هەوری چڵکنی گومان و دوو دڵی یان سەرە خەری و نە سەلماندن و بۆ دەتانێ نەخستن تیشکی زێڕینی ئەو خۆرە دەشارێتەوە و ونی دەکات.

ئێستا کە دڵنیا بووین لەوە کە ئەم ئایەتە دەلالەت لەسەر ئەو یاسایە _یاسای خوارسك بوونی بڕوا بە خوا بوون لە سروشتی مرۆڤدا_ دەکات با چەند بەڵگەیەکی ژێری بێنینەوە بۆ پتر ئاوەڵا کردنەوە و ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە:-

---

(١) دوایی لە ژێر ناونیشانی (خواناسی ، ئاین ، ئیمان) دا چاپکرا لە لایەن نووسینگەی تەفسیرەوە .



Scanned by CamScanner

# بەڵگەی یەکەم

## هەموو پەیدا بوونێك ، پەیدا کەرێکی هەیە

لەو بەڵگانە کە خوارسك بوونی بڕوا بە خوا بوون دەسەلمێنن لە سروشتی ئینسان دا ئەو یاسا ژیری یەیە کە دەڵێت: هەموو پەیدا بوێك بەدیهێنەرێکی گەرەکە. لە زاراوەی فەلسەفیش دا بە (یاسای هۆکاری) "قانون السببیّە" ناسراوە. شایانی باسە کە پیتۆڵ و زانایان خڕ لەسەر ئەوەن کە ئەم یاسایە گەورەترین یاسای بەڵگە نەویستی ژیری یەو ئەگەر ئینسان هەر لە هەوەڵ ڕۆژی ژیانی یەوە بڕوای جەزم نەبوایە لەسەر ڕاستی ئەم یاسایە، ئێستا هیچ جۆرە دیاردە و ڕوخسارێکی ژیار و پێش کەوتن نەدەهاتە بەر چاوان، چونکە ئەوەی پاڵی بە مرۆڤەوە ناوە کە بە دوای هۆی دیاردە و ڕواڵەتەکانی بوونەوەردا بگەڕێ و دنیایان لێ دەسەنگ و سووژن بنێ ئەم یاسا ژیری یە سروشتی یەیە.

کەواتە وەختێك دەبینین بڕێك سۆفستایی ئینکاری و لا موجوومی دەکەن لە ناقار ئەم دەستووره ژیری یەدا نابێ بڕوامان لەق بێت، ئایا هیچ کەس گوێ دەداتە وڕێنەی بابای نەساغ و میزاج تێك چوو کاتێك بۆ خەڵکی دەتانێ ناخاو نای سەلمێنێ کە ئاوی سازگار و شیرین شیرینە چونکە زاری نەخۆشی وی پێی تاڵە؟ نەخێر، پێشینانیش لەمێژە گوتوویانە هەر کەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێزان دەژمێرێ. بۆ پتر ڕوون کردنەوەی ئەم یاسا بەڵگە نەویستە وێنەیەك دێنینە بەر چاوان:



Scanned by CamScanner

ئایا بینرانی جێ پێی مرۆڤێك لە دەشتێكی كـاكی بـە كـاكی و چـۆڵدا بەڵگەیەكی ئیقناع كەر نیە بۆ تێپەڕ بوونی كەسێك بەوێدا؟ دیارە با ، باشە چ شتێك ناچارمان دەكات دان بنێین بەوەدا كە كەسێك بەوێدا ڕاربـووردوە لەگـەڵ ئەوەشدا ئێمە بە چاوی خۆمان كابرامان نەدیوە؟ بێگومان هەبوونی ئەم یاسـا ژیریییەیە لە سروشتی ئینسان دا.

ئێستا كە زانرا یاسای هۆكاری (قانون السببية) یاسایەكی ژیری و بەڵگـە نەویستە با بگوازینەوە بۆ بازنەیەكی فـراوانتر و لـە گۆشـە نیگایـەكی تـرەوە سەرنج بدەین.

ئەم بوونەوەرەی كە لە گۆشەیەكی گچكەدا لە نێو یەكێك لە خڕۆكەكانی دا دەژین زانا و شارەزایان تێكڕا لەسەر ئەوەن _ هەتا ماتریالیستەكانیش _ كـە كاتێك بووە ئەم بوونەوەرە نە سەری سیری بووە نە بنی پیوازی، كەواتە هەروەك چۆن جێ پێـكـان پـێش دەمـی ڕەت بـوونی پێڕۆكـە بـەو شـوێنەدا نـەبوون، بوونەوەریش پێش دەست بەكاركردنی بەدی هێنەر نەبووە، چونكە هەروەك چۆن پەیدا بوونی جێپێكان بەسـتراوە بـە ڕەت بـوونی بابـای پێـڕۆ، پەیـدا بـوونی بوونەوەریش بەستراوەتەوە بـە دەسـت بـەكاركردن و خولقانـدنی خـوای بـەدی هێنەر.

توخوا براله لە خۆت بپرسە و ویژدانت بكە بە دادگەر، ئایا ئەگەر هاتنـە دی چەند شوێن پێیەك _لەگەڵ ئەو هەموو ساكارییەی دا_ بـێ ڕەت بـوونی پێڕۆیەك مەحاڵ بێ، دەبێ هاتنە دی بوونەوەرێك بەو زەبەلاحی و پڕ هونەری و وردەكارییەوە بە چ كلۆجێك بە بێ پەروەردگار و بەدی هێنەری مـەزن جـێی چاوەڕوان كردن بێت؟

ئێستا ڕەنگە پرسیارێك خولخولەی زۆر دڵان بدات:

باشە ئێمەش دانی پێدا دێنین کە بوونەوەر بەم شێوە وردە کاری و ڕێك و پێکی یەی ئێستا لەسەریەتی ئەزەلی نیە و دوای نەبوون هێنراوەتە دی بەڵام ئاخر بۆچی یەکسەر پەنا بەرینە بەر خوا، ئایا هیچ شتێکی دی نیە ئەم کارەی لێ بوەشێتەوە و پێویست نەکات پەنا بەرینە بەر شتێکی نەدیتراوو هەست پێ نەکراوی وەك خوا؟

لە وەڵام دا دەڵێین نەخێر لە دروست کرانی بوونەوەردا لە خوا بەولاوە کەس پەرێزی دیار نیە و لە بینای بوونەوەردا غەیری پەروەردگار هیچ وەستایەك چەکوچی خولقاندنی نەوەشاندوە. بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست وێنەیەك دێنینە بەرچاوان: کاتێك لەگەڵ یەکێك لە برادەرانت لە ژوورێك دا دادەنیشی و بە نیشێك دەچیە دەرێ و وەختێك دەگەڕێیەوە ژوورەکەتان برادەرەکەت نابینی هیچ سەرت سوڕ نامێنێ و عاجباتیت نایەت چونکە برادەرەکەت کە مرۆڤێکی خاوەن ئیرادە و توانایە ئەوەی لە باران دا هەیە بۆ خۆی دەروژووری بکات.

بەڵام ئایا وەختێك بۆ خۆت بە تەنێ لە ژوورێك دا دادەنیشیی بە نیشێك دەچیە دەرێ و کتێبێك لە شوێنێکی تەرخان کراودا بەجێ دێڵی و لە گەڕانەوەتدا وەبەر چاوانت نایەت، سەرسام نابیودەست ناکەی بە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە سەبارەت بە هۆی لە جێی خۆ لاچوونی کتێبەکە ؟! دیارە با، دەبا ئێستا بزانین هۆی جیاوازی ئەم دوو هەڵوێستەت چیە؟!

لە حاڵەتی یەکەم دا لە سۆنگەی ئەوەوە کە "لە جێی خۆ لاچوون"ە کە پەیوەندی بە کەسێکەوە هەیە کە دەشێ بۆ خۆی سەربەخۆ ئەنجامی بدات هیچ سەرگێژەکەت ناگاتێ و ناگەڕێی بە دوای هۆی بەجێ هێنانی کارەکەدا، بەڵام



Scanned by CamScanner

لە حاڵەتی دووەم دا کە "لە جێی خۆ لاچوون"ە کە بە شتێکەوە بەستراوە داری پێ لەسەر بەردی دانانرێ و مێشی پێ لە خۆ دەرناکرێ ژێریت ناچارت دەکات بە شوێن هۆی بەجێ هێنرانی کارەکـەدا بکەویـە گـەڕان و سـووڕانێ، ئێـستا پرسیارێك ئاراستەی ئەوان کەسان دەکەین کە پرسیاری هەوەڵ خوتخوتەی دڵـی دەدان:

ئایا دەتوانن خۆتان ئیقناع بکەن بەوە کە پێویست ناکات بـە دوای هـیچ هۆیەك دا بگەڕێین کە بۆتە هۆی لابرانی کتێبەکە لە جێی خۆی و بڵێین جـا چ حەوجێ بەوەی دەکـات بـە دوای هۆیـەکی دی‌دا بگـەڕێین و خۆمـان مانـدوو بکەین، ئێمە دەڵێین: ئەوەی کتێبەکەی لە جێی خـۆی ڕاگواسـتوە، یـان هـەر هێزێکی نێو خۆی کتێبەکەیە، یان دەوربەری کتێبەکەیـە وەك: دار و دیـوار و پەنجەرە و کورسی و ....هتد؟!!!

لەوەوە کە ڕابورد دەگەینە ئەم ئەنجامە: لەهەر کات و شوێنێك دا گۆڕان بەسەر شتێکی مادی دا بێت _واتە هەر دیاردەیەکی بێ گیان و بێ ئیرادە_ جا چ ئەو گۆڕانە لە چوار چێوەیەکی چووکەڵەدا ڕوویدات وەك لاچوونی کتێبەکە لە شوێنی خۆی، یان لە بازنە و زەمینەیەکی فرت و فراوان و بە بەرەوە بوودا وەك گۆڕانی ماددە لە حاڵەتی گازێکی پەرتەوازە و تێکەڵ و بێ سەرە و بەرەوە بۆ حاڵەتی ئێستای کە لە چەند کاکێشان و ئەستێرە و خرۆکەیەك دا بوونەوەرێکی ڕێك و پێك و پڕ یاسا و وردەکاری پێك هێناوە، بەڵێ لە هەر کام لەم حاڵەتانەدا دەستەوسانین لە ئاقار تەفسیر کردنی دیاردەی گۆڕان دا مەگەر بە هانا بردنە بەر هۆیەکی دیکەی دەرەکی لە خودی ماددەکە، هەڵبەتە ئەو هۆیەش کە دەڵێین لە دەرەوەی جوغزی ماددە دایە دەبێ خاوەنی چەند خەسڵەت و



Scanned by CamScanner

تایبەتمەندییەك بێت کە لە ماددەدا چنگ نەکەون، وەك گیان وئیرادە وزانیاری و توانا و.... هتد، بەم ڕەنگە لە حاڵەتی یەکەم _لاچوونی کتێبەکە_ دا گۆڕانەکە پاڵ دەدەینە لای ئینسان و لە حاڵەتی دووەمیش _دروست بوونی بوونەوەر_ دا پالی دەدەینە لای خوای پەروەردگار.

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە مەسەلەیەك بتوێژرێتەوە کە زەینی زۆرانی تێدا بە سەهوو چووەو ساتمەی بردوە:

ئێمە کە دەڵێین هەر چەشنە گۆڕانێك بەسەر ماددە و دیاردەکانی دا بێت پێویستە بۆ هۆیەکەی بکەوینە گەڕان و سووڕان لە دەرەوەی جوغزی ماددەدا مەبەست لە گشت چەشنە گۆڕانێك نیە بەڵکو مەبەست لەو جۆرە گۆڕانانەیە کە لە دەرەوەی جوغزی گۆڕانە فیزیایی و کیمیایی‌یەکان دان، بە تەعبیرێکی دی ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە بە هیچ ڕەنگێك ناتوێ لەسەر بنچینەیەکی کیمیایی یان فیزیایی تەفسیر بکرێن، بۆ پتر ئاوەلا بوونەوەی مەبەست با کەرەتێکی دیکەش سەرنج لەهەر کام لە دیاردەی: گواسترانەوەی کتێبەکە لە شوێنی خۆی و گواسترانەوەی ماددە لە حاڵەتی گازێکی پەرتە وازەیی و بێ سەرە و بەرەیی‌یەوە بۆ حاڵەتی یاسایی و ڕێك و پێکی بدەین:

ئایا چ کتێبەکەش و چ ماددە _کەرەسەی خاو_ی بوونەوەریش دەگونجێ بڵێین بە گۆڕانی نێو خۆی گەردیلەکان یان بەهۆی دەور و بەریانەوە ئەو گۆڕانەیان بەسەردا هاتوە؟!!

دەزانم هیچ کەس سەبارەت بە کتێبەکە ئەوەی بە بیردا نایەت کە بە هۆی کارەنجام (تفاعل)ی نێو خۆی گەردیلەکان یان بەهۆی کارتێکردنی دەوروبەر گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. ئەما سەبارەت بە گۆڕان وگوێزرانەوەی ماددەلە حاڵەتی



Scanned by CamScanner

هەویرە ترشی و پرژوبلاوی یەوە بۆ نێو قاڵب و بۆتەیەکی یاسایی و ڕێك و پێك، لەوانەیە بەعزێك سەرچاوەی درۆزناوی گومانیان چۆڕە بڕ نەبووبێ و وایان بە خەیاڵدا بێت کە بوونەوەر تەنیا لە ڕێی گۆڕانە کیمیایی و فیزیاییەکانەوە هاتبێتە دی!!

ئەما ئێمە بۆ ڕەواندنەوەی تارمایی ئەم گومانە چەند ڕاستییەکی بەڵگە نەویست دەخەینە بەرچاوی ئەوان کەسان:

یەکەم: شتێکی سەلمێنراوو لەبەرچاوە کە ماددە بەرلەوەی ببێتە ئەم بوونەوەرەی ئێستا و ئێستاش خاوەنی هیچ کام لەو خەسڵەتانە نیە کە هەبوونیان شتێکی حەتمی و پێویستە بۆ بەجێهێنانی هەر جۆرە نیشێك، وەك: ژیان و ژیری و ئیرادە و توانا.

دووەم: زۆر کەس بە مەسەلەی هەبوونی جووڵان (حرکة) لە ماددەدا هەڵ دەخەڵەتێن و وا دەزانن مادام ماددە جووڵان و بزووتنەوەی تێدایە بۆ خۆی سەربەخۆ و بێ هیچ هۆیەك لە بارانیدا هەیە کە بگۆڕێ و پەرە بستێنێ، بەڵام ئەم گومانە دەڕەوێنینەوە بەم دوو بەڵگەیەی خوارێ:-

١- جووڵان لە ماددەدا سەرەتا و دەست پێ کردنێکی هەیە و هیچ کەس ناتوانێ جووڵان بە بێیی خۆیدا بێنێ بە بێ هێنانە بەرچاوی دەست پێ کردن و سەرەتایەك _لە کتێبی "گەورەترین ڕاستی"دا ئەم مەسەلەیەمان چاك ڕوون کردۆتەوە_ دیارە کە جووڵانیش لە ماددەدا سەرەتای هەبوو پێویستە ماددەش سەرەتای هەبێت چونکە زانایان خڕ لەسەر ئەوەن کە ماددە و جووڵان لێکدی جویێ نابنەوە.



Scanned by CamScanner

٢- جوولاَن و بزووتنی بەتەنێ نابێتە هۆی ئەنجام دانی هیچ چەشنە کـارێکی ویستراوو هەدەف دار، دیقەتت لەو فیشەکە شێتەیەی نەگرتوە کـە بابـای ڕاوچی ڕەش کوژ دەی هاوێ، نەك هەر ئامانج ناپێکێ بـەڵکو زۆر جـاران نیشێکی زیان بەخشیش ئەنجام دەدا و بابایەکی بێ خەتای پـێ دەنگـوێ، ئەمـــا کاتێك هەر ئەو فیشەکەی کابرای ڕاوچی دەی تەقانـد، تفـەنگ چی یەکی کارامە دەی تەقێنێ دەبینی کارێکی ویـستراوو بایـەخ دار وەك ئەنگاوتنی نیشانە یان کوشتنی نێچیرێك بەجێ دێنـێ، کەواتـە جـوولاَنی بەتەنێ بۆ ئەنجام درانی شـتێکی ویـستراوو سـوود بـەخش، بـەس نیـە و پێویستی بە کەسێك هەیە، کە ڕێنمایی بکا و ڕێڕەوێکی ڕاستی بۆ دیاری بکات.

باشە ئێمـە وەختێـك دەبیـنین ئـەو گۆڕانکـاری و پەرەسـەندنەی بەسـەر دیاردەکانی ماددەدا دێن چ بە شـێوەی گـۆڕانی کیمیـایی، وە چ بـە شـێوەی گۆڕانی فیزیایی هەموویان بە پێی چـەند یاسـا و دەسـتوورێکی عیلمیانـەی سەرسووڕهێنەر بەڕێوە دەچن و دەبنـە هـۆی هێنانـە دی هـەزارەها ئامـانج و مەبەستی سوود بەخش و بایەخ دار، ئایا ئەگەر بڵێین ماددە و گەردیلەکانی بە هۆی جوولاَنەوەوە وەك فیشەکە شێتەی کابرای ڕەش کـوژ تـەقێنراون و ڕەکـار خراون ئایا ئەم قسەیە، لەگەڵ ئاوەز و زانیاری‌دا دانووی دەکوڵێ و پێکەوە هەڵ دەکەن؟!! ئایا ئەگـەر گرللەیـەك بـە ناشـێی‌یـی و چـەپلەکی و ڕەشـە کـوژی باریشترێ نەبێتە هۆی هاتنەدی مەبەست و زۆر جاران زیانیش ببەخشێ، دەبێ ئەگەر ئەو هەموو گەردیلانەی ماددەیان لێ پێك هاتوە سـەربەخۆو بـێ هـیچ ڕێنمایی کەرێك وەگەڕ کەوتبن و دەستیان کردبێ بە جوولاَن، ئێـستا بوونـەوەر نەدەبوو بە شێوێ شێتەی و دنیا وەك شاری بێ ساحێب کاول و وێران نەدەبوو؟!



Scanned by CamScanner

بەڵێ ئەو ڕێك و پێكی و وردە كاری یەی لە بوونەوەردا بەدی دەكەین كە لە ئەنجامی جوولانی ماددەدا هاتۆتە دی چ بە شێوەی كیمیایی و چ فیزیایی، كەسێك هەر لوێچێك لێكدانەوە و تێگەیشتنی هەبێت بە ڕەوای نابینێ كە پاڵی داتە لای ماددەی ڕەق و تەق و هیچ سەرپەرشتی كەر و پەروەردگارێك لە دوای ماددە و نەبینێ.

ئێستا كە گەیشتینە ئەو ئەنجامە، كە هەر كاتێك جموجۆڵ و بزووتنێكمان لە شتێك دا دیت كە دەبوو بەهۆی‌هێنانەدی مەبەستێك بێ سێ و دوو، ناوەز و لێكدانەوە پاڵمان پێوە دەنێ كە دان بێنین بە هەبوونی جووڵێنەر و ڕێ نمایی كەرێك دا، با بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست وێنەیەك لە ژیانی ڕۆژانەمان دا بێنینە بەر نیگا:

ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو ترومبێلت دیتن یەكێكان بە شێوەیەكی ژیرانە و كارامانە بە ڕێ ی تایبەتی و دیاری كراوی خۆی‌دا دەڕۆی و لە شوێنی تایبەتی و دیاری كراودا ڕادەوەستا پێچی دەكردەوە و...هتد ئەوی دیشیان بە پێچەوانەوە هەر ملی لێ دەنا و ڕاوەستانی نەدەزانی و هەر چی هاتبایە بەرێ دەی شێلا، ئایا ڕەفتاری هەردووك ترومبێلەكەت وەك یەك دێتە بەرچاوان؟! دیارە دوو هەڵوێستی جودات دەبێ و دەزانی كە ترومبێلی یەكەم سایەقێكی كارامە و شارەزا دەی ئاژوێ و ئی دووەمیشیان كەسی تێدا نیە بێ ئاژوێ یان ئەگەر هەشبێ بابایەكی نەزان و ناشێیە، لێرەدا ژیریت دەیەنە ڕێك و پێك و هەدەف دارەكەی پاڵ دایە لای ئینسانێكی پسپۆڕ و لێزان و بە بەراوە ژووەوە دەیەنە ناتەواوو بێ سەرە و بەرەكەی پاڵ دایە لای نەبوونی پسپۆڕ و كارزان و شارەزایەك.



Scanned by CamScanner

## ئێستا با سەرنج بدەین :

باشە توخوا ئەگەر دیمەنی ترومبێلێك کە بە ڕێك و پێکی و بە وەستایی بەڕێ‌یەدا دەڕوا ناچارمان کات دان بێنین بە هەبوونی سەرپەرشتی کەرێك و ڕێ نمایی کەرێك دا ، ئایا دیمەنی هات و چۆی ڕۆژ و مانگ و زەوی و ئەستێرە و کەهکەشانەکان لە چەند سوڕگە و ڕێ و بانێکی پڕ وردەکاری و حسێب کراودا نابێتە هۆی ناچار کردنت کە بڕوا بێنی و قەناعەت پەیداکەی بەو زاتەی وەگەڕی خستوون و ڕەکاری خستوون؟!!

ئایا ئەگەر بە چەوتی ڕۆین و لە یاسا دەرچوونی تاقە ترومبێلێك چەند کارەساتی زیان بەخش و گێرە شێوێن ڕوو بدات، بەهۆی نەبوونی سەرپەرشتی کەر و ڕابەرێکی کارامە و لێزان لە نێو ئەو ترومبێلەدا، دەبێ ئەگەر وەك بەعزە کەسێکی سادە بیر و کالفام و ساویلکە دەڵێن بوونەوەر بێ سەرپەرشت و پەروەردگار بوایە کار بە کوێ گەیبا و دنیا چی بەسەر هاتبا؟!

پوختەی قسان ئەوەیە کە لە ماددەدا جووڵان و گۆڕانکاری هەیە چ ئەو جووڵان و گۆڕانکاری‌یەی لە نێوان گەردیلەکان دا دێتە دی و دەبێتە هۆی گۆڕانی توخمەکان و کارلێك کردنیان ، وە چ ئەو جووڵانەی لە نێو تەنەکان دا ڕوودەدات، بە واتایەکی دی، چ فیزیایی، وە ئەو جووڵانەش بە وردەکاری و کارامەیی بەڕێوە دەبرێ و دەبێتە هۆی هێنانە دی چەندین ئامانج و مەبەستی ویستراوو سوود بەخشی لە ژمێرە نەهاتوو. جا ئێمە هەر وەك چۆن جووڵانی سەعات و فڕۆکە و ڕۆکێت و ترومبێل و کارگە و ئاش و ..... هتد پاڵ دەدەینە لای سەرپەرشتی کار و وەگەڕخەرێکی شارەزا و لێ وەشاوە بە هەمان شێوەش پێویستە _مادام ڕێز و حورمەتی ژیری و زانیاری‌مان لە کن بێت _جووڵانی ماددەش بە هەموو شێوەکانی‌یەوە بگەڕێنینەوە لای پەروەردگار و بەڕێوەبە



Scanned by CamScanner

که خوای زاناو کاربەجێ و بە بەزەیی یە.

سێیەم: تاقمێکی بێ کوژت و کەم ئاوەز هەن دەڵێن: ئەو گۆڕان و پەرەسەندن (التغير والتطور)ەی بەسەر ماددەدا دێ زادەی خودی ماددەیە واتە: ماددە خۆی خاوەنی چەند خەسڵەتێکە کە هیچ کەس تێیدا نەخولقاندون و هەر هەیبوون وە لە سۆنگەی ئەم خەسڵەتانەوە ماددە گۆڕانی بەسەردا دێ و لە حاڵێکەوە دەچێتە حاڵێکی دی و پەرە دەستێنێ!! دەزانن کوڕینە ئەم قسەیەم چۆن دێتە بەرچاوان: وەك قسەی ئەو کەسەمْ دێتە بەرچاوان _لە واقیع دا هەرواشە_ کە نینکاری ئەوە دەکات (کۆمپیوتەر) لە ئەنجامی بیر کردنەوە و ڕامان و توێژینەوەی زانستیانەی درێژ خایەن هاتبێتە دی و دەڵێت: کوڕە بابم ئێوە دەڵێن چی (کۆمپیوتەر) ئامێرێکە لە چەند پارچەیەك پێك هاتوە کە هەر یەك لەو پارچانە شێوە و چۆنیەتی و ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە و لە ئەنجامی پێکەوە نووساندنیان دا بە شێوازێکی ڕێكو پێك و عیلمیانە دەتوانێ ئەو کارەی پێی دەسپێرێ ئەنجامی بدات. ئێمە چ پێویست دەکات بە ختو خۆڕایی بەولاو لایان دا بڕۆین و بە دوای هۆیەکی دەرەکی و نامۆدا بسوورێینەوە، پێویستە بۆ دیتنەوەی هۆی پەیدا بوونی هەر شتێك هەر لە خودی خۆی دا بۆی بگەڕێین و پەنا نەبەینە بەر هۆیەکی نادیار (غەیب) و پەنهان، کوردیش گوتوویەتی: (سەرت نایەشێ سێتای بۆ لێ دالێنی؟).

دڵنیام لەوەی هیچ کەس دوو دڵ نیە لە بێ بنچینەیی و قرێژکی ئەم قسەیەی ئێستا دیتمان، چونکە دەتوانین زۆر بەسێنایی ڕەتی بکەینەوە و بڵێین: باشە برالە نکوڵیمان لەوە نیە کە (کۆمپیوتەر) لە چەند بەشێك پێك دێ و لە



Scanned by CamScanner

ئەنجامی لێك دان و پێكەوە چەسپ كردنیان بە شێوازێكی عیلمیانە و تایبەتی دەتوانێ ئەو ئەركەی پێ دەسپێررێ بەجێی بێنێ، بەڵام مەسەلەی تەفسیر كردنو شی كردنەوەی جۆر و چۆنیەتی پێك هاتن و كاركردنی (كۆمپیوتەر) بە هیچ كلۆجێك ناتوانێ ببێ بە وەڵام بۆ پرسیاری (كێ كۆمپیوتەری دروست كردوە؟).

ئێمە گەرەكمانە بزانین كێ كۆمپیوتەری ساز كردوە ، بەڵام ئەتۆ وەك ڕێوی فێڵباز قۆرتێ دەكەی و خۆت لە وەڵامی پرسیارەكە دەدزیەوە و مەسەلەیەكی دیكە دێنیە گۆڕێ، ڕاست لە ئاقار هەڵوێستێكی ئاوادا بووە كە كوردان گوتوویانە: (كەر لە كوێ كەوتوە و كوندە لە كوێ دڕاوە!)، چونكە ئەگەر هەزاران لاپەڕە دەربارەی چۆنیەتی دروست بوونی (كۆمپیوتەر) و خەسڵەتە تایبەتی یەكانی پڕ وەكەی تەنیا ئیشێك كە كردووتە تەفسیر كردن و ڕوون كردنەوەی شێواز و چۆنیەتی كاركردنی ئەو ئامێرە و پێناسە كردن و خستنە بەرچاوی ماهیەت و سیفەتەكانیەتی، بە تەعبیرێكی دی ئەتۆ تەنیا ئەو ئیش و كار و وردەكاریەت خستۆتە ڕوو كە وەستای كۆمپیوتەر لە دروست كراوەكەی دا بەجێی هێناوە و كەم و زۆر بە لای ئەوەدا نەچووی كە بەڵگەت چی یە لەسەر نەبوونی وەستاو كارسازێك بۆ جێبەجێ كردنی ئەو كارە.

جا هەر بەهەمان پێ و دان ئەوانەی لە تەفسیر كردن و پێناسەكردنی ماددە ڕادەچن و دەڵێن ئەوە حالیەتی وئەوە خەسڵەتیەتی ئەوقسەیەی وان بە چ مەزەبان نالوێ بكرێتە وەڵام بۆ پرسیاری :( كێ ماددە و دیاردە سروشتی یەكانی خوڵقاندوە و بە گوێرەی چەند یاسایەكی عیلمانەی پڕ وردەكاری بەڕێوەی دەبات؟ )

بۆ پتر ئاوەڵا بوونەوەی مەبەست با گوێ لەم مشت وەمرەی خوارێ بگرین و نەختێك بە چاوی دڵ تێفكرین:

- بە هەر حاڵ دیارە هیچ کەسێك ڕێبازی خۆی پێ خراپ نیە و کەس دژی خۆی پێ ترش نیە، ئەمما زۆر چاك بزانە لەوەتی ئینسان چاوی کراونەوە و لە بواری زانیاری یە سروشتی یەکان دا پێش کەوتوە و شەقڵێکی نوێی بەخۆوە گرتوە لە چەنگ ئەفسانە و خەیاڵ پەرستی ڕزگاری بووەو بیری خواپەرستی و دینداری جێ پێی پێ لەق بووە و وەك بی سەرکەندی بە حاڵ و باڵ خۆی ڕاگرتوە.

+ چۆن؟ تکایە بێ زەحمەت تۆزێك ئەم قسەیەتم بۆ ڕوون بکەوە، چونکە ئەمن ڕاست بە پێچەوانەی تۆوە لەو مەسەلەیە حاڵی بووم و پێم وایە هەتا زانیاری شەقاوێك بەرەو پێشتر بڕوات ئینسان باشتر و زیاتر ڕاستی و بەجێ یی بیری گەورەیی خوای بۆ دەردەکەوێ.

- لەم بارەوە بەڵگە زۆرن بەڵام ئەمن تەنیا نموونەیەکت بۆ دێنمەوە:

چەند سەدەیەك بەر لە ئێستا خەڵك لە سۆنگەی ئەوەوە کە نەیان دەزانی باران چی یە و چۆن دەبارێ پاڵیان دەدایە لای خوا و وایان دەزانی فیتی وی یە، بەڵام ئێستا کە ئینسان تاستی زانیاری پێهەڵا چووە و بە نهێنی یەکانی سروشت ئاشنا بووە و دەزانێ کە باران لە ئەنجامی ئەو هەڵمەوە پەیدا دەبێت کە تیشکی خۆر لە دەریاکان دا پەیدای دەکات دوای بەرز بوونەوەی بە نێو چینەکانی هەوا و گەیشتنی بە چینێك هەوای سارد و خەست بوونەوەی هەوری لێ دروست دەبێ و لە هەوریش ئەو بارانە دێتە خوارێ کە دەی بینین، بەڵێ ئێستا بۆی دەرکەوتوە کە لە ڕابردوودا بە هەڵەدا چوو بوو ڕاستەقینەی لێ بزر بوو بوو.

+ برادەر ئەتۆ گوێت بەڵگەت بۆ دێنمەوە لەسەر ئەفسانەییتی دین و بیری خواپەرستی، بەڵام باسی چۆنیەتی باران بارینت بۆ کردم بە شێوەیەکی



Scanned by CamScanner

عیلمیانە، واتە تەنیا چۆنیەتی باران بارینت تەفسیر کرد، بەڵام پێت نەگوتم کە بەڵگەت چی یە لەسەر ئەوە کە باران بارین هیچ کەسێك بەڕێوەی نابا و سەرپەرشتی ناکا و نەخشەی بۆ ناکێشێ.

- کاکە ئەمن کە بۆم دەرخستی باران چۆن دەبارێ و دەرم خست کە لە دروست بوونی باران دا دەستی خوا لە کاردا نیە بەڵکو بە پێی چەند دەستوور و یاسایەکی سروشتی بەڕێوە دەچێت، مانای وایە هەر لەو کاتەش دا بۆم سەلماندوی کە خوا نیە، کاتێك سەلمێنراش خوا نیە ئەفسانەیی‌یەتی ئاینیش سەلمێنراوە چونکە وەختێك بناغەی دیوارێك ڕووخا دیوارەکەش هەرەس دێنێ.

+ برادەر لێرەدا بیری پووچی بێ بڕواییت دوو جارانی هەڵڕێزاندوی :

یەکەم: کە وات زانیوە موسڵمانان کە دەڵێن خوا فلان ئیشە دەکات وەك باران بارین مەبەستیان ئەوەیە کە خوا بە بێ بەکارهێنانی هۆ و ئامراز ئەو ئیشە بەجێ دێنێ ئینجا تۆش چەمکی بەراوەژووی (مفهوم المخالفة) ی ئەم گومانە هەڵەیەی خۆتت کردوە بە بەڵگە لەسەر نەبوونی خوا و ئەفسانەیی یەتی دین، بەم شێوەیە:

موسڵمانان دەڵێن خوا هەر کارێك بکا ڕاستەوخۆ و بێ بەکارهێنانی هیچ هۆ و ئامرازێك ئەنجامی دەدات، بەڵام ئێمە دەبینین هەر شتێك لە بوونەوەردا بە گوێرەی چەند هۆیەك و بە پێی یاسا و بەرنامە بەڕێوە وەچێ، کەواتە خوا نیە.

واتە: ئەگەر مەسەلەکە بکەینە موعادەلەیەکی ماتماتیکی بەم شێوەیەی لێ دێ: بڕوای موسڵمانان سەبارەت بە چۆنیەتی ڕەفتاری خوا لە بوونەوەردا + تێوە ڕامانی عیلمیانە لە بوونەوەر = نەبوونی خوا !!

دیارە لێرەدا ئەگەر تەنیا سەرنج بدرێتە شێوەی رواڵەتی ئەم



Scanned by CamScanner

موعادەلەیە ڕاست و دروست دێتە بەرنیگا، بەڵام یەکێك لە یاسای بنەڕەتی یە بەڵگە نەویستەکانی ژێر بێژی (منطق) ئەوەیە کە وەختێك دەلوێ ئەنجام (نتیجة) ێکی ڕاست وەدەست بێ لەهەر (قضیة)یەك دا کە پێشەکی یـ(مقدمە)ەکانی ڕاست و واقیعی بن، ئەما وەختێك یەکێك کە پێشەکی یـ(مقدمـة)ەکانی درۆ و نا واقیعی بـوون ئـەو ئەنجامـەش کـە لەوانەوە وەردەگیرێ بە هەڵە و ناتەواو حسێب دەکرێ، دەبا ئێـستا لـەو (قضیة)یە ورد بینەوە و بزانین لە کام جۆرە: جارێ پێشەکی یەکەمیان کە دەڵێت: موسڵمانان بڕوایان وایە کە خوا هەر کارێك بکات ڕاسـتەوخۆ و بێ بەکار هێنانی هیچ چەشـنە هۆیـەك ئـەنجامی دەدات، ئـەم قـسەیە شتێکی نا ڕاست و درۆیە و ڕستەی (لکل شيء سبب) بـۆ هـەر شـتێك هۆیەك هەیە تەنانەت موسڵمانە عـەوام و نەخوێنـدەوارەکانیش بەسـەر زاریانەوەیە، ئەوە لەسەرێکەوە لە سەرێکی دیشەوە کێ دەڵێـت ئیـسلام باوەڕی بەمە نیە کە خوا لە ڕێگەی بـەکارهێنانی ئامرازانـەوە ئـیش و کاری گێتی بەڕێوە دەبات ، بێ منەتی دەکەین با هەر تەنیا ئایەتێك یان حەدیسێك بێنێتەوە بۆ سەلماندنی ڕاستی یەتی دەعواکەی، دیارە ئەوەش مەحاڵە.

ئێستا کە زانرا حاڵی پێشەکی یەکەم چۆنە بـا بـچینە سـەروکاری پێشەکی دووەمیان کە بریتی یـە لـە (تیـۆرامـانی عیلمـی یانـە لـە بوونەوەر):

شکی تێدا نیە کە تیۆرامانی زانستی یانە لە بوونەوەر هەتا ئێستا سەلماندوویەتی کە هەموو ئیشێکی ئەم بوونەوەرە بە پـێی چـەند هـۆ و دەستوورێك بەڕێوە دەچێت، واتە ئەم پێشەکی یە خۆی لە خۆی دا ڕاستە



Scanned by CamScanner

بەڵام ئایا بەتەنێ ئەوەی لە باران دا هەیە کە ئەو ئەنجامەی لێ وەفامرێ کە بابای نا موسڵمان دەیەوێ؟! لە وەڵام دەڵێین: نەء چونکە مادام پێشەکی یەکەم هەڵە بوو تازە (قضية) کە بە هەڵە دەدرێتە قەڵەم با پێشەکی دووەمیش ڕاست بێت، با بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینە بەر چاوان: ئایا ئەم (قضية) یە هەڵە نیە: هەموو گیاندارێك ئینسانە، هەموو ئینسانێکیش خاوەنی ژیری یە کەواتە هەموو گیاندارێك خاوەنی ژیری یە؟!

دیارە هەڵەیە چونکە هەموو گیاندارێك خاوەنی ژیری نیە.

بەڵام ئایا خەتای کام لە پێشەکی یەکانە کە ئەم (قضية)یە وەدرۆ گەڕاوە؟ بێگومان فیتی پێشەکی یەکەمیانە کە شتێکی نا واقعیی لە نێو خۆ گرتوە، دەنا پێشەکی دووەمیان چ بەڵام لێ نێ و ڕاست و دروستە (هەموو ئینسانێك خاوەنی ژیری یە).

دەجا ئەو مەسەلەیەی مەش کت ومت وەك ئەم وێنەیەیە بێ زیادو کەم.

دووەم: هەڵتریزاوی لەوەدا کە وات زانیوە هەر شتێك بە هۆی چەند یاسا و دەستوورێکەوە بەجێ بهێنرێ بەدی هێنەر و سەرپەرشتی کەری گەرك نیە! بەڵام ئێمە تۆزێك لەمەوبەر ڕوونمان کردەوە کە بەم چەشنە بیر کردنەوەیە ئینسان دەچێتە تاڵی منداڵی و بەم جۆرە قسانە ئینسان خۆی دەباتە ڕیزی منداڵی یەوە[1]!

---

(١) پوختەی مەبەست ئەمەیە: کە ئەم بوونەوەرە پەیدا بوویە دەبێ هێزێك هەبێ بوویێتە هۆی پەیدا بوونی ، بۆ خۆشی ئەوەی لێ ناوەشێتەوە کە [illegible] دەبێ ئەو هێزەی بۆتە هۆی پەیدا بوونی بوونەوەر غەیری ماددە و غەیری بوونەوەر [illegible]

# بەڵگـەی دووەم

## ڕێك و پێكـی و یاسـا بۆ یاسـا دانەر نابێـت

لەو بەڵگانەی کە ئیسپاتی دەکەن کە بڕوا بە خوا بوون شتێکی خوارسك و سروشتی یە لە ئینسان دا ئەو یاسا ژیری‌یەیە کە دەڵێت: بۆ هەر ڕێك وپێکی و یاسایەك ڕێك خـەر و یاسـا دانـەرێك هەیـە، (لکـل نظـام مـنظم). ئێـستاش بەهێنانەوەی وێنەیەك چەمکی ئەم یاسایە ئاوەڵا دەکەینەوە:

دەنکە شخارتە کە بریتـی یـە لـە داروچـکەیەکی گـچکە و چـوار پێـنج سانتیمەتر درێژە و نزیکەی (٢ملم٢) ئەستورە و لـە سـەرێکـیەوە تۆزۆکێـك گۆگرد چەسپ کراوە، ئەو دەنکە شخارتەیە هـەر کەسـێك تۆزێـك لـێی ورد بێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە وەستایەك دروستی کردوە، با بزانین هۆی ئەوە چیە؟

لە سۆنگەی ئەوەوە کە تێ دەفکرین درێژی و ئەستووری و ئەنـدازەی ئـەو گۆگردەی پێیەوە نووسێنراوە هەر کامیان ئەندازەیـەکی تایبـەتی هەیـە، کـە ئەگەر هەر یەکێك لەوانە ئەندازەکەی پتر یان کەمتر بایە ئەو مەبەسـتەی کـە دەنکە شخارتەی بۆ دروست کراوە نەدەهاتە دی، دیارە ئەو شـێوە و چـۆنیەتی یانەش کە دەگونجا دەنکە شخارتەیان لەسەر بێت یـەکجار زۆرن جـا وەختێـك ئینسان بەراوردی نێـوان ئـەو حاڵەتـەی ئێـستای دەنکـە شـخارتە و حاڵەتـە لەنیمکان دا بووەکان دەکات بێ سێ و دوو دەڵێت: دەبێ دەستی کارسازێك لە دروست کردنی ئەم دەنکە شخارتەیەدا هەبوو بێت. لەوەوە کە ڕابورد دەگەینـە ئەم ئەنجامە:-



Scanned by CamScanner

هەر کاتێك لەهەر جێیەك دا ڕێك و پێکی و وردە کاری لە شتێك دا بەدی کرا ناچار دەبێ وەستاو نەخشە دانەر و سەرپەرشتی کەرێك بۆ هاتنــە دی ئـەو شتە بڕیار بدەین.

کەواتە ئێستا با سەرنج بدەین داخوا ڕێك و پێکی و یاسا و وردەکاری یـە لەم بوونەوەرەدا بەدی دەکەین؟!

دە وەرە خوێنەری بەڕێز و ئازیز با پێکەوە بە زەرەبینی ژیری و زانست تێ فکرین و چەند ڕووپەڕێك لە کتێبی زەبەلاحی بوونەوەر هەڵ دەینەوە و لە چەند تابلۆیەکی ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش وردبینەوە، تا بزانین چەند بەختێکی درشت و جوان لەسەر هەر کام لە تابلۆکانی بوونەوەر نوسراوە: (لا إله إلا الله) غــەیری خوا چ پەرستراو نین:

## تابلـۆی یەکەم : پێکـەوە بەسـترانی کائینات [1]:

کائینــاتی ئــەم بوونــەوەرە وەك خانــە و ســێڵەکانی جەســتەیەك پێکــەوە بەستراون و پەیوەندی یەکی وایان لە نێوان دا هەیـە ئەگـەر خوانەخواسـتە نـا گونجاوی یەك ڕوو بکاتە یەکێکیان هــەموو ئــەوانی تـر زیانیــان پــێ دەگــا و وەزعیان تێك دەچێ، تەنیا یەك وێنە دێنینەوە بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستی یە:-

ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرت لە گرنگـی پەڕ و پــۆی باڵنـــدە و پەڕەوورەکان کردۆتەوە ودەرکی ئەوەت کردوە کە ژیانی تـۆو گیانـداران و شـیناوردی پێـوە

---

(١) ئەم تابلۆیەم بە دەسکاریەوە وەرگرتوە لە کتێبی (نشانەهائی از او) دفتر یکم، لاپەڕە (٨٨)، أثر (سید رضا صدر).

بەستراوە؟ بڕوا ناکەم شتی وات بە بیردا هاتبێ مادام وایە تۆزێك گـوێ بگـرە: پەڕ و پۆی باڵندە جەستەی پەڕەوورەکان لە گەرما وسەرما دەپارێزێ، واتە ئەگەر پەڕەوورەکان پەڕو باڵیان نەبوایە توانای خۆ ڕاگرتن یان نەدەبوو لە ئاقار گەرما و سەرمادا و بە زوویی سەریان بەفەتارەت دەچوو، لە ئەنجامی ئەوەش دا هەموو ئەو زیندەوەر و مێروانەی کە بەشی سەرەکی خۆراکی باڵنـدەکان پێـك دێـنن پەرەیان دەستاند و زۆر دەبوون چونکە لەبەر دەنووکی باڵندەکان قوتار دەبوون، ئەوەش سەری دەکێشا بـۆ سـامەرە سـتووتر بـوون و شـوول لێ هەلکێـشانی زیندەوەرەکان و بە ئۆرد و دەرژانە نێو کێڵگە و مـەزرا و باخـچەکان و قڕیـان دەکشت و کاڵ و شیناورد و گیا و گوڵان دەخـست، ئینجـا ئـاژەڵ و گیانـدارە شیناورد خۆرەکان لە سۆنگەی نـەبوونی تفـاق و لـەوەڕ و خـۆراك دا سـەریان دەنایەوە و کورد گوتەنی لە لەوەڕ دەبوون. بە لە نێو چوون و ماڵاوایی کردنـی گیاندارە گیا خۆرەکانیش نۆرە دەگەیشتە سەر گیاندارە گۆشت خۆرەکـانیش و بەم جۆرە زەوی دەبوو بە کاولاش و زیرووحی تێدا نەدەما. دیـسان زۆر بـوونی زیندەوەر و کرم و مێروو دەعبا وردیلەکان دەبوو بەهۆی زۆر بـوونی بـەکتریا و ڤایرۆسە زیان بەخشەکان و قڕیان دە ئینسانان دەخست و ئاسەواریان دەبـڕین و کورد گوتەنی. فریزوویان پێ دەڕنینەوە. کەواتە: ئایا ڕاست نیە کە بوونەوەر پڕ لە یاسایە و وردەکاری تێدا ڕەچاو کراوە و پـەروەردگارێك مـشووری دەخـوا و بەڕێوەی دەبا؟!



Scanned by CamScanner

## تابلۆی دووەم: ئاوی زەریاکان بۆ سوێرە؟![1]

ڕەنگە زۆری وا هەبن بە سوێری و تفتی ئاوی زەریاکان قەڵس و نا سەرسەنگ بن و بڵێن بریا ئاوی زەریاکانیش وەك ئی کانیاوو چۆم و ڕووبارەکان شیرن و بەلەزەت بایە و، ڕەنگە بەعزە کەسێکیش هەبن بە دڵ ئەوە بخوازن کە توانایان بەسەر جیهان دا هەبایە کە دەسکاری بەعزە شتێکیان کردبایە بۆ وێنە: ئەو سوێری یەی ئاوی زەریاکان.

بەڵام با سەرنج بدەین و بزانین حیکمەتی سوێری ئاوی زەریاکان چیە؟ (ئارکدی لئوکوم) دەڵێت: زۆر جاران هێندێك ڕاستی‌یان دەبینین کە سەرمان گێژ دەکا و ناتوانین وەڵامێکی ئیقناع کەری بۆ بێنین، یەکێك لەو ڕاستیانە دیاردەی هەبوونی خوێیە لە ئاوی زەریاکان دا کە تا ئێستا نەزانراوە چۆن پەیدا بووە، بەڵکو سادەترین وەڵام بۆ چۆنیەتی پەیدا بوونی خوێ لە ئاوی زەریاکان دا ئەوەیە کە بڵێین: نازانین.

بەڵێ ئێستا _ وەك ئەو زانایە گوتی_ نەتوانراوە بە شێوەیەکی عیلمی یانە چۆنیەتی پەیدا بوونی خوێ لە زەریاکان دا تەفسیر بکرێ، بەڵام با بزانین هەبوونی خوێ لە زەریاکان دا چ تەئسیرێکی سەلبی یان ئیجابی هەیە بۆ سەر ژیانی دانیشتووانی سەر زەوی:

بەری هەموو قسان پێویستە بزانین کە ئەندازەی ئەو خوێیەی لە زەریاکان هەیە ئەگەر بلوێ ئاوی زەریاکان ڕاپازنین و خوێیەکەیان لێ بگرین دەتوانین بەو

[1] بۆ نوسرانی ئەم تابلۆیە سوودم لە کتێبی ( بن بگو چرا) وەرگرت بەرگی (۳) لاپەرە (٤٦٣) نووسراوی زانای بەناوبانگی ئەورووپایی (ارکدی لئوکوم)، تەرجەمەی فارسی.

خوێ یە دیوارێك دروست بکەین کە بەرزی یەکەی(١٨٠) میل بێ و پانی یەکەی (١) میل و بە باری درێژی دا دەوری زەوی بداتەوە لەسەر هێڵی یەکسانی (خط الإستواء) هەردوو سەرەکەی پێك بگەنەوە!!

بەڵام بۆ تەفسیری سوێری دەریاکان لە ژیانی دانیشتووانی سەر خڕۆکەی زەوی دا دەڵێین: کێهەمان نەی دیوە زۆر جاران لە ماڵێ خوێیان بەو گۆشتەی وەرکردوە کە بە هەویا هەڵگرتنێ بوون؟.

بێگومان ئەو خوێ پێ وەرچاندنەش بۆ ئەوەیە کە گۆشتی تاین نەبێتە دەور و بەرێکی لە بارو گونجاو بۆ تێدا ژیان و زاووزێ کردنی بەکتریا و ڤایرۆسەکان، دە ئاوی زەریاکانیش بۆ هەمان مەبەست پەروەردگاری زانا و کاربەجێ خوێی پێ وەرچاندوون و بگرە کردوونی بە خوێ واوك.

ئەمما پەروەردگاری کاربەجێ وەنەبێ وەك ئێمەی ئینسان بیر کورت و بێ لێکدانەوە بێ و (سبحان الله) بۆ خاتری وەدەست هێنانی بەرژەوەندییەك لە سەرێکی دیکەوە زیان بە خۆی بگەیەنێ، نەخێر خوای بەخشندە چونکە زانیویەتی ئاوی سوێری دەریاکان بەکەڵکی خواردن و خواردنەوە نایەت، لەبەر ئەوە لە رێگەی چەند یاسایەکی وردی عیلمی یانەوە بە پاڵاوتنی ئەو ئاوە سوێرە خوێیەکەی لێ وەلابردوە و ئاوێکی شیرن و زوڵاڵی بۆ فەراهەم هێناوین ئەوەش لە رێی باران بارینەوە، لە هەمووی سەرنج ڕاکێش تر _ خوێنەری بەرێز _ ئەوەیە کە خوای باڵا دەست هەر بە هێندێ لێ نەگەڕاوە کە لە رێی باران بارینەوە ئاوێکی شیرین و بەلەزەتمان بۆ برەخسێنێ، بەڵکو وێڕای ئەوەش لە ئەنجامی یەکگرتنی ئۆکسجین و نایترۆجین دا خوێ ی نیتراتیشی پێك هێناوە و لە رێگەی بارانەوە خستویە خوارێ و ناردوویەتە نێو زەوی بۆ خاتری وەی زەوییە کشتوکاڵی و لەوەڕگایی یەکانمان بۆ بە پیت و پێز بکات.

کەواتە : فەرز نیە لەسەر بەندەکان کە سوپاسی خواوەندی مەزن بکەن کە بەڕێوەبردنی ئەم جیهانەی بە ئینسانی بێ کورت و نەزان نەسپاردوە و هەر بۆ خۆی سەرپەرشتی دەکات؟!!.

## تابلۆی سێیەم: هەوای دەوری زەوی:

ئەو هەوایەی دەوری زەوی داوە نزیکەی(٥٩٠٠)[1] ملیۆن تەن دەبێ، ئەگەر پتر یان کەمتر بوایە ژیان مەحاڵ دەبوو، چونکە ئەگەر پتر بوایە پاڵەپەستۆ و فشار لەسەر ئینسان زیاتر دەبوو کاری دەکردە سەر ئەندامەکانی و گچکە دەبۆوە و بە زەحمەتیش توانای جموجۆڵی دەبوو، خۆ ئەگەر کێشی هەوا کەمتر بایە لەو ئەندازەیەی ئێستای ئەوە فشاری هەوا لەسەر جەستەی ئینسان کەم دەبۆوە و فشار و پاڵەپەستۆی نێوەوەی جەستەی ئینسان هورووژمی دێنا و مادە شلەکانی نێو لەشی مرۆڤ بە هەموو کون و کەلێنێکی دا فڕکەیان دەکرد و کۆئەندامەکانی لەش لەکار دەکەوتن، چونکە ئێستا لە نێوان فشاری نێوەوەی لەشمان و فشاری هەوای ژوور سەرمان هاوسەنگی و یەکسانی هەیە و هیچیان لە هیچیان پتر نین، بەڵام بە زیاد بوون یان کەم بوونی کێشی هەوا، ئەو پێکەڵ پێکی و هاوسەنگی یە تێك دەچێ و دەشێوێ.

ئەوە هەمووی لە لایەکەوە لە لایەکی دیشەوە هەوا لە چەند توخمێك پێك هاتوە کە هەر کامێکیان ئەندازەیەکی گونجاوی هەیە لەگەڵ ژیانی ئینسان و گیاندار و ڕووەك دا کە ئەگەر ئەو ئەندازەیە بگۆڕرێ جا کەیفێ خۆیەتی بە لای

(١) (نشانەهائی از او) دقتریکم. سید رضا صدر.

کەمی‌دا یان بە لای زۆری یەدا ئەوە کارەکە خراپ دەبێ و شێوازەی ژیان دەپچڕێ.

وەك دەشزانین ئۆکسجین ڕێژەی لە هەوادا (٢١٪) و دووم ئۆکسیدی کاربۆن (٠,٠٣٪)یە واتە (٣/١٠٠٠) و نایترۆجین (٧٨٪) و (١٪)ی هەواش تۆز و غوبار و هێندێك توخمی تر پێکی دێنن. جا وەك زانایان دەڵێین ئەگەر بێت و ڕێژەی هەر کام لەم توخمانە پتر یان کەمتر بایە لە هەوادا ئەوە ژیانی گیاندار و ڕووەك دەشێوا .

ئینجا لە هەمووش سەرنج ڕاکێش تر ئەوەیە کە لە نێوان توخمی ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دا چەشنە پەیوەندی‌یەکی برایانەی سەیر هەیە، هەرچی (ئۆکسجین)ە ئینسان و باقی گیاندارەکانی دیکە هەڵی دەمژن و بە بێ وی ناژین، بەڵام دووەم ئۆکسیدی کاربۆن سەبارەت بە ئینسان وگیانداران ژەهرێکە و خۆ لێ ڕزگار کردنی سەریەسەر بە زێڕی بکڕێ ئێستا هەرزانە، ئەمما ڕووەك و شیناورد ڕاست بە بەراوە ژوودوە، واتە: دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەمژێ و ئۆکسجین فڕێ دەداتە دەرێ.

باشە دەبێ بۆچی پەروەردگار وای لە ڕووەك و شیناوردان کردبێ کە بە بێ ئەو ژەهرەی نەژیەت کە لە ڕاستی دا بریتی یە لە خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵی خانەکانی جەستەی گیانداران؟! بێگومان بۆیە ئەو کارەی کردوە هەتا سەودا و مامڵەت و کڕین و فرۆشتن لە نێوان ڕووەك و گیانداران دا بەرقەرار بکات و پێکەوە بیانکاتە براو وایان لێ بکات بە بێ یەکدی نەژین،ئاخر ئەگەر ئینسانو باقی گیانداران لە لایەن ڕووەکەوە ئۆکسجینیان بۆ ساز نەکرابایە ئەو ئەندازە (ئۆکسجین)ەی هەیە لە هەوادا لەمێژ بوو دەبڕا و ئەوانیش بێ بژیو دەکەوتنە

گۆڕێ، دیسان ڕووەکیش ئەگەر لە لایەن گیاندارانەوە خۆراکی بۆ دابین نەکرابا ئەویش بەمەرەدی برادەرەکەی دەچوو.

دە ئێستا خوێنەری ئازیز هەر هێندەم پێ ماوە بڵێم سەیری ئەو وردەکاری و ڕێك و پێکی یەی کائیناتی خوای بە بەزەیی بکە و با ویژدانت قایل بێ بەندایەتی نەکەی!!

## تابلۆی چوارەم: گرنگیی پێستی لەش:

١- پێست چەند کونێکی وردیلەی تێدایە کە بەشێك لە هەناسەدان لە ڕێی ئەوانەوە ئەنجام دەدرێ، خۆ ئەگەر ئەو کونانە گیران ئەوە ئینسان حسابی دەڕوا و دەبێ دەستانی لێ بشۆرێن.

٢- پێست چەند لوێکی تێدایە کە ئارەق دروست دەکەن و لە لەشی وەدەر دەنێن بەهیوای کەم کردنەوەی پلەی گەرمی لەش،بۆیە دەبینین لە دەمی هاوینان و لە وەختی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی ئاوو هەوادا ئارەق دەردانی لەش زۆر چالاکە و بە بەراوە ژوورەوە لە وەختی نزم بوونەوەی پلەی گەرمی ئاوو هەوادا ئارەق دەردانی لەشیش سست تر دەبێت، چونکە وەختێك پلەی گەرمی ئاووهەوا دادەبەزێ و هەوا سارد دەبێت لەشمان بۆ خاتری وەی تووشی زیان نەبێت پێویستی بە وزە و گەرمی هەیە بۆیە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کە سەرما داهات بێ‌ئەوەی ئێمە هەرئاگاداریش بین کونەکانی پێست دادەخرێن و مەودا نادرێت بە وزە و گەرمی نێو لەش کە لە ڕێی ئارەق کردنەوە بڕواتە دەر، هەر بۆیەشە پلەی گەرمی لەش چ لە دەمی قرچە قرچی گەرمای هاوین دا و چ لە وەختی سەرما و زوقمی



Scanned by CamScanner

زستان دا لە دەوری (٣٧) دەمێنێتەوە، بەڵام باقی تەنەکان بە پێچەوانەوە لە دەمی گەرمادا گەرم دادێن و لە کاتی سەرماش دا سارد دەبن.

٣- پێست چەند لوێکی تێدایە هەڵدەستن بە دەردانی چەوری بۆ خاتری وەی مووەکانی لەش هەمیشە نەرم و نۆڵ و تازە بن و پێستیش وشك هەڵنەگەڕێ و چرچ و چۆڵ نەبێ و تەڕ و پاراو بێت.

٤- پێست هێڵی یەکەمی بەرگری کردنی لەشە لە ئاقار هێرشی میکرۆب و چروجانەوەری وردیلەدا و وەك دیوارێکی مەحکەم نایەڵێ پێ بنێنە نێو سنووری لەشەوە، وەختێکیش پێست بریندار دەبێ و کەلێنی تێ دەکەوێ و هێڵی یەکەمی بەرەی بەرگری کردنی لەش دەشکێنرێت گرنگی پێست دەردەکەوێ، کوردانیش لەمێژە گووتوویانە: قەدری مانگێ لە تاریکە شەوان دا دەزانرێ!!

٥- پێست ئەو مادده ژاراویانەی لە لەش دا پەیدا دەبن بەشێکیان لە ڕێی ئارەق کردنەوە لە وەڵاتی لەش دەرداوێ و بەم کارەش یارمەتی یەکی برایانەی گورچیلەکان دەدات.

٦- پێست لە چوونە دەرەوەی مادده شلەکانی لەش بەرگری دەکات کە پتر لە (٤/٣) ی جەستەی ئینسان پێك دێنن بۆ وێنە: خوێن.

٧- پێست ئێو جەرگەی هەستی دەست لێ کوتانە ( مركز حاسة اللمس ). ئەو هەستەی کە ساردی و گەرمی و تەنکی و ئەستووری و توندی و شلی و ... هتدی پێ دەزانرێ.

بێگومان هەر یەکێك لەم ئەرکانەی پێست چەندین کرێکار و ئەندازیار و پسپۆڕی زەبر بە دەستی گەرەکە، جا نازانم خوێنەری بەڕێز هیچ جاران



Scanned by CamScanner

کڕنووشی بەندایەتی و شوکرانە بژێریت بۆ پەروەردگارە بردوە کە ئەو هەموو وردەکاری و دەستوور و یاسایانەی لە دروست کردنی لەشت دا ڕەچاو کردوە یان نــــا؟!![1]

## تابلۆی پێنجەم : زەبەلاحی بوونەوەر:

بەعزە کەسێکی بیر کورت و ساویلکە دەڵێن ئێمە وەختێك بڕوا بە خوای میهرەبان دێنین کە بتوانین بی هێنینە بەر خەیاڵ و و بزانین چۆنە!! بەڵام ئەوانە وادیارە نە خۆیان دەناسن و نە خوا و نە مولکی خوا، دەنا ئەوانە ئەگەر بزانن مێشکی وان چەند چووکەڵەیە و مولکی خوا چەند پان و بەرینە کە بە هیچ کلۆجێك ناتوانن تەنانەت بەشێکی مولکی خوا بە خەیاڵی خۆیان دا بێنن چ جای هەمووی بە هیچ ڕەنگێك هێندە خۆیان لێ نەدەگۆڕا کە لافی وا لێ بدەن و ئیدیعای وا بکەن.

ئێستاش بۆ خاتری وەی بیر کورتی و بێ ئەزموونی ئەوان چەشنە کەسانەمان چاکتر بۆ دەرکەوێ کە دەیانەوێ زات و ماهیەتی خوا بناسن و بی هێننە بەر ئاوێنەی خەیاڵ با بڕێك لە گۆشەیەکی مولك و مەملەکەتی خوادا بکەوینە موتالاّ و تێ فکرین : (ئارکدی لئوکوم) لە کتێبی[1] (پێم بڵێ بۆچی) دا دەڵێت : ئینسان نەك هەر ناتوانێ ئەندازەی ڕاستەقینەی بوونەوەر بزانێت بەڵکو ناتوانێ

---

(١) کتێبی (نشانەهائی از او) دفتر دوم (سید رضا صدر).

(١) ئەم کتێبە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی بە ناوی (من بگو چرا) ، سەیری بەرگی (٣) لاپەڕە (٣٤٥، ٣٤٦، ٣٤٧)بکە.

هەر بیریشی لێ بکاتەوە و بی هێنێتە بەر خەیاڵیش، ئەگەر لە زەویەوە دەست پێ بکەین و بەرەو پێشتر بڕۆین تێ دەگەین بۆچی ئەوە وایە.

زەوی یەکێکە لە خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، بەڵام بە بەشێکی گچکەی دادەنرێ، بەڵام ئەم بەشە گچکەی کۆمەڵەی خۆر کێشەکەی (٦٦٠٠) ترلیۆن تەنە، [٢] واتە:

(٦,٦٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) تەنە!!

کۆمەڵەی خۆریش بە ڕۆژ و ئەو خڕۆکانە دەگوترێ کە بە دەوری دا دەخولێنەوە، ئینجا کۆمەڵەی خۆریش بەشێکی زۆر چووکەڵەیە لە کەهکەشانی کاکێشان (مجرة درب التبان)، بەڵێ لە ڕاستیدا ڕۆژ خۆی یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشان کە نزیکەی دوو سەد بلیۆن (١٠×٢٠)١٢ ئەستێرەی وەك خۆری خۆمان و گەورەتر یان گچکەتری تێدایە!![٣].

ئەو کەهکەشانەی لە مەڕمە نزیکەی (١٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکی هەر پانایییەتی، بۆ ئەوەی بزانی ئەم ئەندازەیە چەند بێ ڕەزایە پێویستە بزانی ساڵی تیشکی چیە؟ ساڵی تیشکی ئەو ماوەیەیە کە تیشك لە ماوەی ساڵێکی خۆمان دا دەی بڕێت، دایان ناوە بۆ پێوانی دووری و نزیکی نێوان کەهکەشان و ئەستێرەکان ، واتە هەروەك چۆن یەکەی پێوانی گەنم تەنەکەیە و ئی کوتاڵ مەتر و یاردە و ئی ڕێ و بان میل و کیلۆمەتر و ....هتد یەکەی پێوان (الوحدة القیاسیة)ی ئەستێرە و خڕۆکەکانی ئەم بوونەوەرەش ساڵی تیشکی یە.

ئێستا با بزانین ساڵی تیشکی چەندە؟

---

(٢) سەیری بەرگی (٢) لاپەڕە (١٧)ی هەمان کتێب بکە.

(٣) سەیری کتێبی ناوبراو بکە بەرگی یەکەم لاپەڕە (١٠٥).



Scanned by CamScanner

تیشك لەهەر چرکەیەك دا (١٨٦٠٠٠)میل دەبڕێت واتە (٣٠٠,٠٠٠)کم کەواتە بۆ خاتری وەی بزانین لە ماوەی ساڵێك دا چەند دەبڕێت گەرەکمانە هەوڵ جار بزانین لە (٦٠) چرکەدا چەند دەبڕێ و ئینجا لە (٦٠) دەقیقەدا و ئینجا لە (٢٤) سەعات دا و ئینجا لە (٣٦٥) ڕۆژدا بەم جۆرە:

٦٠×١٨٦٠٠٠=١١,١٦٠,٠٠٠ میل لە هەر دەقیقەیەك دا.

٦٠×١١,١٦٠,٠٠٠=٦٦٩,٦٠٠,٠٠٠ میل لەهەر سەعاتێك دا.

٢٤×٦٦٩,٦٠٠,٠٠٠=١٦,٠٧٠,٤٠٠,٠٠٠ (شازدە میلیار و حەفتا ملیۆن و چوار سەد هەزار) میل لە ڕۆژێك دا.

٣٦٥×١٦,٠٧٠,٤٠٠,٠٠٠=٥,٨٦٥,٦٩٦,٠٠٠,٠٠٠ (پێنج بلیۆن و هەشت سەد و شەست و پێنج ملیار و شەش سەد و نەوەد و شەش ملیۆن) میل لە هەر ساڵێك دا دەبڕێت.

واتە: نزیکەی (٦) بلیۆن کە دەتوانین لە جیاتی دوازدە سفری بۆ دانێین بنووسین ($٦×١٠^{١٢}$).

کەواتە تیشك لە ماوەی ساڵێك دا ($٦×١٠^{١٢}$) میل دەبڕێت.

ئێستا بۆئەوەی پانایی کەهکەشانەکەی لەسەر خۆمان بزانین پێویستە بڵێین:

١٠٠,٠٠٠×٦,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠

=٦٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠($٦٠٠×١٠٠٠^{١٢}$) میل پانایی کەهکەشانەکەی لەسەر خۆمانە!!

ئێستا ڕەنگە یەکێك بپرسێ، باشە ئەگەر ڕاستە باقی ئەستێرەکانی تری کاکێشان یان وەك ڕۆژن یان گەورەتر چما هێندە گچکە خۆ دەنوێنن؟!

لە وەلامدا دەڵێین : ڕۆژ كە قەبارەكەی(١,٣٠٠,٠٠٠) ملیۆنێـك و سێ سەد هەزار جار هێندەی قەبارەی زەوی‌یە لەبەر ئەوەی(٩٣,٠٠٠,٠٠٠) نەوەدو سێ ملیۆن میل لە ئێمەوە دوورە هێندەی سینی‌یەك دێتـە بەرچـاوان، ئـەمما دەزانی نزیك ترین ئەستێرەی كاكێشان لە زەوی ئێمەوە چەند دوورە كە بریتی‌یە لە ئەستێرەی (ئالفاسنتاری): (٢٥) بلیۆن میل ئەگەر بە نووسینی ئاسایی بی نووسین (٢٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) میل لە ئێمەوە دوورە.

هەتا ئێرە قسە هەر لە كەشكەشانەكەی خۆمانە!!![1]

ئەمما زۆر باش بزانە كە ملیۆنەها كەهكەشانی تری وەك ئەوەی لەمەڕ مە لە بوونەوەردا هەن، كە ڕەنگە ئەگەر گشت ئەو كەهكەشانانە لەسەرێك كەڵەكە بكەین ئێستا بە هەموویان گۆشەیەكی ئەم مولكە بەرینەی خوا پێك بێنن.

ئەوە هەمووی لە لایەكەوە و لـە سـەرێكی دیكەشـەوە گـەردوون ناسـان بڕواشیان وایە كە ئەم بوونەوەرە تاو بۆ تاوێ پتر خۆی لێك دەكێشێتەوە و بەرین دەبێت، سەرسوڕهێنەرتر لێرەدا ئەوەیە كە گووتاری خواش ـقورئانی گـەورەـ ئاماژەی بۆ ئەم ڕاستی یە كردوە وەك دەفەرمێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾[2]. واتە: ئاسمانمان بە هێز و توانا خولقاندوە و بەرینیشی دەكەین!.

پێم وایە ئێستا ساویلكەیی‌یەتی ئەوان كەسانمان بۆ دەركەوت كە بە هیوان پەروەردگاری مەزن و باڵا دەست بێننە بەر ئاوێنەی بیر و خەیاڵ و وەك شتێكی بەرهەست هەستی پێ بكەن.

---

(١) تیشك كە لە چركەیەكدا (١٨٦,٠٠٠) میل دەبڕێ بە (٨) دەقیقە لە خۆرەوە دەگاتە زەوی، ئەمما لە چەقی كاكێشانەوە تا دەگاتە ڕۆژ (٢٧,٠٠٠) ساڵی گەرەكە.

(٢) الذاريات : ٤٧ .



Scanned by CamScanner

## تابلۆی شەشەم: ڕۆژ و تیشك دانەكەی:

ڕۆژ وەك پێشتر گوتمان یەكێكە لە ئەستێرەكانی كاكێشان، ئەما لە سۆنگەی ئەوەوە كە نزیك ترین ئەستێرەیە لە زەوییەوە لە باقی ئەستێرەكان گەورەتر خۆی دەنوێنێ.

ڕۆژ (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە و (٩٣,٠٠٠,٠٠٠) میل لە زەوییەوە دوورە.

لە ڕۆژدا پتر لە (٦٠) توخم هەن لەو توخمانەی كە لە زەویدا هەن لە نێو ئەو توخمانەدا هایدرۆجین و هیلیۆم و ئاسن و كالیسیوم هەن پلەی گەرمی ڕۆژێ لە ڕووكاری دەرێی نزیكەی (١٢,٠٠٠) پلەی (فەهرەنهایت)ەو لە دیوی نێوەوەیدا نزیكەی ملیۆنێك و بگرە پتریش، بۆ خاتری وەی بزانین ملیۆنێك پلەی (فەهرەنهایت) چەندە پێویستە بزانین كە لە (٢٤٠٠) پلەی (فەهرەنهایت)ی بەرد و ئاسن و كانزاكان نەك هەر دەتوێتەوە بەڵكو دەبنە گازیش.

تیشك دانەوەی خۆر چۆن چۆنی یە؟!

ساڵانی پێشوو زانایان وایان دەزانی كە هۆی تیشك دانەوەی خۆر سووتانیەتی، ئەما شكی تێدا نیە كە بە هەڵەدا چوو بوون چونكە هیچ تەنێك ناتوانێ سەدان ملیۆن ساڵ بسووتێ و بەردەوام بێت.

ئەمڕۆ زانایان بڕوایان وایە كە تیشك و گەرمی خۆر ئەنجامی دیاردەیەك وەك دیاردەی تەقاندنەوەی بۆمبای ئەتۆمی یە، واتە خۆر ماددە دەگۆڕێ بۆ وزە، هەڵبەتە ئەم دیاردەیەش لەگەڵ دیاردەی سووتاندا جوێیە، چونكە سووتان

بریتی‌یە لە گۆڕرانی مادده لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر بەڵام گۆڕرانی مادده بۆ وزە دەبێتە هۆی پەیداکردنی وزەیەکی زۆری نائاسایی لە ئەندازەیەکی کەم دا، بۆ وێنە نیو کیلۆ مادده دەتوانێ هێندە وزە بڕەخسێنێ کە پتر لە یەك ملیۆن تەن بەرد قاڵ بکاتەوە!

کەواتە ئەگەر زانیاری ئێستامان ڕاست بکات (١/١٠٠) ماددەی خۆر هێندە وزە دەڕەخسێنێ کە بەشی (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار ملیۆن ساڵی دیکە دەکات!

جا نازانم کەسێك هەر لوتچێك لێکدانەوە و ئەمەگی هەبێت چۆن دەخۆی ڕادەبینێ سەری شوکرانە بژێری و بەندایەتی بۆ و پەروەردگارە بەخشندە و خاوەن بەزەیی یە دانەنوێنێ و نازانم چۆن غیرەتی دێنێ هێندە سپڵە و پێ نەزان بێت ئینکاری هەبوونیی بکات؟!![1]

## تابلۆی حەوتەم: زیندەوەری هەزار چاوە:

پێم وایە کەس نیە نەك جارێك مێشە ڕەشە جارزی نەکردبێ و ڕقی هەڵنەساند بێ بە ویزە گیزە و هەڵفڕین و دافڕینی دووبارە و سێ بارەی، بەڵام، ئایا هیچ کامێکمان ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرمان لە زانایی و توانایی خولقێنەری (مێش) کردۆتەوە و لە جیهانی پڕ وردەکاری و سەرسوڕهێنەریدا کەوتووینە مرتالا و تێ فکرین، لەو بڕوایەدا نیم هەتا ئێستا _مەگەر چۆنەکایی_ دەنا هیچمان کارێکی وامان کردبێ، بەڵام ئەمڕۆ با بەدەم بانگەوازی گوتاری خواوە بچین کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ

(١) سەیری کتێبی ناوبراو بەرگی سێیەم لاپەڕە (٣٤٨) بکە.

مِنْ شَيْءٍ﴾[٢] ، "ئەوە سەیری مولکی ئاسمانەکان و زەوییان نەکردوە و هەر شتێکی تر کە خوا خولقاندوویەتی؟ " بەڵێ با تەماشایەکی (مێش) بکەین و رووپەڕێکی تر لە کتێبی بوونەوەری خوا هەڵدەینەوە:

مێش درێژی‌یەکەی نزیکەی یەك سانتیمەترە، بەڵام دەزانی لە سەعاتێك دا دەتوانێ چەند رێگا ببڕێ؟ دەتوانێ (٨٠) کم ببڕێت وێڕای ئەوەی هەرچی لەسەر رێ و دەور و بەریەتی هەستی پێ دەکات!!

ئینجا وەك لە هەمووان روونە هەر کیلۆمەترێك (١٠٠٠) مەترە و هەر مەترێکیش (١٠٠) سانتیمەترە کەواتە: ٨٠×١٠٠٠٠٠=٨,٠٠٠٠٠٠سم (هەشت ملیۆن سانتیمەتر) دەبڕێت لە یەك سەعات دا، بە تەعبیرێکی تر مێش لە ماوەی یەك سەعات دا دەتوانێ هەشت ملیۆن بارتەقای جەستەی خۆی ببڕێت، مادام وابێ مێش خێراترە لە خێراترین رۆکێت کە تا ئێستا داهێنراوە.

زیندەوەر ناسان بە هۆی میکرۆسکۆبە بەهێزەکانەوە سەیری چاوی (مێش)یان کردوە و گەیونە ئەو ئەنجامە کە ئەو مەگەزە خاوەنی (٦٠٠) تا (١٠٠٠) چاوە، بە تەعبیرێکی تر خاوەنی (٦٠٠) تا (١٠٠٠) دوور بینی وێنە گرتنە، بەڵام چاوی ئینسان لەگەڵ ئەو هەموو وردەکاری‌یەدا تەنیا خاوەنی دوو دووربینە هەر چاوە یەکێکی تێدایە!!

مێش بەهۆی پێ‌یەکانی‌یەوە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە متوربە کردنی زۆر چەشنە گوڵ و گیاو گژدا، دیسان دەورێکی باڵاش دەگێڕێ لە گواستنەوەی میکرۆب و بڵاوکردنەوەی نەخۆشی جۆراو جۆردا.

(٢) الاعراف: ١٨٥ .

ئەم شتانەی گوتران سەبارەت بەم زیندەوەرە بێ ئەمیەتە _ لە ڕوانگەی ئینسانەوە _جێی سەرنج بوون ، ئەمما چۆنیەتی زاووزێی ئەم مەگەزە لە هەموو شتێکی سەرنج ڕاکێش ترە:

مێش هەر کەڕەتەی (١٠٠) تا (١٥٠) هێلکە دادەنێ، هەر کام لەو هێلکانەش پاش (١٠) ڕۆژ دەتروکێن و دەبنە مێش، ئینجا پاش (١٠) ڕۆژی دیکە دەست بە زاووزێ دەکەن، کەواتە هەر جووتە مێشێك لە ماوەی (٢٠) ڕۆژاندا لە دایك دەبێت و سەر لە نوێ گەراش دادەنێتەوە، جا ئێستا با دەست دەینە قەڵەم و قاقەز و حیسابێکی وردی بۆ بکەین بزانین ئەگەر جووتە مێشێك ڕێ لە زاووزێیان نەگیرێت و هەتا (٢٤٠) ڕۆژ لە ژیان دا بمێننەوە چەندەیان وەچە لێ وەپاش دەکەوێ؟:

وەك گوتمان مێش لە ماوەی (٢٠) ڕۆژدا لە دایك دەبێ و گەورە دەبێ و زاووزێ دەست پێ دەکات ، دیسان گوتمان مێینەی مێش هەر کەرەتێك لە (١٠٠)وە تا (١٥٠) هێلکە دادەنێت، کەواتە ئەگەر ئێمە لانی کەمی بگرین و بڵێین هەر کەڕەتەی هەر (١٠٠) هێلکەی بۆ حسێب بکەین دەزانی لە ماوەی (١٢) سووڕی زاووزێدا واتە لە ماوەی (٢٤٠) ڕۆژدا چەند هێلکە مێش پەیدا دەبێت و دەبێتە مێش؟! نزیکەی (٤٨٨) ترلیۆن واتە (٤٨٨,٢٨١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) . ئەوە بە مەرجێك هیچ جارێك نێر و مێی پێشوو نەهێنرێنەوە نێو حیسابان، واتە وا دابنرێ کە هەر جووتە مێشێك یەك جار زاووزێ بکەن و دوایی تەفاویت بکرێن و ئیسراحەت بکەن و . جووجکەکانیان دەست بکەن بە زاووزێ ، ئەوەش قەڵەم و قاقەز و فەرموو حیسابی بکە:



Scanned by CamScanner

٢٤٠÷٢٠=١٢ کەواتە (١٢) بیست ڕۆژی مان هەیە ، کە وەك گوتمان هەر (٢٠) ڕۆژ بریتی‌یە لە سووڕی ژیانی مێشێك بە لە دایك بوون و گەورە بوون و زاووزێ کردنی یەوە،جا ئێستا باوە دوای حیسابەکەمان بکەوین بزانین‌چی‌لێ‌دێ:

١- لە بیست ڕۆژی هەوەڵ دا جووتە مێشێك (١٠٠) هێلکە دادەنێن.

٢- لە بیست ڕۆژی دووەم دا (١٠٠) هێلکەکە دەبنە مێش و هەر جووتێکیان (١٠٠)ی تر دادەنێن کەواتە ژمارەی مێشەکان بۆ جاری دووەم بوو بە (٥٠×١٠٠=٥٠٠٠) مێش.

٣- ئینجا لە بیست ڕۆژی سێیەم دا هەر جووتە مێشە لەو (٥٠٠٠) مێشە (١٠٠)ی تر دادەنێت کەواتە دەبن بە (٢٥٠٠×١٠٠=٢٥٠,٠٠٠) مێش.

٤- لە بیست ڕۆژی چوارەم دا ژمارەی مێشەکان دەکاتە:

(١٢٥,٠٠٠×١٠٠=١٢,٥٠٠,٠٠٠).

٥- لە بیست ڕۆژی پێنجەم دا ژمارەی مێشەکان دەکاتە:

(٦,٢٥٠,٠٠٠×١٠٠=٦٢٥,٠٠٠,٠٠٠).

٦- لە بیست ڕۆژی شەشەم دا ژمارەیان دەگاتە:

(٣١٢,٥٠٠,٠٠٠×١٠٠=٣١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠) .

٧- لە بیست ڕۆژی حەوتەم دا ژمارەیان دەگاتە:

(١٥,٦٢٥,٠٠٠,٠٠٠×١٠٠=١,٥٦٢,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) .

٨- لە بیست ڕۆژی هەشتەم دا ژمارەیان دەگاتە:

(٧٨١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠×١٠٠=٧٨,١٢٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠).

٩- لە بیست ڕۆژی نۆیەم دا دەگاتە:

(٣٩,٠٦٢,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠×١٠٠=٣,٩٠٦,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) .

١٠- لە بیست ڕۆژی دەیەم دا ژمارەی مێشەکان دەگاتە:



Scanned by CamScanner

(١٠٠×١,٩٥٣,١٢٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ = ١٩٥,٣١٢,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)

١١- لە بیست ڕۆژی یازدەم دا سەرجەمی ژمارەی مێشەکان دەگاتە:

(١٠٠×٩٧,٦٥٦,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ = ٩,٧٦٥,٦٢٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠).

١٢- لە بیست ڕۆژی دوازدەم دا دەگاتە:

(٤٨٨,٢٨١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) مێش!!

جا ئێستا بۆ وەی بێ ڕەزایی ئەو ژمارەیە بزانین با ژمارەی مێشەکان دابەش کەین بەسەر ڕووبەری زەوی‌دا تا بزانین (١سم٢) چەند مێشی بەردەکەوێ:

( ٤٨٨,٢٨١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ÷ ٥,١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠سم٢=٩٥ مێش بۆ هەر (اسم٢).

بەڵام ئایا کێ ئایەڵێ مێش پتر لەبەرەی خۆی لینگان ڕاکێشێ؟! باسی سروشت ورێکەوت ومێ‌کەوتان مەکە چونکە بەزەیی وژیری وزانیاری یان نی‌یەو فەرقێ بە زەرەر و قازانجیان ناکەن؟[1]، هەڵبەتە لێرەدا چاوپۆشیمان لەوە کردوە کە ئایا ئەو سروشت و ڕێکەوتە بەو چەمك و مەبەستە کە بێ بڕوایان دە دڵی دەگرن هەن یان نا.

ئەمانە _ئەم حەوت تابلۆیە_ چەند تابلۆیەك بوون لە گۆشەیەکی چووکەڵەی مولکی خوادا کە ئەو پەڕی وردەکاری و ڕێك و پێکی یان تێدا دەردەکەوێ و بە هیچ ڕەنگێك ڕەوا نیە لەگەڵ دەنکە شخارتەدا بیرێنە نێو تەرازووەوە و پێك هەڵسەنگێنرێن.

(١) بۆ نوسرانی ئەم تابلۆیە سوود لە کتێبی (پدیدەهای اسرار آمیز)، کتێبی (من بگریچرا) بەرگی یەکەم وەرگیراوە.

ئەمە لە کاتێکدا جەستەی هەر مێشێك بە (اسم٣) دابنێن.



Scanned by CamScanner

بەڵام نەچی ئەوەشت لە بیر بچێت کە ئەمانەی گوتران وەك لوێچێك بوون لە تەغارێك و چەند شتێکی سادە بوون لە چاو هەزارەوها و ملیۆنەها تابلۆی تری دڵ بزوێنی ئەم بوونەوەرە کە بە پشتیوانی خوا لە کتێبی (گەورەترین راستی)دا کە تەرخان دەکرێ بۆ ئەو چەشنە باسانە بڕێکیان لێ باس دەکەین.

ئێستاش خوێنەری ئازیز !

ژیری و ویژدانت بکە بە دادگەر و ڕامێنە و وردەکاری و ڕێك و پێکی دەنکە شخارتەیەك _ کە ناچاری کردی دان بێنی بە بوونی وەستا و کارسازێك دا _لەگەڵ ڕێك و پێکی بوونەوەر لە بەرێك ڕاگرە و بزانە هەڵوێستت چی دەبێت!!

## بەڵگەی سێیەم

## هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بێ پێویستی بە بەدیهێنەرێك هەیە

لەو یاسا ژیری یانەی ئیسپاتی سروشتی یەتی بڕوا بوون بە هەبوونی خوادای بەخشندە دەکەن، ئەو یاسایەیە کە دەڵێت: هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بێ بوونی بەسەر نەبوونیدا زاڵ نابێت بە بێ زالکەرێك (یستحیل ترجیح أحد طرفي الامكان بدون مرجّح).

لە پێشەوە پێویستە بزانین کە زانایان خۆ لەسەر ئەوەن کە سەردەمێك بووە ئەم بوونەوەرەی ئێستا بەم شێوەیە دەی بینین سەر و شوێنی دیار نەبووە، هەڵبەتە قورئانی قسە لەجێ و پڕ پیت و بەهرەش پشت گیری ئەم ڕایە دەکا و

لە گەلێك جێیاندا ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە دەکات بۆ وێنە لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرمێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾[1] یانی: ئینجا _خوا_ ویستی ئاسمان دروست کات کە لەو دەمەیدا دووکەڵ بوو. لێرەدا مەبەست لە دووکەڵ حاڵەتی گازی ماددەیە[2].

کەواتە هیچ کەس لاموجیبی لەوەدا ناکات کە ئەم بوونەوەرە بەم شێوە و قاڵبەی ئێستای ئەزەلی نیە و پەیدا بووە دوای ئەوەی کە نەبووە، بێ گومان ئەو ڕاستی‌یەش کەس لە پیاوەتی خۆی دانی پێدا نەناوە، بەڵکو شتێکی سەلمێنراوە و زانیاری پشتگیری دەکات.

دە ئێستا با سەرنج بدەین و تێ فکرین داخوا ژیری و زانیاری‌مان هەڵوێستیان چۆنە سەبارەت بە گۆڕرانی ماددە لە حاڵەتی هەویرە ترشی و بێ سەرە و بەرەیی و پرژ و بلاوی‌یەوە بۆ ئەم حاڵەتەی ئێستای کە لە شێوەی چەندین کەشکەشانی زەبەلاح دا خۆی دەنوێنێ هەر کەشکەشانێکیش لە ملیارەها ئەستێرە و خڕۆکە پێك دێت، هەر کام لەو کەشکەشان و ئەستێرە و خڕۆکانەش بە شێوەیەکی عیلمی‌یانەی پڕ وردەکاری و بە پێی چەند یاسا و دەستوورێکی فیزیایی و کیمیایی بەڕێوە دەچن.

بەر لەوەی وەبەر تورێژینەوەی ئەم مەسەلەوە بنیشین بە پێویستی دەزانم وێنەیەك بێنینە بەر چاوان:

---

(١) فصلت: ١١

(٢) بیردۆزی (لاپلاس)یش هەمان قسە دەکات، ئەم بیردۆزەیە هەتا ئێستا ڕاست ترین بیردۆزەیە سەبارەت بە چۆنیەتی دروست بوونی بوونەوەر.

تەرازوویێکمان هەیە هەردوو تای بارتەقای یەکن و شتاقیان لەوی تر گرانتر نیە، ئایا ئەگەر بێت و ئەو تەرازووە لە هەوادا ڕابگرین ڕێی تێ دەچی بێ هیچ هۆیەك لایەکیان دابکەوێ لە ڕێکاری ئەوی تریان نزم تر بێتەوە، بێگومان ئەوە شتێکی مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە.

دە ئێستا با بادەینەوە سەر توێژینەوەی مەسەلەی دروست بوونی جیهان : سەردەمێك بووە کە ئەم کەهکەشان و ئەستێرە و مانگ و خڕۆکانە ناویان لە کولەکەی تەڕیش دا نەبووە و ماددەی بوونەوەر بە شێوەی تۆپەڵە گازێکی تێك چڕژاوو بێ سەرە و بەرەو ناڕێك و پێك بووە. کەواتە چۆن چۆنی ئەو گازە پرژ و بڵاوو بێ سەرە و بەرەو تێك چڕژاوە گۆڕرا بۆ ئەم بوونەوەرە تێر و تەواوو پڕ وردەکاری و دڵگیر و ڕازاوەیە، بە تەعبیرێکی تر چۆن چۆنی ئەو هەویرە ترش و کەرەسە خاوە ئەو کۆشکە خۆش و پڕ عەیش و نۆشەی لێ پێك هاتوە و ئارایش دراوە؟!

هەڵبەتە هەر کەسێك لوێچێك ژیری و لێك دانەوەی هەبێ و لە ئاقار ڕاستیدا چاوان لە قووچ نەنێ دەڵێت: هۆیەکی دەرەکی ئەو کارەی بەجێ هێناوە و زاتێك بەو کارە هەستاوە کە خوای خاوەن سۆز و توانا و زانیاری بێ سنووری ناوە. چونکە ژیری پێمان دەڵێت: هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بێ شتاق لەو بوون و نەبوونەی بەسەر ئەوی دیکەیان دا زاڵ نابێت بە بێ هۆیەکی زاڵکەر، ماددەی بوونەوەریش بەر لەوەی کۆشکی پڕ وردەکاری بوونەوەری لێ ئارایش بدرێ دوو حاڵەتی گونجاوو وەك یەکی دەباران دا هەبوو، واتە دەبارانیدا هەبووە هەر بە شێوەی گازی و وەك کەرەسەیەکی خاو بمێنێتەوە، وە دەبارانیشی دا هەبووە کە گۆڕانی بەسەردا بێت، هەڵبەتە چاو

پۆشی لەوە بکەین ئایا ئەو گۆڕانکاری یە دەبێتە هۆی پێك هاتنی بوونەوەرێکی ڕێك و پێك و پڕ وردەکاری یان دەبێتە هۆی گۆڕانی مادده بۆ حاڵەتێکی دیکەی بێ سەرە و بەرەتر و شل و شێواوتر لە حاڵەتە گازی یەکەی.

بەڵام ئێستا حاڵەتی گۆڕرانی مادده گازی‌یەکە بەسەر حاڵەتی نەگۆڕرانی‌دا زاڵ بووە، ئەمما نەك هەر گۆڕرانی سادە و هیچی دی بەڵکو گۆڕانێکی وا کە بۆتە هۆی ساز کردنی بوونەوەرێکی بەرێوە برا و لە ڕێی ملیۆنەها یاسا و دەستووری عیلمی‌یانەوە، کەواتە پێویستە هۆیەکی زاڵکەر هەبێت لە ئارادا هەر تەنیا بۆ تەفسیر کردنی ئەو گۆڕانکاری‌یەی مادده، ئینجا وەختێك دەشبینین ئەو گۆڕانکاری‌یە بۆتە هۆی بوونەوەرێکی پڕ یاسا و وردەکاری دەزانین کە ئەو زاتەی بۆتە هۆی هێنانە دی گۆڕانکاری لە بوونەوەردا زاتێکی زانا و بە بەزەیی و باڵا دەستە.

هەر کەسێکیش بڵێ نەخێر لە مەسەلەی هاتنی گۆڕانکاری بەسەر ماددەی بوونەوەردا دەستی پەروەردگارێك لە ئارادا نەبووە، وەك ئەو بابایەیە کە دەڵێت یەکێك لە دووتای تەرازوویەك سەربەخۆ بێ هیچ هۆیەك ئەوی دەبێت و دادەکەوێ و لە ئاستی ئەوی‌دی نزمتر دەبێت!

بەڵکو لە ڕاستی‌دا ئێستا هەر ئەو بابایەی کە دەڵێ: تەرازوو تایەکی لەوی تر نزمتر دەبێ بەبێ کار تێ‌کردنی عامیلێکی دەرەکی، حاڵی چاکترە لەوەی کە دەڵێ ماددەی بوونەوەر حاڵەتی بوون بە بوونەوەری زاڵ بووە بەسەر حاڵەتی مانەوەی لە دۆخی پێشووی‌دا بە بێ هەبوونی بەدی هێنەر و سەرپەرشتی کەرێك، چونکە لە مەسەلەی تەرازوو و دوو پێیەکانی‌دا تەنیا نزم بوونەوەی پێ تەرازوویێك لە گۆڕێ‌دایە، ئەمما لە مەسەلەی ماددە و گۆڕان و نەگۆڕانی‌دا



Scanned by CamScanner

وانیە، چونکە مەسەلەکە لێرەدا تەنیا گۆڕانێکی سادە و ڕۆتینی نیە بەڵکو هاتنە دی و خوڵقێنرانی بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە و سەرسووڕهێنەرە، کەواتە ئەگەر گوتمان ئەو بابایەی دەڵێ تەرازوو یەکێك لە دوو تاکانی بە بێ هیچ عامیلێك لە ئاستی ئەوی تریان نزمتر دەبێ ئینسانێکی نا تێ گەیشتوو بۆ کورتە ئەوە پێویستە دەرهەق بەو بابایەی کە دەڵێت: کەرەسەی خاوی بوونەوەر لە خۆوە و بە بێ سەرپەرشتی کردنوبەسەر ڕاگەینی خاوەندی مەزن و باڵا دەست ئەم بوونەوەرە سەرنج ڕاکێش ودڵگیرەی لێ پێك هاتوە بڵێین: ئەو کابرایە حاڵی زۆر خراپە و لەوەیدا نەماوە هەر بە نا تێ گەیشتوو بۆ کورت حسێب بکرێت بەڵکو پێویستە پێناسەیەکی تایبەتی بۆ دابنرێت، شکیشی تێدا نیە کە گوتاری خوادا لە هەموان چاکتر توانای پێناسە کردنی هەیە دەبا بزانین قورئانی پیرۆز قسە لەجێ ئەوان چەشنە کەسان چۆن تاریف دەکات: ﴿...لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَ يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾[1]. واتە: ( ... ئەوانە ژیری یان هەیە پێی دەشت نافکرن، وە گوێیان هەیە شتی پێ نابیەن، وە چاویان هەیە پێی نابینن، ئەوانە چەشنی ئاژەڵن بگرە گومڕاتریش، ئەوانەن گەوج و بێ ئاگا.

ئێستا وەختی ئەوە هاتوە کە قسەیەکی منداڵانەی بێ سەر و پێی زۆر کەرەتان گوتراوە ڕەد لێ دراوەی لامەزەبەکان بدەینە بەر نشتەری یەکالا کردنەوەوە: ماتریالیست و بێ دینەکان فێرن هەر کاتێك تەنگت پێ هەڵچنین و ڕێت لێ بڕینەوە وەك ئەو ڕێوی یەی کە لە پێشر سواران دا دەوەستێ و برستی لێ دەبڕێ و چیدی توانای ڕاکردنێی نامێنێ قـۆرتێکی بـۆ دەکـەن و خۆیـان

(١) اعراف : ١٧٩ .

دەرباز دەکەن، بۆ وێنە لێرەدا دوای ئەوەی هیچیان بە دەستەوە نەما ناوی لێنێن بەڵگە!! پەنا دەبەنە بەر دوو سێ زاراوەی زریق و بریق و بە دیمەن جوان و نێوەڕۆک بەتاڵ و ڕووت و ڕەجال وەك: سروشت و ڕێکەوت ، ئەمما ئایا ڕێوی بەستەزمان بە فیسق کردنێ ڕزگار دەبێ؟! نەخێر ئەوانەش قورئان گوتەنی: ﴿كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾[1] ، واتە وەك ئەو جاڵجاڵۆکەیەی وان کە ماڵێکی پێکەوە دەنێ بەڵام بێ هێزترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر بزانن!!

بەڵێ بە هێنانە نێوەوەی سروشت وڕێکەوت ومێکەوتان هیچ لەو ڕاستی یە ناگۆڕێ کە بە بەڵگەی ژیری و ژیربێژی سەلمێنراو ڕانوێنرا چونکە، ئایا هیچ کەس لە مەسەلەی تەفسیر کردنی دیاردەی داکەوتنی یەکێك لە ئاتەرازووەکان دا ڕێکەوت و سروشتی بە خەیاڵ دا دێت و تێیان ڕادەبینێ کە لەو گرفتەی ڕزگار کەن؟! دیارە نەء، ئەوە هەمووی لەسەرێکەوە و لە حاڵێك دا کە ئێمە ئیعتراف بکەین بە هەبوونی سروشت و ڕێکەوت _واتە سروشت و ڕێکەوتێك کە لامەزەب وبێ دینەکان لە دڵی دەگرن_ بەڵام ئێمە بۆمان هەیە پرسیار بکەین و هەڵوەستەیەك لە ئاقار ئەم چەشنە زاراوانەدا بکەین: شکی تێدا نیە کە چ سروشت و چ ڕێکەوت وە چ هەر هێزێکی تر کە دروست کرانی بوونەوەری وەپاڵ دەدرێ لە دوو حاڵان بەدەر نین: یان هەر خودی ماددەن، یان شتێکن غەیری ماددە، جا ئەگەر هەر بریتی بن لە خودی ماددە کەواتە ماددە هەر بۆ خۆی سەربەخۆ گۆڕانی بەسەر خۆیدا هێناوە بە بێ تەئسیری هیچ چەشنە عامیلێك!!

---

(١) عنكبوت : .



Scanned by CamScanner

ئەما وەك گوتمان دروست بوون و دروست نەبوونی بوونەوەر وەك مەسەلەی نزم بوون و نزم نەبوونی پێ تەرازووەکان وایە، جا نازانم ئایا هیچ کەس لە ئاقار دیاردەی ئەوی بوونی تا تەرازووەکەدا بە خۆی ڕەوا دەبینێ باسی سروشت و ڕێکەوت و مێکەوتان بکات یان نا؟! ئەوە لە حالێك دا کە لا مەزەب و بێ دینەکان بڵێن ئەو ڕێکەوت و سروشتە شتێکی ماددین خۆ ئەگەر بڵێن ماددی نین ئەو دەمی توند مەچەکیان دەگرین و دەڵێین: ئەدی ڕاکردنی ئێوە لەبەر ناوی (خوا) هەر لەبەر هێندێ نەبوو کە شتێکی ماددی و بەرهەست نەبوو نەدەهاتە نێو هەگبەی خەیاڵەوە و بە چرا و شەداوی پێنج هەستەکان نەدەگیرا؟! جا مادام ئێستا ئێوەش هەر بگەڕێنەوە سەر شتێکی غەیرە ماددی و نابەرهەست پێتان دەڵێین:

بێگومان ئێوە هیچ چەشنە سیفەتێك بۆ ڕێکەوت و سروشت بڕیار نادەن لە زانایی وتوانا وئیرادە وبەزەیی و... هتد بەڵام ئێمەی بڕوادار دەڵێین پەروەردگاری مەزن خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاکە وەك زانایی و توانایی و بەزەیی و ئیرادە و... هتد جا ئێستا لێتان دەپرسین: ئایا بڕوا هێنان بە خوایەکی زانا و توانا و بە بەزەیی و خاوەن ئیرادە ماقووڵ تر و وێ چووترە یان بڕوا هێنان بە ڕێکەوت یان سروشتێکی ڕەق و تەق و بێ گیان و بێ ئیرادە و نەزان و کەڕ و لاڵ؟!![1]

خوێنەری بەڕێز ئەم سێ بەڵگەیە بەسن _ بۆ هەر کەسێك چاوان لە ئاقار ڕاستییاندا لە قووچ نەنێ _ بۆ قەناعەت هێنان بەوە کە پەروەردگاری مەزن سروشتی ئینسان بە سێنایی هەست پێ دەکات و بڕوای پێ دێنێت، بەڵێ بڕوا

(١) وەك گوتمان لە کتێبی (گەورەترین ڕاستی)دا ئەم مەسەلانە بە تێر و تەسەلی دەدوێینەوە، بە تایبەتی ئەم سروشت و ڕێکەوتە ئەفسانەیی یانە.



Scanned by CamScanner

به پەروەردگار بوون شتێکی سروشتی و خوازسکە لە دڵ و دەروونی ئینسان دا، بەڵام بەعزە جارێك لە سۆنگەی چەند هۆیەکی ئابووری وسیاسی وکۆمەڵایەتی یەوە هەوری چلکنی گومان و دوو دڵی ئاوێنەی دڵی مرۆڤ تاریك دەکەن و ئایەڵن خۆری پرشنگداری خواناسی تێدا دەرکەوێ و لەبەر غەورو تارمایی ئەو چلکە هەورە ئاوێنەی دڵ حەشتەبای تێدا دەرناکەوێ و وەك چاوی بابای کوێر هیچ شتێك بەدی ناکات.

## گـەوهـەری دووەم

## ﴿ بسـم الله ﴾ کردن لە دەمی دەسـت پێکردنـی هەر کارێکـدا

٢- دووەمین گەوهەری ئەم دەریایە ئەوەیە کە:

ڕەوشتێکی ئیسلامی بەرز و جوانە کە ئینسانی موسڵمان بەر لە دەسـت کردن بەهەر ئیشێك ناوی خوا بێنێت و خودای لە یاد بێت وەك پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ﴿کل امر ذي بال لم يبدأ ببسم الله فهو ابتر﴾ واتە: هەر شتێکی گرنگ بە ناوی خوا دەستی پێ نەکرێت ناتەواوە.

هەڵبەتە ئەوەش بۆ ئەوەیە کە ئینسانی موسڵمان هەمیشە خوای لە یاد بێت و هەست بە چاودێری و بەسەر ڕاگەیشتنی بکـات، شـکی تێـدا نیـە باباپەکیش هەمیشە خوای لە بیر بێ و ناوی وی لەسەر زاری بێ و وا بزانێ کە لە هەموو هەستان ودانیشتنێکیدا پەروەردگار ئاگای لـێیە و چاودێری دەکات، ناتوانێ لاملی و سەرپێچی لە بەرنامە و ڕێ و شوێنەکەی بکـات، هەڵبەتە ئێمە لە دەمی توێژینەوەی وشەکانی ئەم ئایەتە بە پیـت و پیـزەدا دەرمان خست کە مەبەست لە (بسم الله) کردن چیە.



Scanned by CamScanner

# گەوهـەری سـێیەم

## سـیفەتە بەرزەكانی خـودا سبحانە و تعالـی

٣- سێیەمین گەوهەری دەریای بێ سنووری ئەم ئایەتە ئەوەیەكە:

خوای مەزن و باڵا دەست خێوی هەموو سیفەتێكی بەرز و جوانـە وەك : دەسەڵات و زانیاری و بـەزەیی و میهرەبـانی و ئـیرادە و دیـتن و بیـستن و ئاخاوتن و ...هتد ، ئەمما لێرەدا تەنیا سیفەتی بەزەیی و بەخشندەیی بـاس كراوە چونكە شوێنەكە شوێنی ئاخاوتن و دوانە لەگەڵ پـەروەردگاردا و داوا كردنی فەزڵ و بەخششیەتی، لەبەر ئەوە پێویستە خوا بە سیفەتێك ستایش بكرێ كە لەگەڵ ئەو پایە و مەقامـەدا بلـوێ وەك گـوتراوە: ( لكـل مقـام مقال) بۆ هەر كات وجێیەك وتووێژێكی تایبەتی هەیە.

لێرەدا سەبارەت بەسیفەتەكانی خودای باڵا دەست چەندین باسی فەلسەفی و قووڵ هەن كە زانا و پێتۆڵانی موسڵمان و غەیرە موسڵمان چەندین كتێبی زل زلیان دەربارە نووسیون، ئەمما لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەم نووسراوە بۆ وان چەشنە باسانە تەرخان نەكراوە بە كورتی شتێكی دەربارە دەدوێین و كورد گوتەنی: كاڵە رووشێنی دەكەین:-

ئاشكرایە كە زاتی خوا شتێكی بەرهەست نیە و بە چرا و شـەداوی پێـنج هەستەكان نـاگیرێ بـەڵام خـودی هـەر شـتێك لـە سـیفەت و ئاكارەكـانیدا دەردەكەوێ، ئەمما سیفەت و ئاكاریش دیسان شتێكی مەعنەوی و نابەرهەستن ، كەواتە لە چ رێیەكەوە دەتوانین دەركی سیفەتەكانی خوا بكەین و لە رێگـەی سیفەتەكانیشەوە دەركی زاتی بكەین؟!

بۆ روون كردنەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە وێنەیەك دێنینەوە: ئایا ئەگەر



Scanned by CamScanner

پانەوێ (ئیفلاتوون)ی پیتۆڵ و دانا بناسین ناچار نابێ بکەوینە گەڕان و سووڕان بە دوای ئەو شوێنەوارانەدا کە لـێی بەجێ ماون؟ دیـارە بـا، چـونکە ئێستا (ئیفلاتوون) لەبەر دەستان نیە تا تێیەوە ڕامێنین و بی نرخێنین، مـادام وابـێ چارمان ناچارە بە شوێن ئەو ئاسەوارانەدا بگەڕێین کە لـە دوای خـۆی بـەجێی هێشتوون بۆ نموونە: کتێبی (کۆماری ئیفلاتوون) چونکە سیفەت و ئاکاری هەر بابایەك لەسەر ڕوو پەڕی شوێنەوارەکانی تۆمار کراون.

سەبارەت بە ناسـینی پەروەردگـاریش هـەر بـە هـەمان شـێوە، زاتـی پەروەردگار پێنج هەستەکانی مە لە بارانیان دا نیە دەرکی بکەن بەڵام دەتوانن شوێنەواری خودا هەست پێ بکەن کەدوو کتێبی بینراووگۆیای ئەون واتە کتێبی بوونەوەر و کتێبی قورئان، ئینجا ژیریش لەم دوو کتێبەدا سیفەتەکانی خـودا دەبینێ لە زانیاری و بەزەیی دا حیکمەت و دەسەڵات و بەخشندەیی و... هتـد داواییش لە ڕێی سیفەتەکانەوە دەگات بە پەی بردن بە زاتی خودا چونکە هیچ سیفەتێك هەبوونی ماقووڵ نیە بە بێ زاتێك، بەڵێ بە تەعبیری فەیلەسووفەکان سیفەتەکان (عرض) و (عرض)یش بە بێ (جوهر) هەبوونی مەحاڵە. ئێستا بـۆ وەی پتر مەبەست ناوەڵا بێ دوو وێنان دێنینەوە:

یەکەم: ئێمە وەختێك سەرنجی زەوی دەدەین و دەبینین بە دەوری خۆی و ڕۆژدا دەخولێتـەوە و لـە ئـەنجامی ئـەو خولانـەوەش دا شـەوو ڕۆژ و چـوار فەسڵەکانی ساڵ دێنە دی، وە دەبینین کـە زەوی وەك تـاوڵی کرێـستان چیان بە چەند گـرلمیخێکی گـەورە و مەحکـەم بەسـتراوەتەوە و قـایم کراوە[1]، وە بە هـێزی هێزی کێشندە (جاذبیـة) وە هـەوا و ئـاو و باقی گیاندار و شتەکانی دیکە لەسەر پشـتی بەنـد دەبـن و ناکەونـە

[1] مەبەست لە شاخەکانە.

خوار و... هتد ئەمانە و چەندین دیاردەی تری سەرنج ڕاکێشەر لە زەویدا دەبینین کە بە جۆرێکی عیلمییانەی زۆر وردەکاری بەڕێوە دەچن، ئێمە یەکسەر بۆ سێو دوو بڕیار دەدەین کە لە دروست بوون و ڕەخسانی زەویدا زانیاری زانایەك و بەزەیی و سۆزی خاوەن بەزەیی یەك و گەورەیی و باڵا دەستی زاتێك و بەکورتی بەسەر ڕاگەیێنی پەروەردگارێك بەدی دەکەین و دەزانین کە دنیا شاری بێ ساحێب نیە و لەو دیوی پەردەوە شتێك هەیە.

دووەم: کاتێك لە قورئانێ دەفکرین و سەرنج دەگرین دەبینین ئەو قورئانە هەزارەها ڕاستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و زانیاری و مێژوویی و مەعنەوی خستۆتە ڕوو کە نەك هەر بە پێوەر و تەرازووی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان شتێکی سەرسوڕهێنەر و نائاسایی بوون بەڵکو بە پێوەر و تەرازووی سەدەی بیستەم و دوای بیستەمیش"!!

ئێستا تەنیا بۆ نموونە چەند ڕاستی یەکی زانیاری دەخەینە بەر نیگا کە قورئانی بە پیت و پێز بەر لە چواردە سەدە گوتوونی:

١- بوونەوەر پێش دروست بوونی تۆپەڵە گازێك بووە پێکەوە جۆش دراوە ﴿أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا...﴾[1].

٢- بوونەوەر بە هۆی هێزی کێشندەوە ڕاوەستاوە ﴿رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾[2].

٣- زەوی شتی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الأَرْضَ كِفَاتًا(٢٥)أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا (٢٦)﴾[3].

---

(١) الأنبياء:٣٠ .

(٢) الرعد : ٢ .

(٣) المرسلات ٢٥-٢٦ .



Scanned by CamScanner

٤- زەوی لەسەر شێوەی هێلکەیە ﴿وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾[١] .

٥- لە چینەکانی ژوورووی هەوادا (ئۆکسجین) کەم دەبێتەوە ﴿ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾[٢] .

٦- زەوی هەموو کاتێك نیوەی ڕۆژە و نیوەی شەوە ﴿أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾[٣] .

ئەمانە دوو نموونە بوون لە دوو کتێبی پەروەردگار، کتێبی (بوونەوەر) وە کتێبی (قورئان) شکیشی تێدا نیە کە لە هەر کام لەم دوو کتێبانەدا سیفەتەکانی خوا بەدی دەکرێن و هەر کەسێکیش بە چاوی دڵ تێ فکرێ و لە خۆی نەگۆرێ دەزانێت کە چ کتێبی بوونەوەر و چ کتێبی قورئان بێجگە لە خوای مەزن و باڵا دەست پەرێزی کەسی دیکەیان پێوە دیار نیە.

هەر بۆیەشە دەبینین پەروەردگار فەرمانمان پێ دەکات کە لە هەر کام لەم دوو کتێبە وردبینەوە و دیقەت بگرین، دیسان پەروەردگار هەروەك چۆن ڕستە و دێرەکانی قورئان ناو دەنێ (آیة) واتە نیشانە، دیاردەکانی بوونەوەریش وەك : مانگ و ئەستێرە و باران و شاخ و ڕووەك و گیاندار و .... هتدیش ناو دەنێ (آیة) چونکە هەر کام لەم ئایەتانە ـ چ ئی کتێبی بوونەوەر بێ چ ئی کتێبی قورئان ـ نیشانەن لەسەر زاتی خوا و ئینسان ڕێ نمایی دەکەن بۆ ناسینی خوا، چونکە وەك گوتمان هەر کام لەم دوو کتێبە شوێنی تێدا دەرکەوتنی سیفەتەکانی خوای پەروەردگارە سبحانە و تعالی .

ئەوە کورتەیەك بوو لە تەفسیر و ڕاڤە کردنی ئایەتی یەکەمی سووڕەتی فاتیحە، ئێستاش نۆرەی ئایەتی دووەمە.

---

(١) النازعات : ٣٠ .

(٢) الأنعام : ١٢٥.

(٣) یونس : ٢٤ .



Scanned by CamScanner

# تەفسیری ئایەتی دووەم

## ﴿ الحمدلله رب العالمین ﴾

سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان

بەر لەوەی مەبەست و چەمکی ئەم ئایەتە پیرۆزە بخەینە ڕوو پێویستە بە واتای یەك یەکی وشەکانیدا بێینە خوار:

الحمدلله: ئەلف و لامی سەر وشەی (حمد) بۆ جینسە، واتە هەموو تاکێك لە تاکەکانی (حمد) بۆ خوادا. لامی سەر وشەی (الله)ش لامی (الملك)ی پێ دەبێژرێ واتە خاوەنایەتی، کە واتە مانای (الحمد لله) ئاوای لێ دێ: هەرچی سوپاس و شوکرانە هەیە ئی خوایە.

رب: وشە (رب) لە زمانی عارەبیدا چەند مانایەك هەڵدەگرێ[1]:

١- گەورە و قسە ڕۆیشتوو (السید المطاع).

٢- بابایەك کە هەستێ بە چاك کردن و ئیسلاحی شتێك (المصلح).

٣- سەر پەرشتی کەر و خاوەن (المالك).

العالمین: وشەی (العالمین) کۆی (عالم)ە و (عالم)یش کۆمەڵە شتێکن کە لە یەك جۆر بن وەك: عالەمی ئینسان، عالەمی پەری (جن)، عالەمی فریشتە، عالەمی ئاژەڵ، عالەمی ڕووەك...هتد.

کەواتە وشەی (عالمین) لێرەدا بوونەوەر و هەرچی تێیدایە دەگرێتەوە[1].

ئەمجار بێینە سەر چەمك و مەبەستی گشتی ئەم ئایەتە پیرۆزە:-

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەریایەکی بێ سنووری پڕ لە نوورە بەروزمێنی کەم و کورتم تەنیا پێنج گەوهەری گرانبای لێ وەگیر کەوت:-

(١) تەفسیری (جامع البیان) طبری بەرگی یەکەم لاپەڕە (٤٧، ٤٨).

(١) هەمان تەفسیر و بەرگ ل٤٨.



Scanned by CamScanner

# گەوهەری یەکەم

# پەروەردگاریتی خوا

پێشتر زانیمان کە وشەی (رب) لە زمانی عارەبیدا بە چەند واتایەک بەکارهێنراوە، ئەمما ئێستا گەرەکمانە بزانین پەروەردگاریتی (ربوبیة)ی خوادا لە روانگەی قورئانەوە یانی چی؟!

ئەوەندەی ئەمن بۆم وەدەرکەوتوە (ربوبیة)ی خوا لە قورئان دا[1] بە دوو مانا بەکارهێنراوە:

یەکەم: بە مانا حاکم و فەرمانڕەوا و بەرنامە ڕێژ.

دووەم: بە مانا بەدی هێنەر و پەروەردەکەر .

ئێستاش چەند نمونەیەک دێنینەوە لە قورئانی قسە لەجێ بۆ خستنە رووی ئەم ڕاستی یە:

سەبارەت بە ماناى یەکەمی وشەی (رب) قورئان دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَ رُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا...﴾[2]. واتە: (نەصرانیەکان) زانا و پیاوە ئاینی یەکانی خۆیان کردوە بە فەرمانڕەوای خۆیان لەباتی خوا، دیسان (عیسی)ی کوڕی (مریم)یش، لەگەڵ ئەوەش دا فەرمانیان پێ نەکراوە کە جگە لە خوا کەس بپەرستن.

---

(٢) التوبة : ٣١ .

ئەم ئایەتە پیرۆزە لێی دەفامرێتەوە کە هەر کەسێك غەیری خوای کرد بە حاکم و فەرمانڕەوا و بەرنامە ڕێژی خۆی مانای وایە پەرستوویەتی و بە خوای خۆی حسێب کردوە.

لە جێیەکی دیدا فەرمووییەتی: ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾[1] .واتە (فیرعەون) گوتی: ئەمن پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، خۆ شکی تێدا نیە کە فیرعەون لافی ئەوەی لێ نەداوە کە ئەو میللەتەی خولقاندوە، کەواتە لێرەدا مەبەستی ئەوە بووە کە هەر ئەمن بۆم هەیە یاساو دەستورتان بۆ دانێم و بۆم گەردن کەچ بن.

سەبارەت بە مانای دووەمی وشەی (رب)یش قورئان فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾[2] . واتە: (موسی) فەرمووی: پەروەردگارمان ئەوەیە کە هەموو شتێکی خولقاندوە و ئینجا ڕێ و شوێنی بۆ داناوە.

کەواتە پوختەی قسان ئەوەیە: خوا ئەو زاتەیە هەموو شتێکی خولقاندوە وێڕای ئەوەش بەرنامە و ڕێ و ڕەسمی ژیان و بەڕێوە چوو نیشی بۆ داناوە، مادام وایە کەسێك بە تەواوی بڕوای بە خوا هەیە و بە بەندەی وی حسێب دەکرێ و بە موسڵمان دادەنرێ کە بڕوای بە حاکمایەتی و فەرمانڕەوایەتی خوا هەبێت، هەروەك چۆن بڕوای بە خالیقیەتی هەیە، بە پشتیوانی خوادا لە دەمی تۆژینەوەی ئایەتی پێنجەم دا چاکتر ئەم باسە ئاوەڵا دەکەینەوە.

---

[1] النازعات : ٢٤ .

[2] طـه : ٥٠ .



Scanned by CamScanner

# گەوهەری دووەم

## سوپاس و ستایش بەتەنێ لایقی خوایە

لە ڕاستی دا واقیعی بوونەوەر و ژیانی ئینسانیش هەر ئەوەی تێدا بەدی دەکرێ چونکە هەر کەسێك کە سوپاسی دەکرێ یان لەبەر هەردووك یان یەکێك لەم دوو هۆیانەیە:

یەکەم: ئەو کەسە خاوەنی سیفەت و ڕەشت و ئاکاری بەرز بێ و دەوروبەرەکەی لێ ی بەهرەمەند بێت هەرچەند ئەو بەهرەمەند بوونەش ئێمە نەگرێتەوە.

دووەم: کە لەو کەسەوە سوود و قازانج مان پێ بگات، هەڵبەتە خوای مەزنیش هەر کام لەم دوو خەسڵەتەی تێدان، هەم خاوەنی سیفەتی بەرز و ئاکاری چاکە و هەم ئێمە و گشت بوونەوەریش لە نیعمەت و بەهرەکانی سوود مەند دەبن.

ئێستاش باسەرنجێکی خێرا بدەینە برێك لە نیعمەتەکانی خوا لە ژیانمان‌دا:

١- ئایا ئەو ژیری یەی کە مرۆڤی پێ بۆتە سەر تۆپی کائینات و هەڵبژاردەی بوونەوەر و هیچ ئینسانێك تنۆکە ئارەقێکی لە پێناوی وەدەست هێنانی دا نەرشتوە نیعمەتێکی زێدە گرانبایی نیە؟!

٢- ئایا ئەو پێنج هەستانەی کە لە ڕێی ئەوانەوە توانای بەستنی پەیوەندیمان هەیە لەگەڵ جیهانی دەرەوە و دیاردە سروشتی یەکان دا و وەك پێنج دەلاقە ژیری لێ‌یانەوە سەیری جیهانی ماددە دەکات نیعمەتێك نین فرە بە قیمەت؟!



Scanned by CamScanner

٣- ئایا هەبوونی جومگەکان لە لەش دا و هەبوونی ماددەیەکی لینج لە نێو ئەو جومگانەدا کە ڕۆڵێکی زێدە گرنگ دەگێڕن لە نووشتانەوە و جووڵان و سووڕانی ئەندامەکانی لەش دا و تەنانەت ئەگەر _خوانە خواستە_ لە جەستەی ئینساندا جومگەکان نەبوونایە یان هەبوونایە بەڵام ماددەیەکی لینج یان لە نێودا نەبوایە ئینسان نەك هەرنەی دەتوانی سەر وپشت و شان و پیل ولاق ودەست وپێی بجووڵێنێ بەڵکو نەی دەتوانی هەر تاقە قامکێکیشی بزێوێ، نیعمەتێکی شایانی سوپاس نین؟!

٤- ئایا تاڵی ئـاوی نێـو گـوێ کـە بـەرگری لـە چـوونە ژوورەوەی دەعبـا و زیندەوەران دەکا و، سوێری ئاوی چاو کە هەڵدەستێ بە شتن و پاك کردنەوەی چاو لە ڕێی فرمێسك ڕشتن و ڕیپۆق کردنەوە و هەموو ئەو شتانەی لە برۆ و بژوێلك _برژانگ_ و پێڵووەکان قوتار دەبن و دەچنە نێو چـاو وەدەرێـیان دەنێ و، شیرینی ئاوی زار کە یاریدەی گەدە و ڕێخۆڵەکان دەدات لە هەرس کردنی بەشێکی خواردەمەنی دا و وێڕای ئەوەش هاوکارییەکی برایانەی زارو زمانان دەکات لە جوین و ڕۆهێشتنی پارووداً، نیعمەت نین؟!!

٥- ئایا تیژی و تاڵی و تفتی لینجاوەکانی جگەر و پەنکریاس و لووەکانی نێو گەدە، کە دەورێکی بنەڕەتی دەبینن لە هەرس کردن و تەفر و توونا کردنـی خواردەمەنی دا نیعمەت نین؟!

٦- ئایا ڕیز بوونی دانەکان بەم شێوەی کە دەی بینین و بڕەرەکان (القواطع) لە لای پێشەوەی زارن و کەڵپەکان (الانیاب) لە نێوەڕاست دا و خڕێنەکان لە کۆتاییدا، چونکە یەکەمین کار کە لەگەڵ پارووداً پێویستە ئەنجام بدرێ بڕینییەتی و ئەوەش بە بڕەرەکان نەبێ نایەتە دی و دووەم ئیش لەت لەت



Scanned by CamScanner

کردنی ئەو روەیە و ئەوەش ئەرکی شیاوی کەڵبەکانە و سێیەمین ئیشیش هاڕینی یەتی هاڕینیش ئەرکی پڕ بە پێستی خڕێنەکانە و لە کەسی دی ناوەشێتەوە: بەڵێ ئایا ڕیز بوونی دانەکانی هەموو ئینسانەکان ئاوا نیعمەت نیە؟!

٧- ئایا نەبوونی توانای بیستنی کەمتر لە (٢٠) لەرینەوە (ذبذبة) لە گوێی ئینسان دا، کە ئەگەر _خوانە خواستە_ هەی بایە ئینسان ژیانی لێ تاڵ دەبوو لەبەر گرە و هارە و تەقە و ڕەقەی ئیش کردنی ئامێر و کارگەکانی لەش وەك: دڵ و گەدە و سی‌یەکان و... هتد نیعمەتێکی مەزن نیە؟!

٨- ئایا دروست بوونی گەدە (المعدة) بەو شێوەی ئێستای، کە بریتی‌یە لە قابلەمە (مەنجەڵ)ێکی مەحکەم و هەڵدەستێ بە کوڵاندن و هەرس کردنی ئەو خۆراکەی دەچێتە نێوی جێی سەرنج نیە! وە ئایا پتر شیاوی سەرسوڕمان نیە کە زانیمان ئەو مەنجەڵە لە گۆشت دروست کراوە: بەلام لەگەڵ ئەوەش دا توانای کوڵاندنی هەموو جۆرە گۆشتێکی هەیە بێجگە لە خۆی؟!

ئەمانە و هەزارەها نیعمەتی تر هەر لە نەفسی خۆمان دا هەن کە هەر کامێکیان ئینسانی پێ منەتبار و قەزدارە لە ئاقار پەروەردگاردا و بابایەك هەست بە بەندایەتی وشوکرانە بژێری نەکات دەرحەق بە خوا هەتا بڵێی سپڵە و بێ ئەمەك و پێ نەزانە.

ئێستاش با برێك لە نیعمەت و بەهرەکانی خوا لە دەوروبەری خۆمان دا بکەینە جێی سەرنج و تێوەڕامان دوای ئەوەی برێك لە نیعمەتەکانی خودای گەورەمان لە نەفسی خۆمان دا کردە جێی سەرنج و دیقەت گرتن:-

١- دابەش کردنی پێداویستی یەکانی ژیان بە ئەندازە و بە گوێرەی پێویست:



Scanned by CamScanner

ئەگەر چاوێکی ژیرانە بە دەورو بەرمان دا بگێڕین دەبینین ئاز و نیعمەتەکانی ژیان هەتا زەرووری تر بن پتر بن و هەتا کەمتر جێی نیاز بن کەمترن، هەوا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هیچ کەسێك پتر لە سێ چوار دەقیقە بە بێ ی ناژیەت لە هەموو کون و کەلێنێکی سەر زەوی دا چنگ دەکەوێ تیشکی ڕۆژیش هەر بەو پێ و دانە، بەلام ئاو چونکە ئینسان دەتوانێ چەند ڕۆژێك بە بێ ی مەدارکات بە ئەندازەی هەوا نیە و لە هەموو جێیان دا چنگ ناکەوێ. گڵ (تربة)یش چونکە ژیانی ئینسانی پێوە بەندە دەبینین دەستی بەزەیی و سۆزی پەروەردگار بە هەموو لایەکی دنیایەدا بلاوی کردۆتەوە، ئێستا با تێ فکرین، باشە ئەگەر لەباتی گڵ _کە شتێکی بێ بایەخ و کەم قیمەت دێتە بەرچاوان _گرانباترین کانزا_ کە زێڕە _ لە دنیادا هەبایە چ دەقەوما! شکی تێدا نیە، ئینسان و زیندەوەران قڕەواریان تێ دەکەوت و دوا براوو بێ پاشەوار دەبوو!! چونکە زێڕ هەرچەندە گرانباشە ناتوانێ دەنکە گەنمێك دەنێوە خۆی دا وەشێرێ و ڕێگەی ڕوان و چەقەرە کردنی بدات.

٢- گەورە بوونی قەبارەی ئاوو کەم بوونەوەی کێشی لە دەمی بەستنی دا:- ئاو بە پێچەوانەی هەموو ماددە شلەکانی ترەوە لە دەمی بەستن و گۆڕرانی دا بۆ حالەتی وشکی (الجمود) قەبارەکەی زیاد دەکا و کێشی کەم دەبێتەوە وەك بۆ زانایان دەرکەوتوە ئاو لە وەختی بەستنی دا قەبارەکەی ١/٩ زیادە دەکات[1]، بەلام ئێستا با بزانین بۆچی پەروەردگار ئاوی ئاوا خولقاندوە ئایا ئەو حالەتە ڕیزپەڕیەی ئاو تەئسیرێکی هەیە سەبارەت بە ژیان؟!

(1) بهوانه كتيبى : بن بگو چرا ؟



Scanned by CamScanner

دەڵێین بەڵێ، دە گوێ شل کەو دڵت بێدار تا لەم نهێنییە بیی ئاگادار، شکی تێدا نیە کە زیندەوەرانی نێو ئاوێ هەر لە کۆنەوە و ئێستاش بەشی سەرەکی و بنەڕەتی خواردن و خوراکی ئادەمی یانی دابین کردوە، بەڵام ئایا ئەو زیندەوەرانەی لە دەمی بەستنی ئەو ئاوانەدا کە تێ یدا دەژین ڕوو لە کوێ دەکەن و هانا وەبەر کێ دەبەن؟! بێ گومان ڕوو لە ڕەحمەتی خوا دەکەن و هاناش هەر وەبەر وی دەبەن، بەڵێ پەروەردگار ئاوی وا خوڵقاندوە کە لە وەختێك دا دەی بەستێ و دەبێتە بەستەڵەك و سەهۆڵ قەبارەکەی زل بێ و کێشـی سووك بێ بۆ خاتری وەی ئەو سەهۆڵ و بەستەڵەکە نەچێتە باری بنەوە و بەڵکو سەرا و بێ و دەم بۆ دەمێ لە ئاستی ڕووی ئاوێ بڵندتر بێتەوە و پتر لە بەرەی خۆی لینگـان ڕانەکێشێ و جێ و ڕێ بە زیندەوەرانی نێو ئاوێ تەنگ نەکا و ئیسراحەتیان لێ تێك نەدات.

٣- درەوشانەوەی سۆز و بەزەیی خوا لە ئاگر پژێن (براکین)ەکان دا:

بەر لەوەی سوودی ئاگر پژێنەکان بخەینە ڕوو با بزانین چۆن دروست دەبن:-

هەتا بە ناخی زەوی دا بڕۆینە خوارێ پلەی گەرمی ژوورڕاتر دەچێت تەنانەت ئەگەر (٢٠) میل بە زەویدا بچینە خوارێ پلەی گەرمی بە ڕاددەیەك پێهەڵا دەچێ کە بەشی تواندنەوەی بەردان دەکات[١].

جا وەختێك ئەو کانزا و بەرد و مەردەی لەنێو چەقی زەوی دا هەمن توانەوە قەبارەیان زۆر دەبێ هەوڵی پێهەڵا چوون و ڕۆیشتنە دەرێ دەدات، ئینجا لە نێوان ئەو درز و کەلێن و کونانەدا کە لە پێستی زەویدا هەمن خۆی قوتار دەکات، بەڵام هەڵبەتە مەرج نیە ئەو تەوژم و فشارە ئەگەر

[١] سەرچاوەی پێشوو بەرگی (٢) لاپەڕە (٩٦_٩٧).



Scanned by CamScanner

درز و کەلێنی دەست نەکەوێ توانای چوونە دەری نەبێ، بەڵکو هەر کاتێك تەوژم و فشاری نێو زەوی پتر بێت و بەهێزتر بێت لە توێڵی زەوی توێکڵەکە دەشکێنێ وخۆی قوتار دەکا.

ئێستا ڕەنگە دەرکی ئەوەت کردبێ کە بۆچی ئاگر پژێنەکان نەك هەر خراپ نین بگرە فرە گرنگ و پێویستیشن بۆ دانیشتوانی سەر ڕووی عەرزێ، ئاگر پژێنەکان وەك هەناسە دانێك وان بۆ تەوژم و فشار و تین و تاوی نێو عەرزێ و پەروەردگار لەو ڕێیەوە لانکۆڵەکەمان لە تەقینەوەیەکی گەورە و ماڵ کاول کەر و حەتمی دەپارێزێ، چونکە کورد گوتەنی: ئەگەر جام پڕ بوو دەسەرییەوە دەڕژێ. ئەویش ئەگەر جار و بار هەناسەیەکی بۆ نەدایا وەك بابای ڕقە ستوور و دڵ پڕ لە قین و غەزەب دەتەقییەوە و هەلا هەلا دەبوو!!

٤- گرنگی تۆز و خۆڵ و غوبار لە ژیانی ئێمەدا:

زۆر جاران لە ئاقار ژمارەیەك لە دیاردە سروشتییەکاندا دەستەوستان ڕادەوەستین و هیچ سەرە دەری لێ ناکەین و لەوانەیە ئەگەر ئینسان موسڵمانێکی ژیر و تێگەیشتوو نەبێت بەشتێکی خراپی لێك داتەوە و مۆری (هیچ و پووچی) پێوە بنێ[١]، یەکێك لەو دیاردانە تۆز و غوباری نێو هەوایە، دەبا بزانین تۆز و غوبار چ ڕۆڵێك دەگێڕێ و سوودی چییە:

---

[١] چونکە موسڵمانی ژیر و تێگەیشتوو ئاسۆی بەی بەرین و فراوانە و ئەگەر بەعزە جارێك حیکمەتی برێك لە دیاردە سروشتییەکانیشی بۆ دەرنەکەوت نالێت هیچ حیکمەتیان تێدا نیە و بێ سوودن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو دەزانێ خوای گەورە کاربەجێ یە و هیچ کام لە دروست کراوەکانی پووچ و بێ سوود نین.

سوودێکی گەورەی تۆز و غوبار ئەوەیە: کە گەردیلەکانی تۆز و غوبار هەڵدەستن بە عەکس کردنەوەی تیشکی ڕۆژ کە ڕێ بە دیتنی ڕووناکی ڕۆژ دەدات هەتا سەعاتێك تا دوو سەعات دوای ئاوا بوونی ڕۆژ، وە بۆ هەموان ڕوونە کە تاوێکی زۆر پێش هەڵهاتنی ڕۆژ و پاش ئاوا بوونی ئاسۆی زەوی دیمەنێکی زێدە قەشەنگ و دلگیر بە خۆوە دەگرێ و ئینسان لە تێ فکرینی تێر نابێت، هەڵبەتە ئەگەر _ خوا نەکردە _ ئەو تۆز و غوبارە لە نێو هەوادا نەبایە لەم دیمەنە جوان و دلگیرەی ئێوارە و بەیانیان بێ بەش دەبووین.

سوودێکی دیکەی تۆز و غوبار پەیوەندی بە باران بارینەوە هەیە، هەڵمی ئاوی نێو هەوا ئەگەر تۆز و غوباری نێو هەوا نەبایە نەی دەتوانی وا بە سێنایی پێکەوە بنووسێ و خڕ بێتەوە و دڵۆپە ئاوان پێك بێنێ، چونکە هەر دڵۆپە بارانێك کە پێك دێ بریتییە لە چەند گەردێکی هەڵمی ئاو کە لە دەوری گەردێکی غوباری تاین کۆ دەبێتەوە واتە ئەگەر _ خوا نەکردە _ ئەو تۆز و غوبارە نەبایە هەڵمی ئاوی نێو هەوا نێو جەرگە و چەقێکی وەچەنگ نەدەکەوت کە لە دەوری کۆ بێتەوە و لە ئاکامی ئەوەش دا دڵۆپە باران دروست نەدەبوون.

کەواتە تۆز و غوباریش بە پێچەوانەی بیر کردنەوەی گەلێك کەسەوە یەکێکی دیکەیە لە سەربازە نەناسراوە خزمەت گوزارەکانی خوا و نیعمەتێکی شایانی سوپاسە[1].

٥- گرنگی شیر و چۆنیەتی پێك هاتنی:

(١) ئەم باسەم بە دەسکارییەوە لە کتێبی (من بگو چرا) وەرگرت بەرگی (٢) ل ٢٦٣_٢٦٤.

شیر یەکێکە لە خۆراکە تەواوەکان و هەموو ئەو ماددانەی تێدان کە جەستەی ئینسان حەوجێیانە، یەکێکی دیکەیە لە بەهرە بایەخ دارەکانی پەروەردگار، دە ئێستا با بزانین شیر چی تێدایە و لە چی پێك دێت:

أ- ئەو پرۆتینەی کە بۆ دروست کردن و نوێ کردنەوەی خانەکانی لەش پێوستە لە شیردا چنگ دەکەوێ.

ب- سەر توێی شیر بەشێکی سەرەکی شیرە و ئەندازەیەکی زۆری چەوری تێدایە.

ج- لە شیردا (شەکر)یش هەیە، ئەو شەکرەی لە شیردا هەیە شەکری (لاکتۆز)ی پێ دەگوترێ کە یەکێکە لە (کاربۆهیدرات)ەکان و لە هەموو جۆرە شەکر و شیرینی یەکانی تر سێنایی تر لەش دەتوانێ وەری گرێ و لە کەلێنێکی باوێ.

د- شیر ژمارەیەکیش لە ماددە کانزایی یەکان بە لەش دەبەخشێ کە لە دروست کردنی ئێسقان و خوێن دا بەکار دەهێنرێن، کالیسیۆم و فۆسفۆر بەشێکی سەرەکی ماددە کانزایییەکانی شیرن.

هـ - ماددە کانزاییەکانی تریش لە شیردا هەن وەك: ئاسن، مس، مەنگەنیز پۆتاسیۆم، کلۆز، کۆبالت، مەنزیم و ...هتد.

و - لە شیردا ئەم ڤیتامینانە هەن: ڤیتامین : A,B١,B٢,D,C

ز - وێڕای هەموو ئەو شتانەی گوتران لە شیردا ئاوو چەند خۆراکێکی نیشکیش هەن[1].

ئایا خڕ کرانەوەی هەموو ئەو ماددانە _کە لەش پێویستی پێێن_ لە شیردا یەکی دی نیە لە نیعمەتە لە ئەژمار نەهاتوەکانی پەروەردگار؟!!

---

(١) (نشانە هائی از او) دفتر یکم لاپەرە (٢٣٩) اپر: سید رضا حیدر.

خوێنەری ئازیز :

ئەمانەی گوتران لوێچێك بوون لە تەغارێك سەبارەت بە ناز و نیعمەتە نەژمێراوو بێ پایانەکانی خوا، بەڵام قەت وا نەزانی ئینسان _هیچ ئینسانێك_ توانای ژماردنی نیعمەتەکانی خوای هەبێت، نا نا قەت شتی وات بە بیردا نەیەت ئەوی پەروەردگار ئەی فەرموە: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾[٢] واتە: ئەگەر نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان حسێب ناکرێ.

ئەما کورد لە مێژە گوتوویەتی: کەسێك کەسە حەرفێکی بەسە.

## گەوهەری سێیەم

## بەرزی پلەی پەروەردەکەران لە تەرازووی ئیسلامدا

لەم ئایەتە بە پیت و پیرۆزە دەفامرێتەوە کە ئامۆژگاری کەران و پەروەردەکەران ئەرکێکی زێدە گران داوێتە سەر شانی ئەوانەی پەروەردەیان دەکەن، چونکە پەروەردگاری بێ هاوتا پاش ئەوەی فەرمووی ﴿الحمد لله﴾ سوپاس و ستایش گشتی مولکی خوایە، فەرمووی ﴿رب العالمين﴾ پەروەردگاری بوونەوەر، هەر وەك بیەوێ بە ﴿رب العالمين﴾ وەڵامی پرسیارێك بداتەوە کە لەسەر رستەی ﴿الحمد لله﴾ هەڵدەستێ ، چونکە دوای ئەوەی گوترا ﴿الحمد لله﴾

(٢) النحل : ١٨



Scanned by CamScanner

یەكێك بۆی هەیە پرسیار بكات بۆچی سوپاس هەمووی هی خوایە؟ بۆیە دوای ئەو ڕستەیە یەكسەر فەرموویەتی ﴿رب العالمين﴾ واتە بۆیە شایستەی هەموو سوپاسێكە چونكە بەدی هێنەر و پەروەردگاری بوونەوەرە، كەواتە خوای بەخشندە سیفەتی پەروەردگاریێت (ربوبية)ی لەنێو هەموو سیفەتەكانی تردا هەڵبژاردوە بۆ خاتری وەی بیكاتە بەڵگەی ئەوە كە تەنیا خوا شیاوی سوپاسو ستایشە، مادام وا بێ سیفەتی پەروەردگاریتی گەورەترین سیفەتی خوایە و هەر بەندەیەكیش سیفەتی پەروەردەكردنی تێدا بێتە دی جێی ئەوەیە كە سوپاسی بكرێ و ڕێزی لێ بگیرێ هەر بۆیەشە كە دەبینین پێغەمبەران بەسەر تۆیی مرۆڤایەتی دادەنرێن و هەموو مرۆڤایەتی قەرزدار و منەت باریانە.

دیسان هۆی بەرز كردنەوەی پلە و پایەی زانایان و دایك و بابانیش پێویستە هەر بە هەمان تەرازوو هەڵسەنگێنرێ ، زانایان چونكە هەڵدەستن بە پەروەردە كردنی گەل و دایك و بابیش هەڵدەستن بە بەخێو كردنی كۆرپەكانیان ئیسلام لەسەر ئینسانی فەرز كردوە كە ڕێزیان لێ بگرێ و ئیمتیازیان بداتێ بەسەر باقی خەڵكی دیكەدا.

كەواتە ئەوانەی هەڵدەستن بە پەروەردە كردن و ئامۆژگاری خەڵك لە مەكتەبی ئیسلام دا بە چاكترین خەڵكی خوا سەیر كراون و قورئانی بە پیت و پێزیش لەم بارەو فەرموویەتی : ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾[1] ، واتە: گوفتاری كێ چاكترە لە ئی ئەو

[1] فصلت : ٣٣ .

کەسەی بانگەوازیی دەکات بۆ لای خوا و رەفتاری چاك بە جێ دێنێ و دەشڵێ من لە موسڵمانانم؟!

خۆشەویستیش ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله و ملائكته و اهل السماوات واهل الارض حتى النملة في جحرها وحتى الحوت في البحر ليصلّون على معلّم الناس الخير))[٢]. یانی : خوا و فریشتەکانی و خەڵکی ئاسمانەکان و خەڵکی عەرزێ هەتا مێرووە لە قوولە مێرووەکەی دا و نەهەنگ لە دەریایەدا دووعا دەکەن بۆ ئەوەی چاکە فێری مەردوم دەکات. دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((على خلفائي رحمة الله ، قيل ومَن خلفائك؟ قال الذين يحيون سنتي و يعلمّونها عباد الله)) واتە: رەحمەتی خوا لەسەر جێ نشینەکانم، گوترا: جێ نشینەکانت کێن؟ گوتی : ئەوانەن کە رێ و شوێنی من دەژێننەوە و لە بەندەکانی خوای دەگەیەنن.

## شێوازی پەروەردە و خەڵك بانگ کردن بۆ ئیسلام

ئێستاش وای بە چاك دەزانم چەند خاڵێك بنووسین سەبارەت بە پەروەردە کردن و شێوازی خەڵك بانگ کردن بۆ ئیسلام:

یەکەم: بەری هەموو شتێك پێویستە ئەو کەسەی بەم کارە مەزنە هەڵدەستێ دەربارەی بیر و باوەڕەکەی شارەزا و پسپۆڕ بێ بۆ خاتری وەی سەر لە خۆشی و لە خەڵکیش تێك نەدات، بەڵێ کورد لەمێژە لە کاتێك دا کارێك بە بابایەکی ناشایستە دەسپێرێ گوتوویەتی : فیتۆی بە براڵەی

---

(٢) ترمذی لە (أبي امامة)وە ریوایەتی کردوە.

بێ لێو دەسپێرن. هەڵبەتە کەسێك لێوی نەبێ ناتوانێ فیتوێ لێ بدات، هەر ئاواش کەسێك دەربارەی بە ئیسلامەتی شارەزا نەبێت دروست نیە خۆی بکات بە چاوساغی خەڵکی، بەڵێ بابای کوێر بۆ خۆی بە ڕێیە نازانێ چ جای ڕێ بە خەڵکی نیشان بدات، بەعزە لاوێکی تازە پێگەیشتوو هەن پێیان وایە تەنیا حەماسەت و خوێن گەرمی بەسە بۆ خزمەتی کردن بە ئیسلام، ئەمما شکی تێدا نیە کە خراپ حاڵی بوون چونکە ئیسلام وەك بەرنامە و ڕێچکە دەسکردەکان نیە کە پڕوپاگەندە و ورووژاندنی خەڵکی بەس بێت بۆ وەدواکەوتنی، وە ئەوانەش کە خۆیان بە خاوەنی دەزانن هیچ پێیان نەنگ و کەسری نەبێت کە سەد شاخ و باڵ و کلکی زیادە و دەسکرد بۆ بەرنامەکەیان بکەن و هەر دەمەش بە کاڵا و بەرگێك بیپۆشن و ناوێکی نوێی بۆ داتاشن کە لەگەڵ ئارەزووی خەڵکیدا بگونجێت و سەرنجیان ڕابکێشێ، وە دەربەستیش نەبن کە هەر چەشنە شێوازێکی دزێوو ناقۆڵا بەکار بێنن بۆ وەی بەرۆچکەکەیان بەرقەرار بێت.

ئیسلام ڕێباز و بەرنامەی خوایە و چەند بنچینەیەکی ژیری و زانستیانەی نەگۆڕاوی هەیە چونکە پەیوەستێ بە چەند یاسا و بنەمایەکی نەگۆڕاوەوە لە سروشتی بوونەوەر و ئینسان دا. موسڵمانی تێکۆشەر بۆی ناکرێت و ڕێی نادرێ شێوازی خراپ بەکار بێنێ بۆ گەیشتن بە ئامانجی، واتە (میکیافیلیەتی) لە ئیسلام دا نیە، بەڵێ ئینسانی موسڵمان وەك شوێن کەوتووی ڕێچکە پووچە دەسکردەکان بۆی نیە درۆ و دەلەسە بۆ خەڵکی هەڵڕێژێ و چاو بەستەکێیان لێ بکات بەڵکو پێویستە



Scanned by CamScanner

پێغەمبەرانە بڵێت: ﴿أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي...﴾[1] واتە: بانگەوازی دەکەم بۆ ڕێی خوا لەبەر ڕۆشنایی‌دا ئەمن و ئەوانەی شوێنم کەوتوون.

پوختەی قسان ئەوەیە کە موسڵمان کوێرانە وەڕێ ناکەوێ و تفەنگێ بەتاریکایی‌یەوە نانێ بەڵکو هەوڵ دەدات بەر لە هەموو شتێك بە بنج و بنەوانی بیر و باوەڕەکەی‌دا بچێتە خوار و لێی حاڵی بێت و بزانێ ئیسلامەتی چیە و چۆنە و چۆن خەڵکی بۆ بانگ دەکات.

دووەم: پێویستە ڕەفتار و ئاکاری بە پێی ئەو ڕێبازە بێت کە خەڵکی بۆ بانگ دەکا وە نابێ بە هۆی کردەوە و ڕەفتاری دژ و نە گونجاوی لەگەڵ بەرنامەکەی‌دا مەردوم لە خۆی دڕدۆنگ و دڵ کرمێ بکات، چونکە ئەوانەی کردارەکانیان شایەتی ڕاستی قسەکانیان نین هەر قسەیەکی دەیکەن دەعوایەکی بێ ئەساسە و وەك پارەی قەڵب بەسەریاندا دەدرێتەوە کورد گوتەنی: ماڵی قەڵب سەر وە ساحەبیەتی. قورئانی قسە لە جێ و بە پێت و پیرۆزیش فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ(٢) كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[1]، واتە: ئەی برواداران چما بەوەی دەیڵێن ڕەفتار ناکەن، گەورەترین تاوان لەلای خوا ئەوەیە: شتێك بڵێی بەزار بەڵام ڕەفتاری پێ نەکەی. دیسان گوتراوە: (عمل رجل في الف رجل ابلغ من قول الف رجل في رجل) یانی: کردەوەی پیاوێك لە هەزار پیاودا بەکارترە لە قسەی هەزار پیاو لە پیاوێك دا.

---

(١) یوسف : ١٠٨ .

(١) صف : ٢،٣ .



Scanned by CamScanner

سێیەم: دەبێ دڵسۆز بێ و تاقە هیوا و ئاواتی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا و گەیشتن بە بەهەشت و ڕزگار بوون لە جەهەندەم بێت.

بەڵێ بەڕێزان (دڵسۆزی) و بەس خوا مەبەست بوون (اخلاص) سەرەکی ترین مەرجی سەرکەوتنی ئینسانی بانگەواز کەرە لە کارەکەی‌دا چونکە ئینسان هەتا بەدڵسۆزی بۆ خوای گەورە کار نەکات خۆشی ناوێ و نای کاتە دۆستی خۆی، کەسێکیش خوا خۆشی نەویست هەر بە تەنێ دەبێ لە کارەکەی‌دا و خوای لەگەڵ نابێت، کەسێکیش خوای لەگەڵ دا نەبوو دڵی بەندەکانی لە ئاقاردا دادەخرێ و ناتوانێ تەئسیریان تێ بکات پێغەمبەری پێشەوا فەرموویەتی: ((اذا احب الله العبد نادي جبريل: ان الله تعالى يحب فلانا فاحبّه، فيحبّه جبريل فينادي في اهل السماء: ان الله يحب فلاناً فاحبوه فيحبه اهل السماء ثم يوضع له القبول في الارض))[٢].

یانی: کاتێك خوای گەورە بەندەی خۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکات خوای بەرز فڵان کەسی خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ، ئینجا جوبرائیل خۆشی دەوێت دوایی جوبرائیل بانگی خەڵکی ئاسمانێ دەکات: خوا فڵان کەسی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئینجا خەڵکی ئاسمانێ خۆشیان دەوێ. دوایی خۆشەویستیشی دەخرێتە نێو دڵی خەڵکی سەر عەرزێ.

ئەوە لەسەرێکەوە لە سەرێکی دیشەوە لەئاکامی خۆشەویستی خواو خوا لەگەڵ بوون دا بابای موسڵمان قسە و گوتاری تاوو تین و تەئسیرێکی زۆری دەبێ و چەشنە موگناتیسیەتێکی تایبەتی تێدا دەخولقێ کە

---

[٢] (بخاری) و (مسلم) ڕیوایەتیان کردوە.

دەبێتە هۆی کەمەند کێش کردنی دڵان و کلیلی کردنەوەی دەرگای گاڵە دراویان، دەتوانم بڵێم قسەیەك کە لە دەروونی بابایەکی خوا دۆست و دڵ پڕ لە خۆشەویستی یەوە دەردەچێت لەگەڵ قسەیەك دا کەلام سەللایی دەکرێ و خاوەنەکەی خۆشەویستی خوا نیە و دڵی ڕوون نەبۆتەوە بە خۆشەویستی درێژی خوا و پێغەمبەر ﷺ زۆر لێك دوورن و کاریگەریشیان زۆر جیاوازە !!

خوای باڵا دەست و بە بەزەیی سەر و دڵی مەلا و مەل لە خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرەکەی و دۆستانی مان پێ ببەخشێ، ئامین.

چوارەم: پێویستە پلە پلەیی یەتی ڕەچاو بکات لە ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوادا:

بۆ وێنە:- دەبێ هەتا لە چەسپاندنی عەقیدە نەبێتەوە نەچێتە سەر لایەنی دەستوور و یاسایان، چونکە بابایەك بڕوای بە خوای نەبێت هیچ سوودی نیە خۆت ماندووکەی لە باس کردنی ئەو یاسا و دەستوورانەی ئەو خوایە دای ناون کە ئەو بڕوای پێ نیە! چونکە کەسێك دان نەنێ بە بوونی خوادا چەوجار دان نایەنێ بە بەرنامە و ڕێبازەکەیدا، زۆر جارانیشم دیتوە کە موسڵمان خۆی تووشی وتووێژی دوور و درێژ کردوە سەبارەت بە لایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریەکانی ئیسلام لەگەڵ کابرایەکی بێ دین و بێ باوەڕدا ئەمما لە ئاکام دا دەم لە پووش بووە و لە ماندوو بوونێ پتر چیدی پێ نەبڕاوە.

بەڵێ کەسێك دەیەوێ یەکێك بانگ کات بۆ دینی خوا با بەر لە هەر شتێك ئەمامی عەقیدە و بڕوای لە زەوی دڵ دا بنێژێ، با پێش ئەوەی داوای نوێژ و ڕۆژوو باقی ئەرکە ئیسلامی یەکانی تری لێ بکات

خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر و خۆشی بەهەشت و تووشی دۆزەخ و سزا و جەزرەبەی سەختی تاوان و سەرپێچی و پاداشتی بەرزی چاکە و فەرمانبەری و... هتدی لە دڵیدا بچەسپێنێ، جا ئەو دەمی مولتەزیم بوونی بە فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری لێ دەبێتە شتێکی سروشتی و لاملی و سەرپێچی کردنیشی لەکن دەبێتە شتێکی دزێو و ناقۆلا، واتە دوای ئەوەی درەختی بڕوا لە زەمینی دڵیدا ڕوا بەری ئیلتیزام و فەرمانبەری دەگرێ وبێ ئەوەی داوای لێ بکرێ سەربەخۆ هەڵدەستێ بە بەڕێوەبەبردنی ئەرکی بەندایەتی خۆی و وەك پێشتر گوتم بە بارێکی گران و شتێکی نائاسایی سەیری ناکاو زۆری لە قاڵبی خۆش دێ.

ئیسلام درەختێکە لە دوو بەشان پێك دێ: یەکەمیان ڕەگ و ڕیشە و دووەمیان قەد ولق و پۆپ و گەڵا، جا هەروەك چۆن درەخت چ قەد و لق و پۆپ و گەڵای دیار نین هەتا ڕەگ و ڕیشەکانی بە عەرزێ دا نەچنە خوار و تام و خوێ و چێژێك لە زەوی دەسگیر نەکەن کە دواتر بەشی دووەمی دەرختەکە پێك دێنن. هەر بە هەمان دەستوور ناگونجێ چاوەڕوانی ڕەفتار و کرداری ئیسلامییانە بی لە بابایەك کە ڕەگ و ڕیشەی بڕوا و عەقیدە لە دڵ و دەروونیدا خۆیان دا نەکوتاوە چونکە وەك گوترا ڕەگ و ڕیشەن کە بژێوو خۆراك حەواڵە دەکەن بۆ لق و پۆپی دەرختی ئیسلام، لێرەدا لووت و بزووت گەیشتینە ئەنجامێکی دیکەی سروشتی ئەویش ئەوەیە کە هەروەك چۆن مەحاڵە نە ڕەگ و ڕیشە بە بێ لق و پۆپ و نە لق و پۆپ بە بێ ڕیشە و ڕەگ وجوودیان ببێ هەر بەو تەرزەش نە بەوبڕوا بە بێ کردار و نە کردار و ڕەفتار بێ بەو بڕوا نایەنە دی، (لە ئایەتەکانی تردا چاکتر ئەم مەسەلەیە دەتوێژینەوە).



Scanned by CamScanner

پێنجەم: پێویستە کادیری ئیسلامی سەرەڕای شارەزایی و ڕۆشنبیری دەربارەی ئیسلام دەربارەی ڕێچکە و کوێرە ڕێکانیش _ واتە گشت ئیدۆلۆژی یەکان غەیری ئیسلام _ پسپۆر و شارەزا بێت و بە بنج و بنەوانیان دا بچێتە خوار و بزانێ چۆن پووچەڵی و قرپۆکی یان دەخاتە بەرچاوی مەردوم و دەیان داتە بەر لێزمەی ڕەخنەی ژیرانە و عیلمیانە و بێ نموودیان دەکات، ئاگاداری لە ڕێچکە دەسکردەکان بۆ ئینسانێك گەرەکیەتی خەڵك بە ئیسلام ئاشنا کات فرە پێویستە، چونکە موسڵمانی تێکۆشەر و شۆرش گێر دەبێ پێغەمبەرانە بە دەستێکی سەرگەرمی دروست کردنی قەڵای ئیسلام بێ و بە دەستێکی تریش کۆتە قەڵای ڕزیوی ڕێچکە دەسکردەکان بداتە بەرپاچی ژیری و زانیاری و لە بەرێکی هەڵقەنێ و داری بەسەر بەردی یەوە نەیەڵێ و کورد گوتەنی: کارێکی پێ بکات با بە دەواری شڕی نەکردبێ.

شەشەم: پێویستە موسڵمانی شۆڕشگێر لە هەموو یان _ لانی کەم _ بەشی زۆری لقە زانستی یەکان سەرە دەری یەك بکات و شتێکان لێ هەلکرێنێ بە گوێرەی توانا و بۆ لوان، بە تایبەتی: مێژوو، زانیاری یە سروشتی یەکان (فیزیا وکیمیا و زیندەوەرزانی وجیۆلۆجیا و جۆگرافیا) وئەو زانیاری یانەی دەربارەی ئینسان دەدوێن وەك سیکۆلۆجیا (دەروون ناسی) فسیۆلۆجیا (کارئەندامی) و توێ کاری (تشریح) و سوسیۆلوجیا (کۆمەڵ ناسی)، وە گەردوون گەری، خۆ ئەگەر بشتوانێ تەقە تەقێك لەگەڵ فەلسەفە و ژیری بێژیش دا بکات ئەوە کارەکەی زۆر ڕێك و پێك دەبێت.

سەرە دەری کادیری ئیسلامی لەم زانیاری‌یانەدا بۆیە پێویستە چونکە ئیسلامەتی بەرنامەیەکی گشتی سەرتاپای ژیانە بە هەموو لایەنەکانی‌یەوە، کەواتە مرۆڤ هەتا ئاسۆی بیر و زەینی پتری بە بەرەوە هەبێت چاکتر توانای ڕاگەیاندنی ئیسلامی دەبێ و باشتر دەتوانێ لەگەڵ زۆربەی کۆمەڵ دا ـیان هەمووی_ بدوێ و قەناعەتیان پێ بێنێ و چ عوزر و بەهانانیان بە چەنگەوە نەیەڵێ.

حەوتەم: کادیری ئیسلامی پێویستە بزانێ ئیسلامەتی جیاوازی‌یەکی سەرەکی لەگەڵ ڕێچکە دەسکردەکان دا هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام بەرنامە و ڕێنموونی خودایە بۆ بەندەکان و شیفا و دەرمانە بۆ دەردە دەروونی و کۆمەڵایەتی یەکانیان، کەواتە بابای کادیر دەبێ خۆی وەک دکتۆرێک حسێب بکات کە دەیەوێ چارەسەری نەخۆشەکان بکات، هەڵبەتە بنەڕەتی‌ترین خەسڵەتی دکتۆریش ئەوەیە کە نەرم و نیان بێ و دڵ و دەروونی کە لە ڕێژی‌یە بکات لە عاتیفە و سۆز و پەرۆش لە ئاقار نەخۆشەکانی‌دا، کەواتە کادیری ئیسلامی پێویستە زۆر دڵ نەرم و هێدی و لەسەرخۆ و بە پەرۆش بێ و، هەست بە بەزەیی و دڵسووتان بکات دەرهەق بە خەڵکی، دەقی ئیسلامیش لەم بارەوە یەکجار زۆرن بۆ وێنە: کاتێک خوای گەورە (موسی) و (هارون)ی برای نارده کن فیرعەون پێی فەرموون: ﴿فَقُولاَ لَهُ قَوْلاً لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾[1] یانی: قسێکی نەرم و هێدی پێ بێژن بەشکم خوای وەبیر بێتەوە، یان بترسێ، جا ئەگەر پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەک (موسی) فەرمانی پێ کرابێ کە لەگەڵ

(۱) طه : ٤٤ .

گەورەترین تاغووت و دیکتاتۆری مێژوودا _ کە فیرعەونە _ بە هێواشی و نەرم و نیانی قسە بکات ئێمەی موسڵمان حەوجار لەسەرمان فەرزە ئەو ڕچەیە ڕەچاو بکەین.

دیسان خوای باڵا دەست ڕوو بە پێغەمبەرمان دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ...﴾[1] واتە: بەهۆی سۆز و بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی، ئەگەر ڕەوشت دزێو و تووڕە و تۆسن و دڵ ڕەق بای لە دەورەت دەتەکینەوە و لێت دەپرینگانەوە. فەرمایشتی خۆشەویستیش لەم بارەوە یەکجار زۆرن بۆ وێنە فەرموویەتی: ((أن الله رفيق يحب الرفق و يعطي على الرفق ما لا يعطي على العنف وما لا يعطي على سواه))[2]. واتە: خـــوا نـەرم و هێدی یە و نەرم و نیانی خۆش دەوێ، وە ئەوەی لە ئەنجامی هێدی و هێواشی‌دا دەی بەخشێ نە لە ئەنجامی توند و تیژی دا و نە لە ئەنجامی هیچ شتێکی تـردا نـای بەخشێت، دیسان پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی : ((يَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا و بَشِّرُوا ولا تُنَفِّرُوا))[3] یانی: شتی وەسێنایی بهێنن و گرانی مەکەن و دڵ خۆشکەر بن و ڕەوێنەرەوە مەبن.

هەروەها فەرموویەتی: ((من يُحرَمُ الرِّفْقَ يُحرَمِ الخير كله))[4] واتـە: هەر کەسێك لە نەرم و نیانی سادە و ڕەوانی بێ بەش بوو بێت لە هەموو خێرێك بێ بەش بووە، دیسان فەرموویەتی: ((ألا أخبركم بِمَنْ يَحْرُمُ على

---

(1) آل عمران : ١٥٩ .

(2) (مسلم) لە (عائشة) وە ڕیوایەتی کردوە.

(3) (بخاري و مسلم) لە (انس)ەوە ڕیوایەتیان کردوە.

(4) (مسلم) لە (جرير بن عبدالله)ەوە ڕیوایەتی کردوە.



Scanned by CamScanner

النار أو بمن تَحْرُمُ عليه النار، تحرم على كل قريب هَيِّنٍ لين سهل))[1]

یانی: ئەری پێتان بڵێم کێ لە ئاگر حەرامە، یان ئاوری لێ حەرامە، ئاور ی دۆزەخ_ حەرامە لەسەر هەموو _ ئینسانێکی موسڵمان_ نیزیک_ لە مەردوم_ و ئاسان و هێدی و سادە.

وەك پێشتر گوتمان کادیری ئیسلامی پێویستە هەتا بۆی دەکرێ هێدی و لەسەرخۆ و زار شیرین و ڕووخۆش و سینگ فراوان بێت، هەڵبەتە وەدەست هێنانی ئەم خەسڵەتانەش زاڵ بوونی بابای تێکۆشەری گەرەکە بەسەر نەفس و شەیتان دا و زاڵ بوونیش بەسەر نەفس و شەیتان دا یەکەمین قۆناغ و گەورەترین جۆری تێکۆشان (جهاد)ە.

هەشتەم: پێویستە لەگەڵ هەر کەسێك دا بە شێوازێك بدوێ کە لەگەڵ بارو دۆخ و ئاستی ڕۆشنبیری و جۆری بیرکردنەوەی دا بلوێ، دەنا ڕەنگە زۆر جاران زەرەری پتر بێت لە قازانج و کورد گوتەنی: بنەتۆوەکەی ناکاتەوە، ئاخر ئەتۆ بچی لایەنە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئیسلام بۆ بابایەکی تازە پێ گەیشتوو _وەك خوێندکاری سەرەتایی و هەڵکشیو تریش[2] باس بکەی وەك ئەوە وایە کە قاورمە و پڵاوو گۆشتێ بدەی بە منداڵە شیرە خۆرەی ساوا، هەڵبەتە شتاقیان _ نە خوێندکارەکە و نە منداڵەکەش_ ئەو خۆراکەیان بۆ هەرس ناکرێ و لانی کەمیش تووشی زگ چوونێکیان دەکات. دیسان بە پێچەوانەوەش ماقووڵ نیە لەگەڵ ئینسانێکی تێ گەیشتوو و زیرەك دا بە شێوەیەك بدوێی کە دەست

---

[1] (الترمذي) گێڕاویەتەوە.

[2] لێرەدا حاڵەتی گشتی ڕەچاو کراوە، دەنا ڕەنگە هەبێ لە پلەی ئێوەندیدا بێ و ئاستی بیری بەقەدەر خوێندکارێکی زانکۆ یان ئامادەیی فراوان بێت.



Scanned by CamScanner

دەدات بۆ بابایەکی سادە و نەخوێندەوار چونکە منداڵی چووکەڵە و مەمك مژ بەشیری مەداردەکات، ئەما بابایەکی گەورە و تەواوو بەسەر و سمێڵ نـا.

پەروەردگاری باڵا دەست و کاربەجێش لەو بارەوە فەرموویەتی ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ...﴾[1] یانی: بانگەوازی بکە بۆ ڕێی پەروەردگارت بە کارامەیی و ئامۆژگاری باش و موناقەشەیان لەگەڵ دا بکە بە چاکترین شێواز.

نۆیەم: پێویستە موسڵمانی خەبات گێڕ خێوی پوخت ترین ئاکاروڕەفتارو خووخدە بێت _ کە بریتی‌یە لەو ئاکار و خوو خدەیەی ئیسلام فەرمانی پێ کردوە ولە شەخسیەتی پێغەمبەر و برادەرانی‌دا بە کردەوە ڕانوێنراوە، وە دەبێ دوورە پەرێزی بکات لە هەر شتێك کە کەسایەتی پێی عەیب دار دەبێ، بەڵێ موسڵمانی تێکۆشەر پێویستە تەرجەمەی کردەوەیی و واقیعی ئیسلام بێ و نموونەی دادپەروەری و دڵ نەرمی و ڕاست گۆیی و بێ فیزی و زار شیرینی و فیداکاری و ڕووخۆشی و شۆرش گێڕی و خۆبەخت کردن بێ، بەڵێ پێویستە مەردوم ئیسلامەتی لە ڕەفتار و ئاکار و هەڵس و کەوت و ڕەوشتی کادیری ئیسلامی دا ببینن بەر لەوەی لە زاری ببیستن.

دەیەم: زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی لە خواپەرستی و ئیسلامەتی دوورە پەرێزن و پشت پەل بوون لە ئاکامی بێ بڕوایی‌یانەوە نیە کە ئەو هەڵوێستەیان گرتۆتە بەر بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی لە سۆنگەی حاڵی

---

(١) النحل : ١٢٥ .

نەبوونیانەوەیە، لەبەر ئەوە جارێ وا دەبێ كردنەوەی ئەو گرێ كوێرەیەی لەسەر دڵی بابای دوێنراو بۆتە گرفت دەبێ بكرێتە دەستەچیلە و سەرەتای قسان، كە واتە ئێمە كە لە خاڵی چوارەم دا گوتمان پێویستە بەر لە هەر شتێك دەست بە چەسپاندنی بڕوا و عەقیدە بكرێ نابێ ئەوەی لێ وەفامرێ كە پێویستە هەموو دەمێ هەر وابێ، نەء چونكە لەوانەیە بابای دوێنراو هەتا گرێ كوێرەی دڵی نەكەیەوە ئامادە نەبێ هەر قسانیشت لەگەڵدا بكا هەتا وەسەلماندنێ ڕادەگا، ئەوە لە لایەكەوە لە لایەكی تریشەوە پێشینان گووتوویانە: سەرت نایەشێ سێتای بۆ لێ دائێنی ؟! مادام بابای دوێنراو بیرو بڕوای ساغ و سەلیم بێت چ پێویست دەكات بەبەلاش خۆتی پێوە ماندوو بكەی !

ئەو گرێ كوێرانەش كە لەسەر دڵێ میللەتی مە بوونە گرفت گرنگ ترینیان ئەمانەن: مەسەلەی نەتەوایەتی، مەسەلەی چینایەتی، مەسەلەی لوانی ئیسلام لەگەڵ زانیاری و پێش كەوتن و پیشەسازیدا ، مەسەلەی هۆی دواكەوتوویێتی موسڵمانان، مەسەلەی مافی ئافرەت ، مەسەلەی پەیوەندی نێوان دین و سیاسەت، مەسەلەی هەبوونی ژمارە گەلێك ئەفسانەی و پڕووپووچ لە نێو موسڵمانان دا و هەڵوێستی ئیسلام لە ئاقار ئەو دیاردەیەدا، مەسەلەی گونجانی ئیسلام لەگەڵ گشت كات و جێیەك دا، مەسەلەی پێكەوە حەوانەوەی دین و دنیا[1].

---

(١) لە چەند نوسراوێك دا كە جارێ هیچیان بەخت و ئیقباڵیان نەی گەیاندووەتە چاپخانان _ ئەم مەسەلانەمان ترۆپچۆتەوە بە تایبەتی زیاتر : (دەیە بەرپێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان) كە كۆمەڵە زنجیرەیەكە كە تا ئێستا چوار پێنج ئەڵقەی لێ پاك نووس كراوە.

تێبینی : دواتر ئاڵقەكانی (١،٢،٣،٤) چاپكران .

ئەمانە چەند قوچکەیەك بوون کە دەبنە هۆی ڕێنمایی کردنی موسڵمانی شۆڕشگێڕ بۆ چۆنیەتی بانگەوازی کردن، هەڵبەتە ئەم باسە زۆری بە بەرەوەیە و کورد گوتەنی: ئەم هەویرە ئاوی زۆر پێ دەوێ، بەڵام لێرە هەر ئەوەندە دەرفەت بوو .

## گەوهەری چوارەم

## هەتا زانیارتر بین خواناس تر دەبین

لەم ئایەتە بە پیت و پێزە دەفامرێتەوە، کە هەتا ئینسان پتر زانیاری هەبێت دەربارەی بوونەوەر چاکتر توانای ناسینی پەروەردگاری هەیە، چونکە لێرەدا وشەی (رب) پەروەردگار پاڵ دراوەتە لای وشەی (العالمین) کائینات، کەواتە ئینسان هەتا زیاتر بە (العالمین) کائینات ئاشنا بێت چاکتر (رب) پەروەردگار دەناسێت، بەڵێ وەك لەمەوبەر گوتمان بوونەوەر شانۆی تێدا درەوشانەوە (تجلّی)ی زاتی خواوەندە، هەروەك چۆن کتێبەکانی ئیمام غەزالی شوێنی تێدا وەدەرکەوتنی شەخسیەتی وین و ئینسان هەتا پتر موتالای کتێبەکانی بکا و لێیان سەر ڕاست تر و پێیان ئاشنا بێت چاکتر ئیمام غەزالی دەناسێ هەتا پتریش لە کتێبی خوادا _کائینات_ ورد بێتەوە باشتر توانای ناسینی خوای دەبێت. هەر بۆیەشە خوای مەزن دنەی ئینسانەکان دەدات کە لە نیشانەکانی بوونەوەر (الآيات الكونية) ورد بنەوە و تێ فکرن بۆ وێنە دەفەرموێ : ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ



Scanned by CamScanner

الْحَقُّ...﴾[1] یانی: نیشانەکانمانیان پێشان دەدەین لە ئاسۆیەکان و لە نەفسی خۆیان دا تاکو بۆیان دەرکەوێ کە خوا هەقە.

وە دەفەرموێ: ﴿وَفِي الأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ(٢٠)وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلاَ تُبْصِرُونَ﴾[2] یانی: لە زەوی‌دا نیشانە گەلێك هەن بۆ بڕواداران وە لە نەفسی خۆشتان دا بۆچی تێ نافکرن؟!

وە دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنْظُرِ الإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ....﴾[3] .

واتا: با ئینسان سەیری خواردنەکەی بکات.

وە دەفەرموێ : (فَلْيَنظُرِ الإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾[4] .

واتە: با ئینسان دیقەت بگرێ لە چ خولقێنراوە !

وە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾[1] .

یانی: ئەوە تەماشای عاسمانیان نەکردوە لە سەروویانەوە چۆنمان بینا کردوە و ڕازاندوومانەتەوە و چ کەم و کەسری نین؟! هەڵبەتە ئەم باسە گەلێك گەلێکی بە بەرەوەیە و مەیدانێکی یەکجار بەرینە بۆ ڕەمبازێنی قەڵەم، بەڵام ئێمە لە کورتی دەی بڕینەوە و بە دوو ئایەتی پڕ لە دەلالەت و واتا کۆتایی پێ دێنین.

(١) فصلت : ٥٣ .

(٢) ذاريات :٢١،٢٠ .

(٣) عبس : ٢٤ .

(٤) طارق : ٥ .

(١) ق : ٦ .



Scanned by CamScanner

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ(٢٧)وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾[٢] .

واته: ( ئایا نابینی کە خوا لە عاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارێ، میوەجاتی ڕەنگ جوێ جوێمان پێ وەدەر ناوە _لە زەوی_ وە، لە شاخەکان دا خەت و خاڵی سپی و سوور و ڕەنگ جوێ جوێ و ڕەشێکی تۆخ، وە ئینسانەکانو ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات دیسان ڕەنگیان جوێ جوێیە، بە ڕاستی بە تەنێ بەندە زاناکان لە خوادا دەترسێن، خوا زۆر بە دەسەڵات و لێ خۆش بوویە) لێرەدا دەبینین لوتکەی هەرە بڵندی خواناسی _کە ترسانە لە خوا_ تایبەت کراوە بە وان کەسانەوە کە زانیاری شك دەبەن، بەڵام چ جۆرە زانیاری یەك؟ وەك لێرەدا دەردەکەوێ مەبەست لە زانیاری لێرەدا زانستە سروشتی یەکانە ، واتە ئەو زانیاری یەی کە ئینسان کائیناتی خوای پێ دەناسێ، چونکە لێرەدا چەند دیاردەیەکی سروشتی ڕانوێنراون وەك : باران بارین و ڕووانی شیناورد و جیاوازی ڕەنگی میوەجات و جیاوازی ڕەنگی مەردوم و ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات، هەڵبەتە هیچ کام لەم دیاردانەش توانای توێژرانەوەیان نیە بە بێ شارەزایی دەربارەی زانیاری بە سروشتی یەکان (العلوم الطبيعية).

جا خوای باڵا دەست و میهرەبان چاوی دڵمان بکاتەوە لە ئاقار نیشانەکانی داو وامان لێ بکات کە لە هەموو دیاردەیەکی سروشتی دا گەورەیی وی بەدی بکەین.

---

(٢) فاطر : ٢٧،٢٨ .



Scanned by CamScanner

# گەوهەری پێنجەم

## پەیوەندی نێوان خواو ئینسان لە ڕوانگەی بەرنامەی خواوە

پێنجەمین گەوهەر کە لە دەریای دەوڵەمەندی ئەم ئایەتە دەسگیر دەبێت، ئەوەیە: کە ڕێبازی ئیسلام دەیەوێ پەیوەندی نێوان خوا و بەندە پەیوەندی‌یەکی وابێت کە کار بکاتە سەر ژیانی ئینسان، بە واتایەکی دی ئیسلام بەو چەشنە ئیمان و بڕوایە ڕازی نابێت کە دەچێتە کەللەی ئینسانەوە و لە نێوان چوارچێوەی تەسکی فەلسەفی و ژێریدا کورت هەڵدێ و هیچ تەئسیرێك لە ژیانی ئینسان ناکات، چۆنیەتی فامرانەوەی ئەم یاسایەش لەم ئایەتە پیرۆزە بەم جۆرەیە: وەك گوتمان وشەی (رب) دوو مانایان هەڵدەگرێ :

یەکەم: پەروەردە کەر .

دووەم: بەرنامە دانان .

بێگومان بەرنامە دانانیش هەر بەشێکە لە پەروەردە کردن، ئینسان پەروەردە کردنیش پێویستی بەوە هەیە کە خوای باڵا دەست و بە بەزەیی بەردەوام ئاگاداری بێ و چاوی سۆز و بەزەیی و میهرەبانی تێبەوە بێ، کەواتە وەختێك ئینسان ئەم وشەیەی بە بیردا دێ هەست بەوە دەکات کە هەموو کاتێك خوا چاوی لوتف و بەزەیی لە بەندەکانی یەوەیە و هیچ ئاوێك لێیان غافڵ نیە، دایکێکی دڵسۆز و بەخشندە چەندە بە خەمی کۆرپەکەیەوەیە خوای



Scanned by CamScanner

مـەزن و زانـا چـەند قـاتی ئـەوە، وەك پێغەمبـەری پێشـەوا ﷺ لـە فەرمایشتێکی دا فەرموویەتی.

هەڵبەتە ئەگەر لە باتی وشەی (رب) وشەیەکی تر بەکار هاتبا وەك (خالق) بەدی هێنەر، (ملك) سەرۆك، (مالك) خاوەن، (اله) پەرستراو، ئـەو چـەمك و واتایانە کە لە وشەی (رب) دەفامرێنەوە لـێی نەدەفامرانـەوە، بـەڵکو تـەنیا بەدی هێنەریەتی، یان سەرۆکایەتی، یان خاوەنایەتی، یان پەرستراوێتی ، خوای لـێ دەفامرایەوە، بەڵام ئێسـتا هەموو ئەم چـەمك و واتایـانەی وێکـڕا لـێ دەفامرێنەوە.

پوختەی قسان ئەوەیە: ئیسلام دەیـەوێ ئینـسانی موسـڵمان بـەردەوام لـە هەموو هەڵس وکەوتێکی دا خـوای لە بیر بێت و هەست بە چاودێری و ئاگاداری بکات، لە شەوێدا و لە ڕۆژێدا، لە دەمی خەوێ و لە دەمی بەخەبەرییەدا، لە دەمـی تـووڕەیی و لـە دەمـی ئاشـتی یـەدا، لـە مزگەوتێ و لە بازاڕی دا و ... هتد ئیمان و بڕوایەکیش ئاوا نـەبێ چ نیە چونکە هیچ تاوو تەئسیرێکی نابێ لە ژیانی ئینسان‌دا.

ئەمانە چەند گەوهەرێك بوون کە بەندە بە چەند بن ئاو لێدانێك لە دەریای پڕ بەهرە و بێ ئامانی ئەم ئایەتەدا وەدەستی هێنان، ئێستاش نـۆرە گەیـشتە سەر ئایەتی سێیەم.



Scanned by CamScanner

# تەفسیری ئایەتی سێیەم

## ﴿ الرحمن الرحیم ﴾

(( بە بەزەیی بەخشندەیە ))

لە دەمی تەفسیر کردنی ئایەتی یەکەم دا مانای ﴿الرحمن الرحیم﴾ مان لێك دایەوە بە پێویستی نازانم لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، ئەما ئەوەی لێرەدا پێویستی بە باسکردن هەیە، هۆی دووبارە کرانەوەی ئەم ئایەتەیە زانایان لە ئاقار هۆی دووبارە کردنەوەی ئەم ئایەتەدا لێرەدا چەند رایەکان هەیە، پوختەیان ئەمانەی خوارێن:

١- برێك دەڵێن هۆی دووبارە کرانەوەی ئەم ئایەتە چەسپاندنی زۆر و زەوەندەیی سیفەتی رەحمەت و بەزەیی خوایە و هیچی دی.

٢- تاقمێکی دی دەڵێن بۆیە لە پاش رستەی ﴿الحمد لله رب العالمین﴾ەوە ﴿الرحمن الرحیم﴾ هاتوە تا بزانرێ کە خوای گەورە تەنیا لە ئەنجامی سۆز و بەزەیی خۆیەوە کائیناتی خوڵقاندوە، نەك بۆ وەدەست هێنانی سوود و بەرژوەندی یەك یان دوور خستنەوەی زەرەر و زیانێك، چونکە لە ئایەتی دووەم دا ﴿الحمد لله رب العالمین﴾ رەنگە پرسیارێك سەرەتاتکەی بکات، باشە چما خوا خۆی کردوە بە پەروەردگار و کائیناتی خوڵقاندوە؟! بە ئایەتی سێیەم ﴿الرحمن الرحیم﴾ وەڵامی ئەم پرسیارە دەدرێتەوە، کە خوا تەنیا لە ئەنجامی سۆز و لوتفی خوایەتی خۆیەوە کائیناتی خوڵقاندوە نەك بە مەبەستێکی تر.



Scanned by CamScanner

٣- پێڕێکی دی ئاوا وەڵام دەدەنەوە، دەڵێن: لە وشەی (رب) مانای گەورەیی و قەهر و هەیبەت دەفامرێتەوە و جۆرە ترس و لەرزێك دڵی ئینسان دادەگرێ بۆیە لە ئایەتی سێیەم دا گوتراوە: ﴿الرحمن الرحيم﴾ بۆ خاتری وەی بزانن کە خوا لەگەڵ دەسەڵات و گەورەیی دا ڕەحمەت و بەزەیی و لوتفیشی هەیە.

ئێستاش با بێینە سەر دەرهێنانی بڕێك لە گەوهەرە گرانبایی یەکانی دەریای ئەم ئایەتە:

## گەوهەری یەکەم

## درەوشانەوەی سۆز و بەزەیی خودا لە کائینات دا

### دیاردەی یەکەم: زاووزێی زیندەوەران[1]

زیندەوەر هەتا گچکەتر و بێهێزتر بێت و کەمتر توانای خۆپاراستن و بەرگری کردنی هەبێت لە جوجکەکانی، زاووزێی خێراتر و ڕێژەی زۆر بوونی هەڵکشیوترە ، بۆ وێنە : زاووزێ لە نێو گیاندارە یەك خانەیی یەکان دا لە ماوەی چەند ڕۆژێك دا دەگاتە چەندەها ملیۆن ، شاژنی مۆریانە کە پێویستە بۆ خۆی بەتەنێ زاووزێ و زۆر بوونی وەچە ئەنجام بدات ڕۆژێ (٣٦٠٠٠) هێلکە دادەنێ، شاژنی مێشەنگوینە ڕۆژێ لە (١٠٠٠) وە هەتا (٢٠٠٠) هێلکە دادەنێ، مشکی بیابان هەر ساڵی (١٧) کەرەتان دەزێ هەر کەرەتەی (٤) جوجکەی دەبێت، چونکە ئا حەز و دوژمنی لە کایە بەهاری پترن، بەلام بە بەراوەژووەوە هەتا گیاندار زلتر و بەهێزتر بێ و زیاتر توانای خۆڕاگری و

---

(١) (نشانه هائی از او) دفتر يكم لاپەرە (٥) اثر: سيد رضا صدر.



Scanned by CamScanner

پارێزگاری هەبێ لە بێچووەکانی زاوزێ زۆربوونی سست تر وکەمترە، بۆ وێنە : نەهەنگ بە دوو ساڵان جارێکی دەزێ و یەك بێچووی دەبێت، فیل کە تەمەنی خۆدەبەر (٧٠)ساڵی هەڵ دەکات،بە درێژایی تەمەنی چوار پێنج بێچووی دەبێ.

هەڵبەتە لێرەدا ڕەحمەت و سۆزی خوا وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، گیانداری گچکە و بێ هێز چونکە هەموو دەمێ مەترسی لەنێو چوونی هەیە پێویستە لەسەرێکی دیکەوە بۆی تێ‌هەڵ بێتەوە، دەنا لە ماوەیەکی کەم دا خراپی‌یان لێ دەبڕێ و ئاسەواریان نامێنێ، ئەمما گیانداری بەهێز و زەبەلاح چونکە پتر دەتوانێ بمێنێتەوە پێویستی بە وەچەی زۆر نیە و ئەگەر خوا نەخواستە گیانداره زل و زەبەلاحەکانیش وەك گیانداره وردیلە و چووکەڵەکان زۆر بوویان هەم ژیانی ئینسانیش دەکەوتە مەترسی‌یەوە و هەم ژیانی گیاندارانیش.

## دیاردەی دووەم : شەمشەمە کوێرە و پادار[1]

زۆر کەس پێ‌یان وایە شەمشەمە کوێرە بۆیە تەنیا بە شەوێ دەگەڕێ چونکە لە شەوی‌دا چاکتر تواناى دیتنی‌ی هەیە، ئەمما لە ڕاستی دا وا نیە لە شەویش‌دا حاڵی لە ڕۆژێ باشتر نیە و هیچ بەری پێ‌ی خۆی نابینێ بەلکو هۆی گەڕان و سووڕانی بەشەوێ ئەوەیە کە دوژمنەکانی زەفەری پێ نەبەن، چونکە ئەو بەستەزمانە فرووزایی‌یە نابینێ و ڕەنگە دوژمنانی نەیەڵن بە بست بڕوات.

بەڵام ئێستا با بزانین پەروەردگار چۆن گیروگرفتی ئەو باڵندە قوڕ بە سەرەی چارەسەر کردوە:

[1] سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (٧، ٨).

کوردان لە مێژە گوتوویانە : خوا هەتا دەرگایەکی نەکاتەوە یەکی داناخات، لێرەش دا خوای زانا و توانا کە شەمشەمە کوێرەی لە بەهرەی دیتن بێ بەش کردوە لە لایەکی دیکەوە بۆی پڕ کردۆتەوە و(ڕادار) ی پێ بەخشیوە.
ئەما دەزانی ڕادار چیە؟ : ئەو ئامێرەیە کە بە یەکێك لە مەزنترین داهێنراوەکانی ئینسان حیساب دەکرێت، ئەو ئامێرە دووری و نیزیکی کەشتی یەکان لە یەکتر ڕادەگەیەنێ و هەواڵی دووری و نیزیکی قەراغی دەریاکان دەدا و کەشتی یەوانەکان لە هەواڵی کێوە بەستەڵەکەکان خەبەردار دەکا و هەواڵی وەنیزیك کەوتنی فڕۆکەکان لە سنووری وەڵات ڕادەگەیەنێ هەموو ئەم کارانەش لە ڕێی شەپۆلە سەروو دەنگی یەکانەوە ئەنجام دەدات.
ئێستا با بێینە سەر ڕاداری شەمشەمە کوێرە: ئەو باڵندەیە لە هەر چرکەیەك دا (٣٠) تا (٦٠) جار شەپۆلی سەرووی دەنگ (الامواج فوق الصوتیة) لە گەروویەوە لە چەند کونێکی وردیلەی نێو لووتی یەوە ڕەوانەی دەرێ دەکات لە ڕێی گوێیەکانی یەوە کە زێدە پڕ وردەکاری و ڕێك و پێك خوڵقێنراون، شەپۆلە گەڕاوەکان _پاش تێك هەڵەنگووتنیان لەگەڵ ئەو تەنانەی لە پێشیەوە هەن _وەردەگرێ و دەزانێ لە پێشیەوە چ هەیە و چ نیە.
ئەرێ خوێنەری ئازیز !

بەدێپی درشت لەسەر نێوچاوانی شەمشەمەکوێرە و ڕادارەکەی نە نووسراوە: لە فابریقەی سۆز و بەزەیی خوادا داهێنراوە؟!!



Scanned by CamScanner

## دیاردەی سێیەم : خۆراکی گیاندارانی نێو دەریا[1]

لە نێو دەریادا هەزاران جۆرە گیاندار هەن کە ژمارەی تاکەکانی هەر جۆرێك لە ملیۆنەها تێپەڕ دەکات، باشە دەبێ ئەو گیاندارە دەریایی‌یانە لە کوێ و چۆن چۆنی خۆراکیان دابین بکەن؟، ئایا ئەو خوایەی کە فەرموویەتی: ﴿وَ رَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە) دەبێ ئەو گیاندارە دەریایی‌یانەش نەکەونە بەر ڕێژنەی بارانی ڕەحمەت و سۆزی؟! با، دەوەرە تێ‌فکرە، هەر (صدف)ێك سالّی (٩,٠٠٠,٠٠٠) نۆ ملیۆن هێلکە دەکات، جۆرە ماسی‌یەك هەیە پێی دەبێژن (خاویار) سالّی (٣) تا (٤) ملیۆن هێلکە دەکات، جشکی ئاوی سالّی (٢٠) ملیۆن، کەروێشکی ئاوی لە هەر دەقیقەیەك دا (٤٠٠٠٠) چل هەزار هێلکە دەکات و تا چەند حەوتوو درێژە بەو کارەی دەدات، زاووزێی گیاندارە یەك خانەیی‌یەکان لە دەریادا لە ماوەی ڕۆژێك‌دا خۆی لە چەند ملیۆن دەدات، بە جۆرێك کە دەتوانن لە ماوەی چەند حەوتوێك‌دا هێندەی قەبارەی زەوی زۆر بن!! ئەمما ڕەحمەت و سۆزی پەروەردگار بە بەردێکی دوو کێلی شکاندوون، لە سەرێکەوە لە ڕێی ئەو هەموو گەرا زۆرەی گیاندارانەوە بڕیوێکی زۆر بەلەزەت بۆ گیانداران دابین دەکات لە سەرێکی تریشەوە هاوسەنگی (تعادل) پێك دێنن لە نێو دنیای گیانداران دا.

(١) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١١).

## دیاردەی چوارەم : ماسی یە چرا دارەکان[1]

قوولّی زەریاکان لە هەزارەها مەتر پترە ئەمما تیشکی ڕۆژێ زیاتر لە (٤٠٠) مەتر بە ناوێدا ناچێتە خوارێ، ئەدی ئەو ماسی یانەی لە قوولایی زەریاکان دا دەژین تەگبیریان چیە؟!

"زانیاری" وەلاّم دەداتەوە و دەڵێت: کوڕە برالە چۆن تەگبیریان چیە پێت وایە دنیا شاری بێ ساحێبە؟ مەگەر ئەو پەروەردگارەی سەرپەرشتی بوونەوەر دەکا و زانیاری و ڕەحمەتی وە هەموو شتێك ڕادەگات و ئاگای لە مار و مێرووی هەیە گیروگرفتی ئەوان ماسی یانەی لێ عاسێ دەبێت؟! نا، پەروەردگاری بالاّ دەستو خاوەن سۆز چرا و گلۆپی جۆرا و جۆری بۆ وان جۆرە ماسی یان خولقاندوە کە پەردەی تاریکی و شەوە زەنگی ئەنگوستە چاوی ژێر دەریای پێ دەدڕن، هەڵبەتە ئەو چرا و گلۆپانەش جۆرا و جۆرن هەیانە شۆقەکەی بنەوشەیی یە هەیانە سەوزە و هەشیانە زەردە و سوورە و ... هتد سەرسوڕهێنەرتر لە هەمووی ئەوەیە کە بەعزێك لەو ماسی یانە نەك هەر یەك و دوو بەڵکو چەندین چرای تیشك دەریان هەیە، ئی وایان هەیە لە تەپڵی سەریەوە هەتا سەری کلکێ ی دوگمەیەو ڕووناکی پەخش دەکەن، بەڵێ خوێنەری بەڕێز دنیا شاری بێ ساحێب نیە وکوردانیش زۆر ڕاستیان گوتوە: خوا کلاّوی بۆ بەڕوویش کردوە!

---

(١) (نشانه هائی از او) دفتر یکم لاپەرە (٧٣، ٧٤).



Scanned by CamScanner

## دیاردەی پێنجەم : دەزگای پەیام نێری لە لەش دا[1]

ئینسان کاتێك چاوی بە کۆمەڵـە تەلێکی هـاڵۆز و بلۆز و لێك هاڵاوی تەلەفۆن دەکەوێ سەرگێژەکەی دەگاتێ کە چۆن چۆنی لە یەك کات دا هەزارەها تەلەفۆن قسان پێکەوە دەکەن بێ ئەوەی هیچیان لەگەڵ هیچیان تێکەڵ بن. لە سۆنگەی ئەوەوە ئینسان لە ئاقار ئەو ئەندازیار و شارەزایانەدا کە تەلەفۆنیان داهێناوە هەست بە سوپاس گوزاری و منەت باری دەکات، بەڵام ئایا دەزانی کە دەزگای تەلەفۆن و (برید)ی لەشی هەر مرۆڤێك هەزارەها کەرەت هاڵۆزتر و لێك هاڵاوتر و رێك و پێك ترە لە دەزگای تەلەفۆنی شارێکی گەورە؟!

دەزگای مێشك شەوو رۆژ ملیۆنەها پەیام بەنێو ملیۆنەها خانەدا تێپەڕ دەکات و سـەربارەش نیش‌کردن و جـووڵانـی دڵ و جەرگ و سـی‌یەکان و گورچیلەکان و پەنکریاس و گەدە و سەر و دەست و لاق و پشت و...هتد بەڕێوە دەبات!!

ئایا دەزانی کە زمانت خـاوەنی (٣٠٠٠) خانـەی چێشتنە و هەر کام لەو خانانەش بەهۆی تاڵێکی باریکی نەدیتراوەوە بە مێشکەوە بەستراوە؟!

ئایا دەزانی کە هەر گوێیەکت خـاوەنی (١,٠٠٠,٠٠٠) (یـەك ملیـۆن) خانەی بیستنە وهەر خانەیەکیش بەهۆی تاڵێکی یەکجار باریکەوە گەیەنـدراوە بە مێشك؟!

ئایا دەزانی کە هەر چـاوێکت خێـوی (١٣٠,٠٠٠,٠٠٠) (سـەد و سـی ملیۆن) خانەیە کەئەرکیان وەرگرتنـی وێنـەی شـتەکانە لـە رێ وشـەبۆلەکانی تیشکەوەو گەیاندنی بە مێشك؟!

---

(١) (نشانه هائی از او) دفتر یکم لاپەرە (١٣٤، ١٣٥).



Scanned by CamScanner

ئایا دەزانی کە پێستی لەشت خاوەنی (٣٠٠٠٠) خانەی هەست کردنە بە گەرمی و (٥٠٠٠٠) خانەی هەست کردنە بـە سـاردی و (٥٠٠٠٠٠) خانـەی هەستی دەست لێ کوتان (لمس)ە ؟! هاتووچۆی نێوان خانەکانی لەش و مێکیش لەهەر سەعاتێك دا زیاتر لە (٣٠٠٠)کلم ڕێ دەبڕێ !!

ئایا _خوێنەری ئازیز_ چ جاران بیرت لەو ئەندازیار و شارەزایە کردۆتەوە کە دەزگای تەلەفۆنی مێشکتی خولقاندوە و هەستت بەوە کردوە کـە لێزمـەی سۆز و بەزەیی وی هەموو جێی پڕ کردوون؟!

وە ئایا پەروەردگارێکی هێندە بەخشندە و خاوەن سۆز شایانی ئـەوە نیـە خۆش بویسترێ و سەری بەندایەتی بۆ بخرێتە سەر عەرزێ؟!!

## دیاردەی شەشەم : ئایا زەوی لانکێکی ئارام نیە؟[1]

لەگەڵ هەبوونی چەند عامیلی بەهێزدا بۆ تەفر و توونا کردنی زەوی ، گۆی زەوی هەزارەها ساڵە وەك خۆی ماوەتەوە و مووی لـێ نەلەخشاوە و لەنێو نەچووە ، ئاوی دەریاکان بەردەوام بەهۆی تیشکی ڕۆژێ وە دەبێتە هەڵم و بەرەو سەرێ دەڕوا و لە کات و شوێنی گونجاودا لە شێوەی باران و بەفروتەرزەدا دەگەڕێتەوە نێو زەوی و لە عەمبارە سروشتی یە ئامادە کراوەکان دا جێ گیر دەبێت، ئاوی خڕبۆوەی بن زەوی جێی پێ تەنگ دەبێ و لە زۆر جێیان دا بە شێوەی کانی و سەرچاوان سەروەدەر دەنێ، بەشێکیش لە ئاوی پەزمەندەی ژێر زەوی لە ئەنجامی پلەی گەرمی نێو زەوی دا دەبێتە هەڵم و گازوقەبارەیەکی زلی لـێ پێك دێ و مەترسی تەقینەوەیەکی بێ ئامان بۆ خڕۆکەی زەوی دێنێتە پێش .

---

(١) (نشانەهائی از او) دفتر دوم، لاپەرە (١٤-١٥).



Scanned by CamScanner

دیسان زەوی لە سەعاتێکدا (١٨٠,٠٠٠)کلم بە دەوری رۆژیدا هەڵدەسوورێ و لەهەر سەعاتێکیش دا (٦٨٠) کلم وەك فرفرۆکە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، سەربارەش زۆر لە ماددە رەق و شلەکانی نێو زەوی لە سۆنگەی گەرمایی زۆری نێو زەوییەوە دەبنە گاز و هەڵم و فشار و پاڵەپەستۆیەکی گەورە دەخەنە سەر توێکڵی زەوی ، ئێستا کە ئەمانەمان زانی با پرسیارێك لە خۆمان بکەین : باشە بۆچی زەوی لەگەڵ ئەو هەموو بەزم و رەزم و پەت پەتێنە و بێنەر بەرەیەدا کە پێی دەکرێ هیچی لێ نەهاتوە و کورد گوتەنی: دەڵێی نە بای دیوە و نە باران ؟!!

(زانیاری) وەڵام دەداتەوە و دەڵێت : - بەزەیی و میهرەبانی پەروەردگار دوو سێ عامیلی بنچینەیی رەخساندوە بۆ پاراستنی زەوی:

یەکەم: زەوی سەرەڕای ئەوە کە بۆ خۆی هێزی کێشندەی هەیە و هەرچی لەسەر پشتییەتی بە خۆیەوە دەگوشێ و سوێندت پێ دەخورێ کە بە پەتکی لێیان شەتەك داوە، بەڵێ سەربارەی ئەوەش بە چینێکی هەوایی زۆر قەبە و ئەستوور دەورە دراوە و پێچراوە کە عامیلێکی فرە کاریگەرە بۆ هێنانە دی ئارامی بۆ دانیشتووانی سەر خڕۆکەی زەوی.

دووەم: زنجیرە چیاکان بە پێی قسەی شارەزایانی زەوی ناسی (جیۆلۆجیا) چەندەیان بە دەرەوەیە و دەبینرێ شەش حەوت ئەوەندەشیان بە ناخی عەرزیدا چۆتە خوار و بۆ زەوی وەك پەیکەری ئێسکی وان لە لەشی ئینسان دا و لە لێك پچڕان و پەرەم بە پەرەم بوون دەی پارێزن، قورئانی گەورە و قسە لەجێش لە زۆر جێیان دا زنجیرە شاخەکان وەسینگ و گوڵمیخان دەچوێنێ: وەك دەفەرموێ: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾[1] .

---

[1] النبأ : ٧ .



Scanned by CamScanner

سێیەم: ئاگر پژێنەکان وەك هەناسەدان وان بۆ زەوی و لە پلەی گەرمی نێو زەوی کەم دەکە نەوە ئەو ماددە شل و گازییانەی کەلە ئەنجامی گەرمی نێو زەوی‌یەوە قاڵ بوونەوە و پاڵەپەستۆ و فشارێکی زۆریان خستۆتە سەر توێکڵی زەوی دەریان داوێن و زەوی لە تەقینەوە (انفجار)ێکی حەتمی هەمە لایەنە دەپارێزن.

کە وابێ خوێنەری خۆشەویستم قەدری ئەو خوایە بگرە کە لانکۆڵەکەمانی بە سۆز و بەزەیی خۆی دەورە داوە و گونجاندوویەتی بۆ ژیان و تێدا حەوانەوە و تێدا مەدار کردنی ئێمە، سوورا و سووریش بزانە ئەگەر قەدری ئەو پەروەردگارە نەگری بە بەندایەتی و پابەندیت بە ڕێباز و دەستوورەکانی‌یەوە بێ غەك و پێ نەزانی.

## دیاردەی حەوتەم : خڕۆکەکانی خوێن [1]

لە خوێنی هەر کامێکمان دا دوو تاقمە خڕۆکە هەن کە بە چاوی ڕووت نابینرێن:

**یەکەم: خڕۆکە سوورەکان:**

کە لە هەر (ملم۳)دا نزیکەی (٥) ملیۆن هەن ئیشی ئەم خڕۆکە سوورانەش گواستنەوە و گەیاندنی ئاوو ئۆکسجینە بە هەموو سیکلدانۆچکەکانی سی‌یەکان و وەرگرتنی خۆراکی هەرس کراوە لە ڕیخۆڵەکان و ئۆکسجینە لە سی‌یەکان و گەیاندنیەتی لە کورت ترین ماوەدا[2] بە دوورترین وەڵاتی لەش، وێڕای ئەوەش ئەم خڕۆکانە ئەو

(١) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢٥، ٢٦).

(٢) سەیری (افریدگار جهان) بکە لاپەڕە (١٧٤) نووسراوی: علی مجتبی کرمانی، عباسعلی عمید زنجانی، سید حسن طاهری.



Scanned by CamScanner

پاشەڕۆك و ژەهرانە کۆ دەکەنەوە کە لە ئەنجامی سەرف کردن و سووتانی خواردن دا پەیدا بووە لە نێو خانەکانی لەش دا، بەڵێ ئەو خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵە بە چالاکی خڕ دەکەنەوە و دەی گەیەننەوە بە دڵ و لەوێشەوە دەچێتە نێو سیەکان و لە ڕێی هەناسەدانەوە فڕێ دەدرێتە دەرێ.

ئەوە بە کورتی چۆنیەتی بەسەرهات و حاڵ و باڵی خڕۆکە سوورەکان بوو.

## دووەم : خڕۆکە سپی یەکان :

ئەمما خڕۆکە سپی یەکان کە تاقمی دووەمن ڕێژەیان لە خوێن دا کەمترە لە چاو ڕێژەی خڕۆکە سوورەکان چونکە لە هەر (ملم٣)دا (٧٠٠٠) هەیە، ئێستا با بزانین سەرپەرشتی کەری بوونەوەر چ ئەرکێکی بەوان خڕۆکە ژیکەڵانە سپاردوە: -

ئەرکی ئەو خڕۆکانە بەرگری کردنە لە لەش و پاسەوانی کردنیەتی، چونکە چ لە ڕێی خواردن و خواردنەوە وە چ لە ڕێی هەناسە هەڵمژینەوە و چ لە ڕێی بریندار بوونی سووچێکی پێستی لەشەوە ژمارەیەکی زۆر بەکتریای زیان بەخش (میکرۆب) هورووژم دێننە نێو وەڵاتی لەش و دەست دەکەن بە کاری ناڕەوا و بەر بینگ بە خانەکانی جەستەی ئینسان دەگرن.

لەو دەمەی‌دا خڕۆکە سپی‌یەکان دەست دەکەن بە فیداکاری و خۆ بەخت کردن لە پێناوی نیشتمان‌دا و ئەو کێم زووخاوەی کە لە برین و شوێنە نەخۆشەکانی لەش دا دەبینرێ لاشەی خڕۆکە سپی‌یەکانە لە سەنگەری خەبات داو لە پێناوی پاراستنی لەش دا بە پلەی شەهیدی گەیون.

جا ئێستاش نازانم داخوا کەس هەیە سۆز و بەزەیی خوا لە تابلۆی خڕۆکە سوور وسپی‌یەکانی خوێن دا نەبینێ ؟! بەڵام هەڵبەتە بەشی هەندێ ناکەس بەچە هەردەبێ ئەدی کوردان نەیان گوتوە: چەم بێ چەقەڵ نابێ؟!

## خوێنەرانی ئازیز !

لە نێو هەزارەها دیاردەی ئەم بوونەوەرەدا کە لە هەموویان دا سۆز و بەزەیی خوای میهرەبان وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە تەنیا حەوت دیاردەم باس کردن چونکە لە مێژە کوردان گوتوویانە: کەسێك بە کەمی نەزانێ بە زۆریش نازانێ.

## گەوهەری دووەم

## دروست کرانی بوونەوەر ئەنجامی سۆزو بەزەیی خودایە

دووەمین گەوهەری پڕ تیشکی ئەم ئایەتە _ کە هاتۆتە بەر نیگای نەقوستانی بەندە _ ئەوەیە: کە پەروەردگار ئەم کائیناتەی لە ئەنجامی میهرەبانی و بەخشندەیی و سۆزی بێ پایانی خۆی خوڵقاندوە و بۆیە بەندەکانی دروست کردوە تاکو چاکەیان لەگەڵ دا بکات و لە دەریای بێ سنووری بەزەیی و چاکەی خۆی بەهرەمەندیان بکات، چۆنیەتی ئامرانەوەی ئەم واتایەش لەم ئایەتە ئاوایە: پاش ئەوەی خوا ڕوونی کردەوە کە بەدی هێنەر و سەپەرشتی کەری بوونەوەرە، خستیە ڕوو کە زۆر بە بەزەیی و بەخشندەیە.

لە ڕاستی‌دا هەر واشە چونکە خوای مەزن حەوجێی غەیری خۆی نیە تاکو بۆیە دروستیان بکات کە سوودی پێ بگەیەنن. دیسان خاوەند لە خۆڕا ڕقی لە کەسیش هەڵناستێ تا سزا و جەزرەبەی بدات و بۆیە دروستی بکات تا لە کۆتایی‌دا بەرەو ئاگری جەهەندەم پاڵەستۆی دات.

کەواتە: پوختەی قسان ئەوەیە کە ئینسان بۆیە خوڵقێنراوە تاکو چاکەی لەگەڵ دا بکرێ و لە ناز و نیعمەتەکانی خوادا خاوەن پشك بێت.

لێرەدا لووت و بزووت لە پرسیارێکی فەلسەفی ڕەش بینانە هەڵ دەنگووین کە بە درێژایی ڕۆژگار بۆتە گرێ کوێرە و دێوە زمەی سەر دڵ و مێشکی پێرێك ئینسانی چارە ڕەش و فزەی لــێ بڕیـون و زینـدەگی لێ کردوونـە ژاری مـار، پرسیارەکە ئاوایە:

ئەگەر ڕاستە خوا بوونەوەر و ژیانی بە مەبەستی سوود گەیاندن بە غەیر و بە دافیعی بەزەیی و بەخشندەیی خوڵقاندوە چما چەندین گیروگرفت و ئاستەنگ لە ژیان دا دەبینین کە لەمپەرن لە ڕێی بە ئاکام گەیشتنی ئینسان داو چەپەر و تانەن لە پێش ڕەوتی بەرەو بەختەوەری چوونی‌دا، ئایا وێڕای هەبوونی سـەدان جۆرە نەخۆشی دەروونی و جەستەیی و جەنگ و شەڕ و شۆڕ و خەم و خەفەت و بەڵارە و بوومەلەرزە و ئاگر پژێنەکان و تۆفـان و هـەورە تریـشقە و گـەرما و سەرما و باو گێژەڵووکە و ... سەربارەی هەموانیش شەیتان و دارو دەستەکەی لە جیهان‌دا ماقووڵە بگوترێ ئەم ژیانە پڕە لە ناز و نیعمەتی نەژمێراوو خوا لە ئەنهامی ڕەحمەت و سۆزی خۆیەوە ڕەخساندوویەتی؟!!

لەم خاڵانەی خوارێدا هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەدەین:

١- کەسێك بڕوایەکی پتەوو تەواوی هەبێت بە خوای مەزن و سیفەتەکانی ئەم پرسیارە خورتەی دڵی نادات چونکە نێوەڕۆکی ئەم پرسیارە لەگەڵ کاکڵ و



Scanned by CamScanner

نێوەڕۆکی بڕوا بوون دا ناسازێ، ئایا کەسێك بڕوای هەبێت بەوە کە خوای بەخشندە خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاکە و پاك و بێ خەوشە لە هەموو سیفەتێکی بەد و خراپ ، چۆن شەیتان دەتوانێ زەفەری پێ بەرێ کە گوایە خوا بوونەوەری بە نارێکی خولقاندوە و ئینسانی بە مەبەستی ئازار و ئەشکەنجە و چەرمەسەرێ هێناوەتە دی؟!

٢- ئەو کەسانەی ئەم پرسیارە لە دڵ و دەروونیان دا دەرسقێ وەك گوتمان یان هەر بڕوایان نیە، یان بڕوایەکی قرپۆك و بێ خێریان هەیە، لە سۆنگەی ئەوەشەوە لە ڕوانگەی هەڵە و ناتەواوەوە سەرنجی ژیان دەدەن. چونکە ئەوانە وا دەزانن ژیان هەر ئەم قۆناغەی ژیانی دنیایە و هیچی دی، هەڵبەتە ئەم تێڕوانینە هەڵەیەش ئەنجامێکی ژێر بێژی‌یانەی هەڵە دەخوازێ، کە دەتوانین ئاوا تەعبیری لێ بدەینەوە :- مادام ژیان هەر ئەم ژیانەیە و خواش بە مەبەستی چاکە لەگەڵ کردن و بەزەیی و سۆز نواندن سەبارەت بە بەندەکانی ڕەخساندوویەتی، کەواتە: پێویستە ئەم ژیانە خاڵی بێت لە هەموو جۆرە نیگەرانی و کۆسپ و تەگەرەیەك کە دەبێتە تاڵ کەری.

کەواتە ئێمە بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە پێویستە بی خەینە ڕوو کە ئەم پرسیارە وەك کوانێك وایە کە لە جەستەیەکی نەساغ دا پەیدا دەبێ، بەڵێ ئەم پرسیارە لە ئەنجامی تێڕوانین و بیرکردنەوەیەکی هەڵە و ناتەواردا هاتۆتە دی.

بەڵێ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەو بنەما و بنچینە فیکری‌یەی کە پرسیارەکەی لەسەر بەندە بدەینە بەر نشتەری‌یە کاڵاکردنەوە و توێژینەوەوە، چونکە هەموو دەمێ پێشەکی (مقدمة)ی هەڵە هەر ئەنجام (نتیجة)ی هەڵەی بە دوادا دێت، بۆ

وێنە: یەکێك دەڵێت: ئەم بیورە لە ئاسن و پۆڵا دروست کراوە، هەرچی لە ئاسن و پۆڵاش دروست کرابێ سەراوە، کەواتە ئەم بیورە سەراوە و لە ئاوێدا قم نابێت. هەڵبەتە ڕستەی (ئەم بیورە سەراوە و لە ئاوێدا قم نابێت) ئەنجامێکی سروشتی و ژێر بێژی‌یانەی ڕستەی پێشوویەتی: (هەرچی لە ئاسن و پۆڵاش دروست کرابێ سەراوە). ئەما شکی تێدا نیە کە ڕستەی (ئەم بیورە سەراوە و لە ئاوێدا قم نابێت) هەڵەیە و هەڵەیی‌یەتی‌یەکەشی لە ڕستەی پێشوویەوە پێوە نووساوە. کەواتە بەر لەوەی بێینە سەر پووچ کردنەوەی ڕستەی، کۆتایی پێویستە بچیە سەروکاری ڕستەی پێشووی کە پێشەکی‌یەتی.

لەم مەسەلەی مەش دا بە هەمان شێوە پێویستە بە خاوەنی پرسیارەکە بێژین: ئەو ڕوانگەی کە تۆلی‌یەوە لە ژیان و بوونەوەر دەفکری هەڵە و ناتەواوە، چونکە ئەم ژیانەی ئێستامان بریتی نیە لە هەموو ژیان، بەڵکو قۆناغێکە لە سەفەری دوور و درێژی کاروانی ژیانی ئینسان دا، ئەم ژیانە پەروەردگار دەڵێت قۆناغی تێدا تاقی کرانەوەیە و هیچی دی، بەڵێ دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾[1] واتە: ئەو زاتەی مردن و ژیانی خولقاندوە تا تاقی‌تان بکاتەوە کێهەتان ڕەفتاری چاکترە.

جا مادام ئەم ژیانە شوێنی تاقی کرانەوە و لێك هەڵاوێرانی ڕەش و سپی و بەد وچاکان بێت نەك هەر ماقووڵ نیە خاڵی بێت لە هەمووچەشنە نیگەرانی و تەنگ و چەڵەمەیەك، بەڵکو هەبوونی ئەو جۆرەشتانە زۆر

(١) ملك : ٢ .

شتێکی زەرووری و حەتمی‌یە، ئاخر پێم نالێی ئینسان ئەگەر تاڵی و سوێری یان نەچێژێ و بەردی سارد و گەرمی وەبەر پێیان نەیەت چۆن دەناسرێ و دەردەکەوێ داخوا ئینسانێکی بە ورە و خۆڕاگرە یان نا!!

جا خوێنەری خۆشەویستم :

ئەوەی کە لەم دوو سێ دێڕەی ئێستا ڕابووردن بنەڕەتی ترین جۆرێ کەرەوەی ئیسلامە لە ڕێچکەکان و گەورەترین ئیمتیازی ئیسلامە.

پیاو هەقێش بڵێت تێڕوانینێکی ئاوا لە ژیان _واتە تێڕوانینێکی ئیسلامی_ سەرەڕای ئەوەی کە شتێکی ڕاست و واقیعی‌یە گەلێك گەلێکیش پێویست و زەرووری‌یە بۆ ئینسان، چونکە ئینسانێك کە لەم ڕوانگەیەوە لە ژیان دەفکرێ سەر لەبەری دنیای لە پێش چاوان دەبێتە شانۆی تێدا تاقی کرانەوە و سەرتاپای ژیانی _بەهەموو لایەنەکانی‌یەوە_ دەبێتە تێکۆشان (جهاد) خەبات و تەقەللا لە پێناوی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا و ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت دا، بابایەکی ئاواش وشەی: بێ هیوایی، بەزین، ڕەش بینی، نا ئومێدی، ترس، پاشە کشێ کردن، نێو چاوان گرژی و ...هتد لە فەرهەنگی مێشکی‌دا نابینرێن. بابایەکی ئاوا مادام دەزانێ بۆچی خوڵقێنراوە و چی لێ داوا کراوە لە کاتێك دا نیگەرانی و تەنگ و چەڵەمەیەك بەربینگێی پێ دەگرێ و لە ڕاستی‌ڕا دێ سەری دنیایەی لێ ڕێك نایەتەوە و عەزم و ئیرادەی کوڵ نابێ و چرای هیوا و ئومێدی وەپلتە پلت ناکەوێ و خەفە نابێت، بەڵکو هەڵوێستێکی گەش بینانە لە ئاقار نیگەرانی و تەنگ و چەڵەمەکانی‌دا دەنوێنێ و هیچ وەسەر خۆی نایەنێ و بە دڵێکی هێدی و ئارامەوە لە گەڵیان دا ڕوو بەڕوو دەبێت و



Scanned by CamScanner

بەشێنەیی لێیان وەخۆ دەکەوێ و دەبەریان رادەچێ، چونکە ئەو دەزانێ کە ژیانی دنیا جێی ئەوەی نیە ئینسان دڵی خۆی پێ خۆش بکا و بە هەمویا وەی بێ تێیدا وەمێنێ، ئەدی ئەوە نیە قورئانەکەی پێی گوتوە: بە مەبەستی تاقی کردنەوێ لەسەر شانۆی زەوی دام ناون ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً..﴾[1]، یان ئەوە نیە پێغەمبەرەکەی پێی دەڵێت : ((الدنیا مزرعة الاخرة)) دنیا کێڵگەی دوا رۆژە.

بێگومان لە وەرزی (چاندن)یش دا دروێنە و خڕ کردنەوەی بەروبووم شتێکی چاوەروان نەکراوە، کەواتە _ئینسانی موسڵمان دەڵێت_ با لەم ژیانەدا رەنجێ بدەم تا لەو دنیا بە گەنجێ بگەم، هەڵبەتە بابایەکیش سوورا و سوور بزانێت پێویستە لەسەری رەنج بدات و خۆی ماندوو بکات لە وەختێک دا ماندوو بوو ئارەقی دەردا و لەپە دەستانی خوێنیان لێ چرژا هیچ پێی تێک ناچێ و ورەی بەر نادا و زراوی ناچێ.

ئەمما بە خوا بابایەک پێی وابێ بۆیە خولقێنراوە بێ کەیفی‌یە دڵی خۆی نەکاو وەک پاتاڵێکی بەرهەڵدا و بێ ساحێب کار و پیشەی گەران و سووڕان و لەوەڕان بێ هەر کاتێک نیگەرانی و کۆسپ و تەگەرەیەکی بێتە رێ نائومێد دەبێ و چاری دەچنە تۆقێ سەری و کێچی دەکەوێتە کەوڵی، چونکە وا دەزانێ کە لەم ژیانەیدا رەنج بەخەسار و دەردەدار بوو ئیدی بۆی دەردەچێ و تروسکایی ژیانی دەکوژێتەوە و گەلێک گەلێک خۆی بێ بەخت و ئیقباڵ و نەگبەت و چارە رەش و سەر بەهەش دێتە بەرچاوان.

---

(۱) البقرة : ۳۰ .

بە ڕاستی ئینسانێکی ئاواش کە لـە ڕوانگەیـەکی واوە سـەیری ژیـان دەکات زۆر جێی خۆیەتی تووشی تەنگە نەفەسی و هەناسـە بڕکـێ ببـێ و قەڵای عەزم و ئیرادەی بڕووخێ ، لە کاتێك دا شتێکی ناکەوێتە بەر دڵی و نیگەرانی‌یەك یەخەی پێ دەگرێ، چونکە ئەو ئینسانە وا هەست دەکات کە هەموو ئەو ڕەنج و تێکۆشانەی خەرجی دەکات لە وەختی بەرەنگار بـوونی لەگەڵ گێرە و کێشەکان دا بە فیـڕۆ دەڕوا و کەس بۆی نانووسێ.

پوختەی قسان ئەوەیە کە لە سۆنگەی تێوە ڕامانێکی نا ئیسلامی‌یانەی هەڵەوە لە ژیان‌وبوونەوەر، مرۆڤە ڕەش بینەکان دووچاری ڕەش بینی دەبن و دنیایان لە پێش چاوان تاریك دەبێ، واتە هەر وەك چۆن بابای میـزاج تێـك چوو ئاوێ شیرین و زوڵاڵی بەزاری تاڵە، بابای بیر و بڕوا تێك چووش بە هۆی لاملی لە ئیسلام ژیانی دنیای _کە گەورەترین بەهرەی خوایە_ لەبەر نیگا دەبێتە دێوەزمە و بە جارێکی سەری دنیایەی لێ وێك دێتەوە.

٣- ئەو شـتانەی ڕەش بینـەکان (المتشائمون) بـە نموونـە دەی هێننـەوە بـۆ پاڵپشتی دەعواکەیان نەزانی خۆیان بووە کە تووشی ئەو چۆرتەی کردوون و هەقیان بە ناهەق هاتۆتە بەر چاوان . ئێستاش با بـچینە سـەروکاری ئـەو دیاردانەی دڵی ژەنگ گرتوو و چاوی تەم بەسەر داهاتووی ئەوان ڕەش بینان بە عەیب و ناتەواوی حسێب کردوە.

بەڵام پێش ئەوەی یەك بە یەك پێیان دا بـچینە خـوار پێویـستە چـەند خاڵێك لەبەرچاو بگرین:-

یەکەم: خوای مەزن خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاکە و پاك و بـێ خەوشـە لـە هەموو سیفەتێکی خراپ ، کاربەجێیی (حکیم)یش یەکێکە لە سـیفەتە چاکەکانی خوا ، سادەترین شتیش لە بابای کاربەجێ (حکیم)دا ئەوەیـە



Scanned by CamScanner

کە ئیشی بێ هوودە و بێ سوود نەکات، کەواتە نابێ لە نێـو کائینـاتی خوادا تاقە شتێکی بێ ئامانج هەبێت.

دووەم: مەرج نیە هەرچی ئینسان حیکمەت و سوود و قازانجەکەی دەرك نەکرد ئەو پێ نەزانینەی وی بەڵگـە بـێ لەسـەر نـەبوونی چـونکە یاسـایەکی ژیربێژی (منطقی)یە کە (عدم العلـم لا یـستلزم علـم العـدم) نـەبوونی زانیاری بە شتێك نەبوونی ئەو شتەی لێ نافامرێتەوە.

بەڵـێ ئینسان هەروەك چۆن لە لایەنی جەستە و قەبارە و تەمەنەوە سنوور دارە، لە لایـەنی ژیـری و زانیاریـشەوە دیـسان سـنوورداره، وەك قورئان فەرموویەتی: ﴿وَمَـا أُوتِيـتُمْ مِـنَ الْعِلْـمِ إِلاَّ قَلِـيلاً...﴾[1] ، هـەر هێندێکتان زانیاری پێ دراوە، ئینجا هەروەك چـۆن بـە قـولایی گـچکە ماسی گچکە دەگیرێ ، بـە زانیـاری کـەمیش شـتێکی کـەم و کـورت دەزانرێ، هیچ کەسیش نیە لە بێ رێ و جێیی جنێوو نارەزایی دەربڕینی منداڵێکی نەزان سەبارەت بەو پزیشکەی دەیەوێ چارەسەری بکا وحەب و دەرمانی تاڵ و تفتی دەداتێ دوو دڵ بێ.

سێیەم: مـادام ئـەم ژیانـە قۆنـاغی تـاقی کرانـەوە و لێـك جـوێ کرانـەوە و هەڵاوێرانی ڕەش و سپیان بێ حەتمەن دەبێ وێڕای سـاغی و نەخۆشـی و وێڕای تێری برسییەتی و، وێڕای گەرما سەرما و، وێڕای کەیف خۆشی دڵ تەنگی و، وێڕای سەرکەوتن ژێرکەوتن و، وێڕای ئاشتی شەڕ و ئـاژاوە و، وێڕای جوان دزێوو، وێڕای شیرین تاڵ و، وێڕای هێمنی و ئاسایش ترس و لەرز و... بە کورتی وێڕای ئەرێتی (ایجابی) ئـەرێتی (سـلبی) هـەبێت ،

---

[1] اسراء : ٨٥ .



Scanned by CamScanner

تاکو ڕوون بێتەوە کە سەبارەت بەو شتانەی پێیان قایلە و جێی ڕەزامەندی وین چۆن ڕەفتار دەکات، ئایا خۆی لێ بایی دەبێ و هەر خۆی لەبیر دەبێ یان مافی خەڵکی دیکەشی تێدا ڕەچاو دەکا و سوپاسی خوادا دەکات.

وە هەتا دەرکەوێ کە سەبارەت بەو شتانەی پێیان ناڕازییە و خۆشی ناوێن هەڵوێستی چ دەبێ، ئایا دنیای لێ وەتەنگ دێ و بێ هیوایی ڕووی تێ دەکا و دەست دەکات بە ڕەخنە گرتن لە کارسازی بوونەوەر، یان بە بەراوەژووەوە ئارام دەگرێ و ڕووی بەندایەتی دەکاتە خوا و پێی دەڵێت: ئەمن بەندەی تۆم و هەر چۆنێکی تاقیم بکەیەوە، ڕازیم و شوکرانە بژێرم.

چوارەم: هەموو ئەو دیاردانەش کە بەشتێکی سەلبی و خراپ وەبەرچاو دێن ئەگەر لە گۆشە نیگایەکی گچکەوە و لە ڕوانگەی بەرژەوەندی کەس (شخص)ی ـیەوە سەیریان کەین سەلبی و خراپن، ئەمما ئەگەر لە ڕوانگەی بەرژەوەندی گشتییەوە تێیانەوە ڕامێنین نەک هەر شتێکی بەد و خراپ نین بەڵکو گەلێک گەلێک شتێکی پێویست و چاکیشن، بۆ وێنە: تۆفان و باران و بەفر بۆ بابایەک کە لەشی تەڕ دەبێ و سەرمای دەبێت شتێکی خراپ و سەلبییە بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی بەرژەوەندی گشتییەوە سەیری بکەین شتێکی زۆر باشە و گەلێک زەرووری‌یە و ژیانی مەردومی پێوە بەندە بە خواردن و خواردنەوە و پاك و خاوێنی و کشت و کاڵ و ماڵات بەخێو کردنەوە.

دیسان کوێری و کەڕی و لاڵی و کەچەڵی و شەلی و گۆجی و دەردەداری، سەبارەت بەو کەسەی کە کوێرە یان کەڕە یان لاڵە یان



Scanned by CamScanner

کەچەڵە یان شەلە یان گۆجە یان دەردەدارە ، شتێکی خراپن ئەما سەبارەت بە بەرژەوەندی گشتی زۆر چاکن و گەلێك پێویستن دەزانن، بۆچی؟!

بۆ خاتری وەی مەردوم کە چاویان بە بابای کوێر کەوت قەدری نیعمەتی چاوو، کە چاویان بە کەڕ کەوت قەدری نیعمەتی گوێ و، کە لاڵیان دیت گەورەیی نیعمەتی گۆیایی و، کە کەچەڵیان دی قەدری تووکی سەر و، کە شەل یان دی قەدری لاق و لەتەری ساغ و، کە گۆجیان هاتە بەچاوان قەدری نیعمەتی دەست و پەل و، کە دەردە داریان دی قەدری لەش ساغی بزانن، کە قەدری ئەو نیعمەتانەشیان زانی قەدری پەروەردگاریان دەزانن و لەش ساغی بزانن، کە قەدری ئەو نیعمەتانەشیان زانی قەدری پەروەردگاریان دەزانن و کە قەدری ویشیان زانی لە تاقی کردنەوەیەکەیان دا نمرەیەکی چاك وەردەگرن .

هەر ئاواش بەو پێ و دانە هەموو ئەو دیاردانەش کە ئێمە بە ڕواڵەت بە شتێکی سەلبی و بەد دێنە بەرنیگامان گشتیان ئەگەر بەرژەوەندی گشتی ڕەچاو بکەین زۆر شتی باش و پێویستن بۆ ژیان.

جا ئێستا دوای خستنە ڕووی ئەم چوار خاڵە دەتوانین بچینە سەروکاری ئەو شتانەی کە ڕەش بینەکان بە عەیب و ناتەواوی و کەم و کەسری لە قەڵەم دەدەن لە بوونەوەردا:

- **سەبارەت بە هەبوونی جۆرەها نەخۆشی دەروونی و جەستەیی دەڵێین :**

هەبوونی نەساغی و نەخۆشی لە چەند لاوە شتێکی زەرووری یەو دەبێ هەبێت:

١- پێشینان گوتوویانە: لە تاریکە شەوان دا قەدری مانگێ دەزانرێ، بەڵێ هەموو ناز و نیعمەتەکانی ژیان وەختێك قەدریان دەزانرێ و پەی بە بایەخ داری‌یان دەبرێ کەپەکیان لەسەر کەوت، ئەگەر گریمان نەساغی و نەخۆشیش نەبوایە ئینسان هەستی بە بایەخ و گرنگی تەندروستی و لەش ساغی نەدەکرد بۆیە گوتراوە: تەندروستی تاجێکە لەسەری هەموو ئینسانێکی ساغ،ئەمما دەردەدار و نەخۆشەکان نەبێ نای بینن.

جا ڕەنگە لێرەدا یەکێك بڵێت: جا قەیدێ چ دەکا با بابای تەندروست هەست بە نیعمەتی ساغی نەکات چما چ دەقەومێ؟!

دەڵێین: ئەءزۆر دەقەومێ چونکە ژیانی دنیا جێی تاقی کرانەوەیە و ئینسانیش هەتا پتر هەست بە گەورەیی بەهرە و نیعمەتەکانی خوا بکات چاکتر لە خوای وەنزیك دەکەوێ و زیاتر هەست بە منەت باری دەکات.

دیارە ئەو گۆڕانکاری و پێش کەوتن و پەرەسەندنەی لە ژیان دا دەی بینین ئەنجامی مل ملانێ و دەبەرێك ڕاچوونی ئینسانە لەگەڵ ئەو کۆسپ و تەگەرە و مەینەتی‌یانەی ڕێی پێ دەگرن کە لە نێو وان دا (نەخۆشی) ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ، جا ئەگەر ئینسان ئەو کۆسپ و تەگەرە و چەرمەسەری‌یانەی لە ڕێدا نەبوایە دەبوو دەگەڵ چ ملانەی گرتبایە و دەبەرێك ڕاچووبایە؟!

ئایا ئەگەر ئەو سەدان نەساغی‌یانە نەبوونایە کە تووشی ئینسان و ئاژەڵ و ڕووەك دێن ئینسان چ حەوجێی ئەوە بوو کە هەزارەها کتێب و نوسراو بەرەخسێنێ کە دەربارەی ئەوان نەخۆشی‌یان و شێوازی چارەسەرکردنیان دەدوێن؟!



Scanned by CamScanner

٢- هەڵبەتە نەخۆشی‌یەکان بەهۆی میکرۆبەوە بڵاو دەبنەوە، بەڵام ئایا دەزانی کە زانایان دەڵێن هەبوونی میکرۆب بۆ ژیانی ئینسان شتێکی پێویست و بایەخ دارە؟ شارەزایان دەڵێن چوونە ژوورەوەی میکرۆب لە جەستەی ئینسان دەبێتە هۆی دروست بوونی ناکۆکی و دەگرێتێ ڕاچوون لە نێوان میکرۆب و خڕۆکە سپی‌یەکانی خوێن دا، خڕۆکە سپی یەکانی خوێن لە ئەنجامی مل ملانێ‌یان دا لەگەڵ دوژمنە سنوور شکێنەکان دا پێویستی‌یان بە بڕێوو تفاقی پتر دەکات لە سۆنگەی سەرف کردنی بڕێوو تفاقی زۆریش لە لایەن خڕۆکە سپی‌یەکانەوە لەشی ئینسان بەرەو فراژوو بوون و نەش و نما کردن دەچێت، تەنانەت شارەزایان دەڵێن: ئەگەر میکرۆب نەبوایە قەد و باڵای هیچ ئینسانێک لە (٨٠) سانتیمەتر تێ نەدەپەڕی.

- **سەبارەت بە جەنگ و شەڕ و شۆڵیش دەڵێین:**

١_و ٢_ هەرچی لە خاڵی یەکەم و دووەم دا گوتمان دەربارەی نەخۆشی و نەساغی لێرەش دا بی هێنەوە بەر نیگات و تەنیا وشەی (نەخۆشی) بکە بە (شەڕوشۆڵ) و وشەی (تەندروستی) بکە بە (هێمنی و ئاسایش).

٣- شەڕوشۆڵ و هەرا ئەنجامێکی سروشتی ژیانی ئینسانەکانە، چونکە خوای بەخشندە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئینسانی بۆ خاتری تاقی کردنەوە خوڵقاندوە وای دروست کردوە کە:

یەکەم: ئازاد بێ و بە پێی ویست و هەڵبژاردنی خۆی بەڕێیەدا بڕوات.

دووەم: لەگەڵ پاڵنەری خێر و چاکەدا پاڵنەری شەڕ و خراپەش هەبێت لە ژیانی‌دا، جا لە ئاکامی کۆبوونەوەی ئەم دوو عامیلەدا ئینسانەکان تێک



Scanned by CamScanner

هەڵ دەپرژێن و لە ڕاستیکرا دێن و جەنگ و هەرا بەرپا دەبێت.

کەواتە هەبوونی شەڕوشۆڕ ئەنجامێکی حەتمی و سروشتی ژیانی ئینسانە و عـامیلێکی بنـەڕەتی‌یـە لـە پێـك هێنـەرەکانی سروشـت و سـەر و سیمای کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

خۆ ئەگەر یەکێکیش بڵێت: جا چ دەبوو ئەگەر ئەو دوو عامیلەی کـە لـە ئەنجامی وان دا شەڕ و هەرا بەرپا دەبێت نەبوونایە؟

دەڵێین : ئەو دەمی ئینسان لە ئینسانەتی دەشۆرا و بە کەڵکی تاقی کرانەوە و جێ نشینایەتیش نەدەهات، چ فەرقی نەدەبوو لەگەڵ ئەو دار و بـەردەدا کە ئەستۆکەچی یاسا فیزیایی و کیمیایی‌یـەکانی سروشـتە و داری پـێ لەسەر بەردی دانانێ و مێشی پێ لە ناو ناکرێ.

- **دەربارەی هەبوونی خەم و خەفەت و پەژارەش دەبێژین :**

خـەم و خەفـەت خـواردن بـۆ ملانـە گرتنـی ئینسـان لەگـەڵ کۆسـپ و تەگەرەکانی ژیانی‌دا وەك تین و گەرمی وایە بۆ ئاگر، واتە ئەگەر بڵێین: بۆچـی خەم و خەفەت و دڵ تەنگی و کەسەر هەیە لە ژیانی دنیادا ؟ _ لەگەڵ ئیعتراف کردنمان دا بە هەبوونی تەنگ و چەڵەمە و گێرە کێشـەی نـەبڕاوەدا وەك ئـەوە وایـە بڵـێین : لەبەرچـی تـین و گـەرمایی‌مان بـۆ دێـت لـە کاتێـك دا لەبـەر ئاورووچکەیەکی دانیشتووین؟!

- **سەبارەت بە بوومەلەرزە و ئاگر پژێنەکانیش :**

لە تەفسـیری ئایەتی دووەم دا شتێکمان لێ ڕاگەیاندوە کە بایی قەناعەت پێ هێنان دەکات.



Scanned by CamScanner

- **ئەمما مەسەلەی دیاردەی تۆفان :**

زانایان دەربارەی دەڵێن:

ئەو هەڵکشین و داکشین و تۆفانانەی کە لە زەریاکان دا ڕوو دەدەن جۆراو جۆرن: هەیانە لە ناوچە ساردەکانەوە دێ و هەیانە لە ناوچە گەرمەکانەوە، هەیانە تویخی سەرەوەی ئاوێ دەگرێتەوە و هەشیانە بارێ بنەوەی ، سوودی ئەو هەڵکیش و داکشین و تۆفانانەش وێڕای هاوسەنگ کردنی پلەی گەرمی نزمی ناوچە ساردەکان بەهۆی تۆفانی گەرمەوە و پلەی گەرمی بەرزی ناوچە گەرمەکان بەهۆی تۆفانی ساردەوە، دەبێتە هۆی شڵقاندن و تێکەوە ڕاشەقاندنی زەریاکان و نایەڵێ بۆگەن بن و ببنە کانگای زاووزێی بەکتریا و مێش و مێشوولە و زیندەوەرە زیان بەخشەکانی تر.

- **سەبارەت بە لافاوی ڕووبارەکان :**

بێ گومان ئەگەر لە ڕوانگەی بەرژەوەندی گشتییەوە سەیری کەین زۆر بەسوودە چونکە نیشانە و دروشمی زۆر بوونی ئاوی چۆم و ڕووبارەکانە و ئەوەش شتێکە شوکری خوای دەوێ و شایانی پێ قەڵس بوونێ نیە، مەسەلەی وەپێش خستنی بەرژەوەندی گشتیش لەسەر ئی تاک شتێکی سەلمێنراوە و پێی ناوێ زۆری وەدوا کەوین.

- **بۆ هەورە تریشقەش دەڵێین :**

وێڕای ئەوەی کە ئەنجامی پێکەوە متوربە بوونی هەورە سارد و گەرمەکانە دووەمین ڕێگەشە بۆ دروست کردنی (نایترۆجین) لە زەوی دا چونکە هەر جارێك هەورە تریشقە بریقەی هات ئەندازەیەك لە (ئۆکسجین) و (نایترۆجین) پێکەوە



Scanned by CamScanner

ئاوێته دەکا و بارانیش وەك (ئایترۆجین) ێکی ئاوێته دەی هێنێته خوارێ بۆ نێو زەوی[1].

- **دیاردەی سەرما و گەرما و باو گێژەڵووکەش :**

پێی ئاوێ یەك بە یەك وەدوایان کەوین و سەری خوێنەری ئازیزیـان پێـوە بێشێنین چونکە حیکمەت و سوودیان شتێکی هەست پـێ کـراوە و لـە کـەس شێرراوە نیە ئەمما بە مەرجێك بەرژەوەندی تایبەتی نەکەینە سەنگی مەحەك و خۆپەرستانە دەدنیایە نەفکرین.

ئێستا مایەوە مەسەلەی هۆ و حیکمەتی هەبوونی شەیتان و پیـر و دار و دەستەکەی، بەڵام چونکە کەسێك بە وردی لەوەی ڕابورد ورد بوویێتەوە و لـێی حاڵی بووبێ بە سێنایی حیکمەتی هەبوونی شەیتانیش دەزانێ، بـە پێویـستی نازانم لە بنی کولەکەی بدەم و درێژ دادڕی‌یە بکەم بۆیە بە کورتی دەڵێم:

وەك گوتمان ئینسان جێ نشینی خوایـە و بـۆ تـاقی کردنـەوێ خولقـاوە، کەسێکیش دەکرێ تاقی وەکرێ کە توانای بەسـەر دەرچـوون و دەرنەچـوونێدا هەبێت، ئەگەر نا بە زۆر لێ کراو (مُجْبَرْ) حسێب دەکرێ، کەواتە دەبێ وێـڕای پاڵنەری چاکە کە ژیری و فریشتە و پێغەمبەرانن ــپــاڵنەری خراپەش هەبێ کە هەوا و نەفس و شەیتان و بەدانن.

لەوەوە کە ڕابورد زانیمان کە ڕەخنەی ڕەش بینان سەبارەت بـە بوونـەوەر وەك بلقێ سەر ئاوێ وایە و هەر لە خۆوە پووچ دەبێتەوە، چونکە هـەموو ئـەو شتانەی ئەوان بە عەیب و ناتەواوی لە قەڵەم دەدەن شتێکە نارێـك و پێکـی و خوار و خێچی ئێوە ڕامان و بەهـ کردنەوەی خۆیان هێناویەتە دی و هیچی دی.

---

(١) سەیری کتێبی (العلم یدعو للایمان)ی کرسی مۆریسون بکە لاپەڕە (٧٨، ٧٩).

لە کۆتایی‌دا دەڵێم: ئەو ڕەش بینانەم وەك بابایەك دێنە پێش چاوان کە لە پشت پەردەیەکی ڕەشەوە سەیری جیهان دەکات و دوایش دەڵێت: ئەم دنیایە هەمووی هەر تاریکی و شەوە زەنگە و هیچ جوانی‌یەکی تێدا نیە !

## گەوهەری سێیەم

## جۆری پەیوەندی نێوان خوا و بەندە لە ڕێبازی ئیسلام دا

پەیوەندی نێوان خوادا و ئینسان لە ئیسلام دا بریتی‌یە لە خۆشەویستی و ڕێزی دووسەرە، واتە خۆشەویستی و ڕێزی خودا تبارك و تعالی بۆ ئینسان و ئی ئینسان بۆ وی، هەڵبەتە کە دەڵێین پەیوەندی نێوان خوا و ئینسان لە ئیسلام دا ئاوایە واتە لە دنیای واقیع دا وایە چونکە (ئیسلام) بەرنامەی ڕاستەقینەی خوایە ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ﴾[1] .

دیارە کە بەرنامەی ڕاستەقینەی خواش شتێکی واقیعی‌یە و لەگەڵ واقیع دا ناکۆکی نیە، لەوەوە دەگەینە ئەم ئەنجامە:

هەر بیروباوەڕێك پەیوەندی نێوان خوا و ئینسان بە غەیری ئەو شێوەیە دیاری بکات کە ئیسلام دەیڵێ بیروباوەڕێکی پووچ و هەڵەیە و لەگەڵ واقیع دا ناسازێ، جا ئەو پووچی و هەڵەیی و لەگەڵ واقیع دا نەسازانەش بەڵگەی ئەوەیە کە خوا ئەی ناردوە یا لە نێو خەڵکیش‌دا بە ناوی ئایینی خواوە ناسرابێ[2] .

(١) آل عمران : ١٩ .

(٢) لێرەدا مەبەستم لەو ئاین و مەزهەبانەیە کە ئینسان دەستکاری کردوون و شێواندوونی و ڕای لێ کردوون کە لەگەڵ واقیع دا نەسازێن وەك: جوولەکایەتی و مەسیحایەتی.

ئێستاش چەند دەقێك لـە قورئـانی قـسە لـەجێ و فەرمایـشتی پێغەمبـەری پێشەوامان ﷺ دەخەینە بەرچاوان کەئیسپاتی ئەم قسەیەی ئێستامان دەکەن و جۆر و چۆنیەتی پەیوەندی نێوان خوا و ئینسانمان بۆ ڕوون دەکەنەوە:

١- لە ئایەتی ﴿الرحمن الرحیم﴾ بە دوای ﴿رب العالمین﴾دا ئەوە دەفامرێتەوە کە پەروەردگاری کائینات ﴿رب العـالمین﴾ بـە سـۆز و بـەزەیی و بەخـشندەیە ﴿الرحمن الرحیم﴾ە لە ئاقار وەدی هێنراوەکانی‌دا.

٢- ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾[1] یانی: هێندێ کەس هاوەڵان بۆ خوای پەیدا دەکەن، هێندەی خۆشەویستی‌یە خوای خۆشیان دەوێن، ئەمما بـڕواداران لـەوان پـتر خوایان خـۆش دەوێ، واتـە خۆشەویـستی بـڕواداران بـۆ خوایـان پـترە لـە خۆشەویستی وان بۆ پەرستراوەکانیان.

٣- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ...﴾[2]، یانی: ئەی بڕواداران هەر کامێك لـە ئێـوە لـە دینەکـەی هەڵگەڕێتەوە خوا میللەتێك دەرەخسێنێ خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ.

٤- ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ...﴾[3]، واتە: بڵێ ـ بـە ئینسانەکان ـ ئەگەر خواتان خۆش دەوێ وەدوای من کەون خـواش خۆشـی دەوێن.

٥- خوای بەخشندە لە فەرموودەیەکی قودسی (حدیث قدسي)دا دەفـەرموێ: ((اذا تقرب اليّ العبد شبراً تقربت اليه ذراعاً واذا تقرب الي ذراعـاً تقربـت

(١) البقرة : ١٦٥ .

(٢) المائدة : ٥٥ .

(٣) آل عمران : ٣٢ .



Scanned by CamScanner

منه باعاً واذا اتى الي مشياً أتيته هرولة))[3] واتە: ئەگەر بەندە بستێك لێم وەنیزیك کەوێ باسکێك لـێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر باسکێك لـێم نزیـك بێتەوە باڵێك لـێی نیزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆین بۆ لام بێت بە ڕاکردن بۆ لای دەچم!!

٦- دیسان خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((عبـدي ما عبدتني و رجوتني فأني غافر لك على ما كان فيـك، ويا عبـدي ان لقيتني بقراب الارض خطيئة مالم تشرك بي لقيتك بقرابها مغفرة))[4] واتە: ئەی بەندەم هەتا بم پەرستی و تکام لێ بکەی لێـت خـۆش دەبم هەرچـەندە تاوانیشت هەبن، وە ئەی بەندەم ئەگەر بە پڕاوپڕی زەوی لە تاوان بێـیـە لام هاوەڵم بۆ دانەنێی ئەمنیش بە پڕاو پـڕی زەوی بـەزەیی و چاوپۆشـی و لێ خۆش بوونت بۆ دێنم !!

٧- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((للهُ أشدُ فرحاً بتوبة عبده حين يتوب اليـه من احدكم كان على راحلته بارض فلاة فانفلتت منه راحلته وعليها طعامه و شرابه فأيس منها فأتى شجرة واضطجع في ظلها وقد أيس منها، فبينما هو كذلك اذا هو بها قائمة عنده فأخذ بخطامها ثم قال من شدة الفرح اللهم انت عبدي وانا ربك، اخطأ من شدة الفرح))[1].

یانی : خوا شاد و خۆشحاڵترە بە تۆبە و گەڕانەوەی بەندەی لە بابایـەك کـە وڵاخێکی پێیە لە دەشتێکی چۆڵ و هۆڵ، ئینجا وڵاخەکەی لـێ بەرهەڵدا دەبێت و خواردن و خواردنەوەکەشی لەسەر پشتێیـەتی، دوایـی لـێی

(٣) (بخاري) لە (انس و ابي هريرة)ەوە (طبري) لە (سلمان الفارسي)ەوە ڕیوایەتیان کردوە.

(٤) (احمد) لە (ابو ذر)ەوە ڕیوایەتی کردوە.

(١) (مسلم) ڕیوایەتی کردوە لە _انس بن مالك_ەوە.

Scanned by CamScanner

نائومێد دەبێ و دەچێتە کن درەختێك و لە بن سێبەری‌دا دەنوێ هەڵبەتە بە چاکی لـێی بێ هیواو تەمابڕاو بووە، جا لە کاتێك دا لەو حاڵەی دایە سەیر دەکات هاتۆتە بەردەمی ڕاوەستاوە، ئەویش جڵـەوی دەگـرێ و لـە خۆشیان دەڵێت: ئەی خوایـە ئـەتۆ بەنـدەمی و مـن پـەروەردگارتم، لـە خۆشیان لـێی تێك دەچێ!!

٨- خوای بەرزومەزن لەسەر زمـانی پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((عبـدي المؤمن احب الي من بعض ملائكتي))[١].

واتە: بەندەی بڕوادارم لا خۆشەویست ترە لە بڕێك لە فریشتەکانم!!

٩- دیسان خوای میهرەبان فەرموویەتی: ((حقت محبتي للمتحابين فـيَّ، و حقت محبتي للمتواصلين فـيّ، و حقـت محبتي للمتناصـحين فــيَّ، و حقـت محبتي للمتزاورين فـيّ، وحقت محبتي للمتباذلين فـيَّ، المتحابون فـيَّ على منابر من نور يغبطهم بمكانهم النبيون والصديقون والشهداء))[٢].

یانی : خۆشەویستیم فەرز بووە بۆ ئەوانەی لە پێناوی مندا یـەکتریان خۆش دەوێ، وە خۆشەویستیم فەرز بووە بـۆ ئەوانـەی لەبـەر خـاتری مـن پێکەوە پەیوەستن، وە خۆشەویستیم پێویست بووە بۆ ئەوانەی لە ڕێی مندا ئامۆژگاری یەکتر دەکەن، وە خۆشەویستیم فەرز بووە بۆ ئەوانەی لەبەر من هاموشۆی یەکدی دەکەن، وە خۆشەویستیم پێویست بووە بۆ ئەوانەی لەبەر خاتری من شت بە یەکتر دەبەخشن، ئەوانەی پێکەوە دۆستن لە ڕێی من دا _لەبەرهەشت دا_ لەسەر چەند دوانگە (منبر)ێکی نـورینن پێغەمبـەران و باوەڕپێتەوان و شەهیدان ئێرەیی‌یان پێ دەبەن لەبەر بەرزی پایە و پلەیان.

(١) (مسلم) ریوایەتی کردوە لە _انس بن مالك_ەوە.

(٢) _طبري_ لە _ ابو هريرة _ وە ریوایەتی کردوە.



Scanned by CamScanner

١٠- خوای بەخشندە لە فەرمایشتێکی تری قودسی‌دا فەرموویەتی : (( من آذى لي وليا فقد استحلَّ محاربتي وما تقرب الي عبدي بمثل اداء الفرائض، وما يزال عبدي يتقرب اليَّ بالنوافل حتى احبه، فاذا احببته كنت عينه التي يبصر بها و اذنه التي يسمع بها و رجله التي يمشي بها و فؤاده الذي يعقل به و لسانه الذي يتكلم به ان سألني اعطيته و ان دعاني اجبته، وما ترددت عن شيء انا فاعله ترددي عن وفاته لانه يكره الموت واكره مساءته))[1].

یانی : هەر کەسێك دۆستێکم ئازار بدات شەڕی لەگەڵ دا بەرپا کردووم، وە بەندەم بە هیچ شتێك وەك بەجێ هێنانی ئەو شتانەی لەسەرم فەرز کردوون لە من وەنیزیك ناکەوێ، وە بەندەم دەم بۆ دەمێ لێم وەنیزیك دەکەوێ بەهۆی بەجێ هێنانی سوننەتانەوە هەتا خۆشم دەوێ، کە خۆشم ویست دەبمە ئەو چاوەی پێی دەبینێ و ئەو گوێیەی پێی دەبیستێ و ئەو لاقەی پێی دەڕوا و ئەو ژیرییەی شتی پێ دەزانێ و ئەو زمانەی قسانی پێ دەکات، ئەگەر داوای لێ کردم پێی دەبەخشم و ئەگەر بانگی کردم بە دەنگییەوە دەچم، وە لە هیچ شتێك دا کە دەیکەم دوو دڵ نەبووم وەك دوو دڵیم لەمراندنیدا چونکە ئەو _بەندەیە_ مردنی پێ ناخۆشە و ئەمنیش پێ ناخۆش بوونی ویم پێ ناخۆشە!!

[1] (بخاری) ریوایەتی کردوە.

## خوێنەری ئازیز !

ئەم دە نموونەیە لوپچێك بون لە تەغارێك لەو دەقە ئیسلامی‌یانەی دەری دەخەن کە پەیوەندی نێوان خوا و ئینسان بریتی‌یە لە دۆستایەتی و ڕێز و خۆشەویستی لە ئاقار یەك دا.

ئەما لێرەدا شتێك ماوە پێویستە بگوترێ، کە دەڵێین پەیوەندی نێوان خوا و بەندەکانی بریتی‌یە لە خۆشەویستی و سۆز و دۆستایەتی نابێ ئەوەی لێ وەفامرێ کە نەفی هەبوونی ترسان لە خوا دەکەین، نا چونکە لە خوا ترسان خەسڵەتێکی بنەڕەتی ئینسانی ژیر و خواناسە و مرۆڤ تا پتر خوا بناسێ زیاتری لێ دەترسێت، بەڵێ مەبەستمان ئەوە نیە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خۆشەویستی و سۆز لە نێوان خوا و ئینسان دا زەمینە و بنچینەی پەیوەندی نێوانیانە، ئەوەش کە گوتمان ڕاستی‌یەکە وەك مانگی چواردە لە نێو بەرنامەی خوادا خۆی دەنوێنێ و لە دەیان دەق دا خراوەتە ڕوو.

بەڵێ پەیوەندی خوای بە بەزەیی و باڵا دەست لەگەڵ ئینسان دا ئاوایە نەك وەك فەیلەسووفەکانی یۆنانی دەیان گوت، کە گوایە خوا هەر هێندە پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤ دا هەیە کە وەدی هێنەریەتی و هیچی دی، چونکە ئەوان دەڵێین: خوا بوونەوەری وەك ئاشێکی زەبەلاح وەگەڕ خستوە و وازی لێ هێناوە و پشتی تێ کردوە و ئینسانی تێدا هەڵوەدا کردوە. وە نەك وەك ئەفسانەکانی کلێسایی (الخرافيات الكنسيه) دەڵێت: کە گوایە خوا بەندەکانی دەبوغزێنێ و پێی خۆش نیە شت فێر بن و لە دنیایە تێ بگەن و هیچ شتێکیان لە زانیاری خۆی بەش



Scanned by CamScanner

نادات و هیچ کام لە نهێنییەکانی خۆیان بۆ ئاشکرا ناکات ئەڵلاھومە مەگەر لە ڕێی دزی و فزی و تەڵەکە بازییەوە، دەنا ئینسان هیچی دەسگیر نابێت[1]!!

وە نەك وەك ئەفسانەی جوولەکایەتی دەڵێت: کە خوا ئێمە _گەلی جوو_ی کردوە بە وەکیل و جێ نشینی خۆی و ئێمە گەلی خوای هەڵبژێرراو (شعب الله المختار)ین و ئێمە فرزەند و خۆشەویستی خواین (نحن ابناء الله واحباؤه) و پێویستە هەموو گەلانی تر _ غەیری جوو _ دیل و ژێر دەستی مەبن و ئێمە سوودیان لێ وەرگرین چونکە خوا هەر وەك چۆن ئاژەڵی لەبەر خاتری ئینسان خولقاندوە غەیری ئێمەشی لەبەر مە خولقاندوە!!

وە نەك وەك ئەفسانەی بت پەرستی بە هەموو شێوەکانییەوە دەڵێت: پێویستە بۆ وەی بگەینە خوا هێز و وەسیلەیەك هەبێت لە نێوان دا[1]، جا کەیفی خۆیەتی ئەو هێز و وەسیلەیە دارە، خورمایە، مانگایە، ڕووەکە، ئینسانە یان هەر شتێکی ترە.

## جا ئێستاش خوێنەری بەڕێز!

وەرە ڕێبازی خوا و ڕێچکەکانی تر لە بەرێك ڕاگرە و ڕامێنە هەتا بەرزی و گەورەیی بەرنامە و ئایینی خوا و نزمی و قرێزکی ڕێچکە دەسکردەکانت بۆ دەرکەوێ.

(١) وەك لە (تەورات) دا هاتوە کە نەصرانیەکان بە (العهد القديم) ی خۆیان دەزانن.

(١) هەڵبەتە ئێمەی موسڵمانیش ئینکاری ناکەین کە هەبوونی هێز و وەسیلە پێویستە بۆ گەیشتن بە خودا وەك پێغەمبەر ﷺ یان کەسێك کە جێ گری ئەوە و لە شوێنی دادەنیشێ، بەڵام ئێمە دەڵێین ئەو هێز و وەسیلەیە ناتوانن هیچ زەرەر و قازانجێکمان پێ بگەیەنن بە بێ ویستی خودا کەواتە نابێ ئینسان ئەوان بپەرستێ و لێیان بپاڕێ چونکە ئەوە هەر لایقی خوایە.



Scanned by CamScanner

# تەفسیری ئایەتی چوارەم

## ﴿ ملك يوم الدين ﴾ خاوەنی ڕۆژی سزا و پاداشتە

**مانای وشەکان:**

**ملك:** واتە خاوەن، بڕێکیش بە (مَلِك) یان خوێندۆتەوە واتە سەرۆك و خاوەن دەسەڵات.

**يوم الدين:** واتە ڕۆژی پاداشت و سزا، چونکە (الدِّين)لە زمانی عارەبی‌دا سێ واتایان هەڵ دەگرێ .

**یەکەم :** ئاین و ڕێباز ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ﴾ .

**دووەم:** سزا و پاداش وەك لەم ئایەتەدا هاتوە.

**سێیەم :** گەردن کەچی .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا بابای موسڵمان دان دێنێ بەوەدا کە خوای دادگەر خاوەن و گەورەی ڕۆژی قیامەتە، کە ڕۆژێکە چاکان پاداشتیان وێ دەدرێتەوە و، بەدان بە سزا و تۆڵەیان دەگەن.

جا ئێستا با بناوڕێك لە دەریای دەوڵەمەندی ئەم ئایەتەدا لێ بدەین و بە قەدەر توانا و بۆ لوان بڕێك لە گەوهەرە گرانبایی‌یەکانی بێ نینە دەر:



Scanned by CamScanner

# گەوهەری یەکەم

# ڕۆژی قیامەتێ چیە و چۆن دێتە پێش ؟

لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ وەلامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە:

١- پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ(١) وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ(٢) وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ(٣) وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ..﴾[1] .

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کاتێك ئاسمان شەق و پەق بوو ، وە کاتێك خڕۆکەکان پرژو بلاّو بوون، وە کاتێك دەریاکان تەقینەوە، وە کاتێك گۆڕەکان هەلْقەندرانەوە...

٢- دیسان فەرموویەتی: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ(١) وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ(٢) وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ(٣) وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ(٤) وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ(٥) وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ(٦) وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ(٧) وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ(٨) بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ(٩) وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ(١٠) وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ(١١) وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ(١٢) وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ.....﴾[2] .

یانی : کاتێ ڕۆژ پێچرایەوە، وە کاتێك ئەستێرەکان کوژانەوە، وە کاتێك شاخەکان بزوێنران، وە کاتێك حوشتری ئاوس پشت گوێ خرا، وە کاتێك جانەوەران خڕ کرانەوە، وە کاتێك دەریاکان داگیرسان، وە

---

(١) الانفطار : ١-٤

(٢) التكوير : ١-١٣ .

کاتێك ئینسانەکان زیندوو کرانەوە، وە کاتێك (کچی) زیندە بە چاڵ کراو پرسیاری لێ کرا: بە چ تاوانێـك کـوژراوە، وە کاتێـك نامـەکان بەشرانەوە، وە کاتێك ئاسمان کەوڵ کرا _ ئەو گومبەزە شینە ڕازاوەی ئێستا دەی بینین نەما_ وە کاتێك دۆزەخ بڵێسەدار کـرا، وە کاتێـك بەهەشت ڕازێنراوە...

٣- لە جێیەکی دیدا دەفەرموێ: ﴿الْقَارِعَةُ (١) مَا الْقَارِعَـةُ (٢) وَمَـا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ (٣) يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُـوثِ (٤) وَتَكُـونُ الْجِبَـالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ(٥) ﴾[1] .

واتە: داچڵەکێنەر، چووزانی داچڵەکێنەر چـی یـە ؟ ڕۆژێکـە مـەردوم وەك پەپوولەی پرژ و بڵاویان لێ دێـت، وە شـاخەکان وەك خـوری ڕەنگـاو ڕەنگی شکنراوە.

٤- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَـنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُـرُونَ (٦٨) وَأَشْرَقَتْ الأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْحَقِّ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ.. ﴾[2] .

واتە: وە کەڕەنا (صور) فووی پێدا کرا، دەسبەجێ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بێ هۆش بوون، مەگەر ئەوە نەبێ کە خوا بیەوێ _بـێ هۆش نەبێ_ ئینجا فووێکی دیکەی پێدا کـرا، یەکـسەر هـەموویان هەستانەوە و چـاوەڕوان بـوون، وە زەوی بـە ڕۆشـنایی پـەروەردگاری

---

(١) القارعة :١-٥ .

(٢) الزمر ٦٨، ٦٩ .

ڕووناک بۆوە و کتێبی تاوانان ڕۆنرا و پێغەمبەران و شاهیدان هێنران و بە هەق و ڕاستی حوکمیان لە نێوان دا کرا، بێ ئەوەی زوڵمیان لێ بکرێت.

٥- لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ..﴾[1].

واتە: ڕۆژی قیامەتێ نە زەوی وەك خۆی دەمێنێ و نە ئاسمانەکان و _بەندەکان_ ڕادەنوێنرێن بۆ خوای تەنیای باڵا دەست.

ئێستا لە تێکڕای ئەو ئایەتانەدا بۆمان دەرکەوت کە ڕۆژی قیامەتێ چۆن دێتە پێش، زانیمان کە ڕۆژی دوایی وەختێك دێتە پێشێ کە ئەم ژیانەی سەر زەوی کۆتایی پێ دێت و ئەم بوونەوەرە تێك دەچێ، بەڵێ زانیمان کە ئاسمانەکان و ئەستێرە و خرۆکە و شاخ و دەریا و...هتد سەر لەبەر هەلا هەلا دەبن و لە بەرێك هەڵدەوەشێن، واتە هەروەك چۆن بەنکە مووروویەك لە وەختی پچڕانی دەزووەکەی‌دا پرژ و بڵاو دەبێ و هەر دەنکەی بۆ جێیەکی دەچێ، ئەم بوونەوەرەش هێزی کێشندەی دەنێودا نامێنێ و پارچە پارچە دەبێ، زانیشمان کە هۆی ئەم تێك چوون و خەرا بوونەی بوونەوەر دەگەڕێتەوە بۆ فوو پێدا کرانی کەڕەنا (الصور) لە لایەن فریشتەیەکەوە _بەفەرمانی خوا_ بە ناوی (ئیسرافیل). کەواتە زانیمان ڕۆژی قیامەتێ چۆن دەقەومێ بەوەش وەڵامی بەش دووەمی پرسیارەکەمان دایەوە، مادام وایە با ئەمجار بچینە سەروکاری بەشی یەکەمی پرسیارەکە و بزانین ڕۆژی قیامەتێ چیە و چۆنە؟!

[1] ابراهیم : ٤٨ .



Scanned by CamScanner

١- خوای زانا فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ (١) يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴾[١] .

واتە: ئەی مەردوم لە پەروەردگارتان پارێز بکەن بوومەلەرزەی قیامەتێ شتێکی گەورەیە. ڕۆژێکە دەبینن هیچ شیردەرێك ئاگای لە کۆرپەی نامێنێ و هەموو ئاوسێك کۆرپەکەی لەبەر دەچێت و خەلکی دەبینی وەك سەرخۆشان، ئەمما سەرخۆش نین بەلام سزای خودا توند و تیژە.

٢- دیسان فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ (١٩) حَتَّى إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢٠) وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنْطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾[٢] .

یانی: ئەو ڕۆژەی دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر ڕاپێچەك دەدرێن و هەموو خۆ دەکرێنەوە سەرێك. جا کاتێك هاتن و گوێ و چاوو پێستیان شایەتی لێدان لەوەی کە دەیان کرد. وە بە پێستیانیان گوت چما شایەتیمان لێ دەدەن؟! گوتیان ئەو خوایەی هەموو شتێکی هێناوەتە گۆ ئێمەشی هێناوەتە گۆ، وە هەر ئەویش هەوەڵ جار هێناوینیە دی و هەر بۆ کن ویش دەگەڕێنەوە.

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((تُدنى الشمس يوم القيامة من الخلق حتى تكون كمقدار ميل، فيكون الناس على قدر اعمالهم في العرق، فمنهم من يكون الى كعبيه ومنهم من يكون الى ركبتيه، ومنهم من يكون الى

---

(١) الحج : ١ .

(٢) فصلت : ١٩-٢١ .



Scanned by CamScanner

حقويه، ومنهم من يلجمه العرق الجاما _ و اشار رسول الله ﷺ بيده الى فيه.))[1] .

یانی : ڕۆژی قیامەتێ ڕۆژ لە خەڵکی وەنیزیك دەخرێ هەتا دەگاتە ئەندازەی یەك میل (١٦٠٦) مەتر !! جا خەڵك بە پێی کردەوەکانیان دە ئارەقێدا دەبن، هەیانە هەتا گوێزینگانی دێ، وە هەیانە تا ئەژنۆیانی، وە هەیانە هەتا کەلەکەی دێت، وە هەیانە ئارەق جڵەوی دەکات _ تا چەناگەی دێ _ وە پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ زاری.

٤- خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لاَ تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ (١٨) فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ (١٩) إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلاَقٍ حِسَابِيَهْ (٢٠) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ (٢١) فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (٢٢) قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ (٢٣) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الأَيَّامِ الْخَالِيَةِ (٢٤) وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَالَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ (٢٥) وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ (٢٦) يَالَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ (٢٧) مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ (٢٩) خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ (٣١) ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ (٣٢) إِنَّهُ كَانَ لاَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ (٣٣) وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ (٣٤) فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ (٣٥) وَلاَ طَعَامٌ إِلاَّ مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لاَ يَأْكُلُهُ إِلاَّ الْخَاطِئُونَ (٣٧) ﴾[2] .

واتە: ڕۆژی قیامەتێ ڕادەنوێنرێن هیچتان لێ شێراوە نابێ ئینجا ئەوەی کتێبەکەی بە ڕاستەدا وێ دریتەوە، دەڵێت، ها کتێبی من بخوێننەوە، ئەمن دەم زانی تووشی حسیابێ دەبم، وە ئەو کەسە لە ژیانێکی پڕ

(١) (مسلم) ڕیوایەتی کردوە.

(٢) الحاقە : ١٨ -٣٧ .



Scanned by CamScanner

ڕەزامەندی دایە، لە باغێکی بەرزدا، میوە و بەرەکەی نیزیکە، پێیان دەگوترێ _ بخۆن و بخۆنەوە نەوشی گیانتان بێ بەوەی لە ژیانی ڕابوردوودا کردووتانە، ئەمما ئەوەی بەلای چەپ دا کتێبەکەی وێ دەرێتەوە ، دەڵێت: بریا کتێبەکەم هەر نەدرابایەوە، وە حیسابی خۆمم نەدیبا، کاشکی زیندوو نەبوویامەوە، سامانەکەم چ سوودی پێ نەگەیاندم، دەسەڵاتەکەم فەوتا، _پێی دەگوترێ_ بی گرن کۆت و زنجیری بخەنە مل، دوایی بی خەنە نێو دۆزەخ ، ئینجا زنجیرێکی تێ وەرپێچن حەفتا باسك درێژە، ئەو لە دنیادا بڕوای بە خوای گەورە نەبوو ، وە خەڵکی هان نەدەدا لەسەر یارمەتی دانی هەژار و نەداران[1] ئەمڕۆ چ خزم و نزیکی نینە و خۆراکیشی پێ نادرێ لە کێم و زوخا و بەولاوە _ئەو کێم و زوخاوەش_ تەنیا تاوانباران دەی خۆن.

ئێستاش زانیمان ڕۆژی قیامەتێ چی یە و چۆنە، زانیمان کە ڕۆژێکە هەتا بڵێی پڕ مەترسی و توشە و ئینسان لە حەژمەتانی ئاگای لە خۆی نامێنێ و چاوی ئەبڵەق دەبن و وەك بابای سەرخۆش بەولاو لایان دا دەکەوێ و ڕەنگی زەرد دەبێ و خەڵکی بە گوێرەی ڕێژەی تاوانەکانیان ڕێژەی ئارەقی لەشیان بەرز دەبێتەوە، ڕۆژێکە هیچ کەس توانای حاشایی کردن و بڕو بیانوانی نیە و هەر کەسە چاك یان خراپ بە پاداش و سزای کردارەکانی دەگات و یان ڕووە و بەهەشتی بەرین و پڕ ناز و نیعمەت یان دۆزەخی زەبەلاح و پڕ سزا و ئەشکەنجە و خەم و پەژارە وەڕێ دەکەوێ، خوایە بان گێڕی لە وانەی ڕووەو بەهەشت وەڕێ دەکەون و نەچینە پێڕی ئەوانەی بەرەو دۆزەخ پاڵەستۆ دەدرێن.

---

(١) لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە هەر لە دوای بڕوا بە خوا نەبوون یارمەتی نەدانی هەژاران باس کراوە، هەڵبەتە لێرەدا و لە چەندین شوێنی تردا بە ئەنگمرە بوونی ئیسلام دەرەدەکەوێ سەبارەت بە هەژار و نەداران.

ئێستا کە زانیمان ڕۆژی قیامەتێ چی یە و چۆن دێتە دی کۆتایی بە تێوە ڕامانمان دێنین لە گەوهەری یەکەمی ئەم ئایەتە و دەچینە خزمەتی گەوهەری دووەمی و هەڵوەستەیەکی لە ئاقاردا دەکەین.

## گەوهەری دووەم

## ئەنجامی ڕۆژی قیامەتێ چی یە؟!

ڕۆژی قیامەتێ ئینسانەکان دەکرێنە چوار دەستە:

دەستەی یەکەم: کە موسڵمانانن _ واتە ئەوانەی کە ڕێبازی خوایان کردۆتە بەرنامەی ژیانیان_ بەرەو ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی بەرین و نەبڕاوە وەڕێ دەکەون.

دەستەی دووەم: کە نا موسڵمان و بێ دینانن _ واتە ئەوانەی گەردن کەچی شەریعەتی خودا نەبوون _ بەرەو تۆڵەی خوا و دۆزەخی پڕ ئێش و ئازارو بێ کۆتایی پاڵەستۆ دەدرێن.

دەستەی سێیەم: کە ئەوانەن چاکە و خراپەکانیان یەکسان و هاوسەنگن ، بەرەو ناوچەی (اعراف)[1] بەڕێ دەکرێن کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان بەهەشتو دۆزەخەوە.

دەستەی چوارەم: کە ئەو موسڵمانانەن ڕەفتار و کردەوە بەدەکانیان پترن لە ڕەفتار و کردەوە چاکەکانیان ، ڕووە و دۆزەخ دەکەونە ڕێ و هەتا بە

---

(١) وشەی (أعراف) کۆی (عُرْف) ە ، کە بە سەری پشتە ملی وڵاخە بەرزە دەگوترێ و بە کەنار و فەراغی شتێش دەگوترێ . بەڵام بە عورف وشەی ئەعراف بۆتە ناو بۆ ئەو شوێنانەی کە دەکەوێتە بەینی بەهەشت و دۆزەخەوە وەک خوای بەرزو مەزن سبحانه وتعالى فەرموویەتی : ﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ﴾ الأعراف: ٤٦ .



Scanned by CamScanner

ئەندازەی تاوانەکانیان دەسووتێنرێن تێیدا دەمێننەوە دوایی ڕزگاریان دەبێت.

کەواتە با لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی ئیسلامی دا سەرنجێکی حاڵ و باڵو گوزەرانی هەر کام لەم چوار تاقمانە بدەین:

## تاقمی یەکەم: دانیشتووانی بەهەشتی بەرین:

١- پەروەردگار لە وەسفی بەهەشت دا فەرموویەتی: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ...﴾[1].

یانی: سیفەتی ئەو بەهەشتەی کە گفت دراوە بە موسڵمانان ئاوایە: چەندین ڕووباری تێدان لە ئاوی نەگۆڕاو، وە چەندین ڕووبار لە شیرێك تام و چێژی تێك نەچووە، وە چەندین ڕووبار لە شەرابی بەلەزەت بۆ خۆرەوانی، وە ڕووبار گەلێك لە هەنگوینی پالاوتە، وە بۆ وان لەو بەهەشتەی هەیە گشت میوەجاتێك، سەریارەش لێ خۆش بوون لە پەروەردگاریانەوە.

٢- لە جێیەکی دیدا فەرموویەتی: ﴿يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ (٦٨) الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ (٦٩) ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ (٧٠) يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٧١)...﴾[2].

---

(١) محمد : ١٥ .

(٢) الزخرف ٦٨-٧١ .



Scanned by CamScanner

واتە: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ـ ڕۆژی قیامەتێ ـ نە ترستان لە سەرەو نە غەمگین دەبن، ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو گەردن کەچیش بوون لە ژیانی دنیادا، هەروونە بەهەشتێ ئێوە و ژنانتان دڵخۆش دەبن، لەوێدا چەند خزمەت چییەك بەسەریانەوە دەگەڕێن بە قاپی زێڕینەوە و بە پەرداخەوە، وە لەو بەهەشتە دایە هەرچی دڵ وازی لێ بێت و کەیفی بچێتێ و چاو لەزەتی لێ بکات، وە هەتا هەتایەش تێ یدا دەمێننەوە.

٣- دیسان دەفەرموێ: ﴿ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ (٣٣) وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ (٣٤) الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ (٣٥)﴾[1] .

یانی: دەچنە نێو باغێکی نەبڕاوە، تێ یدا دەڕازێنرێنەوە بە بازنەی زێڕ و مرواری و پۆشاکیان لەوێدا ئاوریشمە، وە دەڵێن: سوپاس بۆ خوایەی غەم و پەژارەی نەهێشتین بە ڕاستی پەروەردگارمان لێ خۆش بوو و بە ئەمەکە. ئەوەی نیشتەجێی کردین لە خانووی نەبڕاوەدا لە چاکەی خۆی، نە تێیدا ماندوو دەبین وە نە وەڕەز دەبین.

٤- لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿عَلَى سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ (١٥) مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ (١٦) يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ (١٧) بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ (١٨) لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنْزِفُونَ (١٩) وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ (٢١) وَحُورٌ عِينٌ (٢٢) كَأَمْثَالِ

(١) الفاطر : ٣٣-٣٥ .



Scanned by CamScanner

اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ (٢٣) جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢٤) لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلاَ تَأْثِيمًا(٢٥)إِلاَّ قِيلاً سَلاَمًا سَلاَمًا (٢٦)﴾[1] .

یانی: _بەهەشتی یەکان_ لەسەر چەند کورسی و قەنەفەیەکی بەزێڕ چنراو دانیشتوون ڕوو بە ڕووی یەکتر، چەند مێر منداڵێکیان بەسەرەوە دەگەڕێن _بۆ خزمەت کردن_ کە هەر بە منداڵی دەمێننەوە، بە پەرداخی خاڵی و گۆزە و پێکی خواردنەوەوە، نەژانە سەری پێ دەگرن وە نە پێی سەرخۆش دەبن _وەك شەڕابی دنیا_ وە لەوێدا _هەیانە_ هەر چەشنە میوەیەك ئیشتیای بکەن، وە هەر جۆرە گۆشتێکی پەڕەور کە دڵیان بی خوازێ، وە _لەبەهەشت دا هەیە_ ئافرەتی سپی و چاو گەورە و قەشەنگ، هەر دەڵێی مرواری نێو سەدەفن، ئەوە پاداشتی ئەو ڕەفتار و کردارانەیان بوو کە لە دنیادا دەیان کرد، بەهەشتی‌یەکان لەوێدا قسەی پڕ و پووچ و بێ بایەخ و ناشیرین نایستن، بێجگە لە سەلام کردنی پەیتا پەیتا.

٥- پێغەمبەر ﷺ لە وەسفی بەهەشتێدا گوتوویەتی: ((فیها ما لاعین رأت ولا اذن سمعت ولا خطر علی قلب بشر))[2] واتە : لە بەهەشتێدا هەیە نیعمەت گەلێك کە نەهیچ چاوێك دیتوویەتی وە نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە بەسەر دڵی هیچ ئینسانێك دا هاتوە.

٦- خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ(٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً(٢٨)فَادْخُلِي فِي عِبَادِي(٢٩)وَادْخُلِي جَنَّتِي..﴾[3] .

---

(١) الواقعة : ١٥-٢٦ .

(٢) متفق علیه .

(٣) الفجر : ٢٧ تا کۆتایی .



Scanned by CamScanner

یانی: ئەی نەفسی هێدی و ئارام گرتوو ـ بە یادی خوا ـ بگەڕێوە لای پەروەردگارت تۆش لەو ڕازی و ئەویش لە تۆ ڕازییە، دەبچۆ نێو بەندە ڕاستەقینەکانم و بچۆ نێو بەهەشتەکەمەوە.

٧- هەڵبەتە ئێمەی ئینسانی کەم و کەسر ناتوانین تەعبیر لە ناز و نیعمەتەکانی بەهەشتی بەرین بدەینەوە و کۆتایی بە باس کردنی بێنین ئەما بەهەرحاڵ بە ناچاری وازی لێ دێنین دوای ئەوەی سەرتۆپی ناز و نیعمەتەکانی بەهەشتی ڕازاوە باس دەکەین کە بریتی‌یە لە : بە دیداری خوادا شاد بوون!

بەڵێ پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢) إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴾[1].

واتە: لەو ڕۆژەیدا ـ ڕۆژی دوایی ـ چەند ڕوویێکی پرشنگدار و گەشاوە هەن سەیری پەروەردگاریان دەکەن!

ئێستا کە تا ئەندازەیەک زانیمان تاقمی یەکەم ژیانیان چۆنە و گوزەرانیان چی‌یە با سەرێکی تاقمی دووەمیش بدەین .

تاقمی دووەم دانیشتووانی دۆزەخی پڕ ئێش و ژان:

١- خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ (١٩) يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ (٢٠) وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ (٢١) كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ (٢٢) ﴾[2] .

---

(١) القيامة : ٢٢-٢٣ .

(٢) الحج : ١٩ - ٢٢ .



Scanned by CamScanner

واتە : ئەمانە دوو تاقمن لە ئاقار پەروەردگاریان دا دژایەتی‌یان هەیە، هەرچی کافرەکانن جل و بەرگیان لەئاور بۆ بڕاوە، کانزا و ئاوی گەرم و کوڵیویان بەسەر سەردا دەرژێنرێ، پێست و هەناویان پێ‌ی دەتوێتەوە، سەر بارەش قەمچی ئاسنین یان هەیە، هەر کە ویستیان لێ‌ی بچنە دەرێ بەداخ و پەژارەوە دەگەڕێنرێنەوە نێوی و _پێیان دەگوترێ_ بیچێژن سزای سووتێنەر.

٢- لە جێیەکی‌دی‌دا دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ (٤١) فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ (٤٢) وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ (٤٣) لَا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ (٤٤) إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ (٤٥) وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنْثِ الْعَظِيمِ (٤٦) وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ (٤٧) أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ (٤٨) قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ (٤٩) لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ (٥٠) ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ (٥١) لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ (٥٢) فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ (٥٣) فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ (٥٤) فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ (٥٥) هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ (٥٦)﴾[1].

واتە: برادەرانی چەپە، برادەرانی چەپە چین ؟! لە نێو گڕە بایەکی سووتێنەر و ئاوی کوڵاوو داغ و سێبەری دووکەڵی‌ دان، نە فێنکە و نە سوودی هەیە ئەوانە لە پێش دا _واتە لە دنیادا_ لە ژیانی پڕ لەزەت و ڕابواردن دا بوون، وە مرچەم بوون لەسەر تاوانی گەورە _بێ بڕوایی_ وە دەیان گوت ئایا ئەگەر مردین و بووینە خۆڵ و ئێسک و پرووسک ئایا زیندوو دەکرێینەوە؟ ئایا باب و باپیرانیشمان ؟! پێیان بڵێ ئەوانەی

(١) الواقعة : ٤١ - ٥٦ .

هەوڵی و ئەوانەی دوایی تێکڕا کۆ دەکرێنەوە بۆ کاتێکی دیاری کراو لە ڕۆژێکی تەرخان کراودا، ئینجا ئێوە ئەی سەر لێ شێواوە بێ بڕواکان، لە درەختی زەقووم[1] دەخۆن و ورگی لێ داخنن، ئینجا ئاوی داغی لەسەر دەخۆنەوە، وەك خواردنەوەی ئەو حوشترانەی تووشی نەخۆشی (هیام)[2] بوون، ئەوەیە میواندارى لێ کرانیان لە ڕۆژی دوایی‌دا !

٣- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((لو أن دلواً من غسّاقٍ أُهريق في الدنيا لأنتنَ اهل الدنيا))[3]. یانی ئەگەر دۆلکەیەك لە کێم و زووخاو _کە خۆراکی دۆزەخی‌یەکانە_ بڕژێنرێتە نێو دنیاوە هەموو خەڵکی دنیا بۆگەن دەبن و دەڕزن.

١- دیسان خوای باڵا دەست فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا (٢١) لِلطَّاغِينَ مَآبًا(٢٢) لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا(٢٣) لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا(٢٤) إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا (٢٥) جَزَاءً وِفَاقًا (٢٦) إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَابًا(٢٧) وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا(٢٨) وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًا (٢٩) فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا (٣٠)﴾[4].

یانی: دۆزەخ خۆی مەڵاس داوە، بۆ یاخی بوان شوێن و ماوایە، هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، تێیدا ناچێژن هیچ جۆرە فێنکی و

(١) درەختی زەقووم بەرەکەی زۆر تاڵ و ناخۆشە و ناو خوازە و سووتێنەریشە.

(٢) (هیام) جۆرە نەخۆشییەکە تووشی حوشتر دەبێت، کە بە هیچ شتێك تێراو نابێ و دایم دەردم تینوویە، (هیم) پش کۆی (هیماء) ە .

(٣) (احمد) و (ترمذي) ڕیوایەتیان کردوە.

(٤) النبـا : ٢١-٣٠ .



Scanned by CamScanner

خواردنەوەیەك، بێجگە لە ناوی داغ و کێم و زووخاو، ئەوە سزایەکی پڕ بە پێستە، چونکە ئەوان بڕوایان بە لێ پرسینەوە نەبوو، وە بڕوایان بە ئایەتەکانی مە نەدەکرد ئێمەش هەموو شتێکمان ژماردوە و نووسیومانە لەو کردار و ڕەفتارانەیان کە لە دنیادا کردوویانە، دەبچێژن بۆتان زیاد ناکەین مەگەر سزا و ئەشکەنجە!!

٢- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان اهون اهل النار عذاباً یوم القیامة لرجل یوضع فی أخمصَ قدمیه جَمْرتان یغلي منهما دماغه، ما یری ان احدا شر منه عذاباً، وانه لأهونهم عذاباً))[٣] .

واتە: ئەو کەسەی کە بە سووك ترین سزای خەڵکی نێو ئاگری دۆزەخ ئازار دەدرێت لە ڕۆژی قیامەت دا پیاوێکە دوو پشکۆی دەخرێنە بن هەردوو پێی مێشکی پێیان دەکوڵێ، ئەو کابرایە پێی وایە هیچ کەسێك سزای لەو بەدتر و بەتین تر نیە، بەڵام ئەو لە هەموویان ئەشکەنجەی سادەتر و کەمترە.

ئەوەش بەر کوڵێك بوو لە حاڵ و باڵ و گوزەرانی خەڵکی دۆزەخ بەڵام وانەزانن کە لە بنی کدوومان داوە و هەموو شتێکمان لەم بارەوە خستۆتە ڕوو.

**تاقمی سێیەم : دانیشتروانی (أعراف)ن**

ئێستاش با سۆراغێکی دەستەی سێیەم بکەین کە دانیشتروانی (اعراف)ن، خوای دادگەر لە سوورەتی (اعراف)دا بە درێژی باسی ئەم دەستەیەمان بۆ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَنْ قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ فَأَذَّنَ

---

[٣] (بخاری) و (مسلم) ڕیوایەتیان کردوە.



Scanned by CamScanner

مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَنْ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ (٤٤) الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَ يَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُمْ بِالآخِرَةِ كَافِرُونَ (٤٥) وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى الأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلاًّ بِسِيمَاهُمْ وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ (٤٦) وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لاَ تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٤٧) وَنَادَى أَصْحَابُ الأَعْرَافِ رِجَالاً يَعْرِفُونَهُمْ بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَى عَنْكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ (٤٨) أَهَؤُلاَءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لاَ يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لاَ خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلاَ أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ (٤٩)﴾[1] .

یانی: دانیشتووانی بەهەشتی دانیشتووانی دۆزەخیان بانگ کرد، کە ئێمە ئەوەی پەروەردگارمان گفتی پێ دابووین دەستمان کەوت بە ڕاستی، جا ئایا ئێوەش ئەوەتان دیت کە خوا گفتی پێ دابوون بە تەواوی؟! گوتیان بەڵێ، ئینجا بانگ کەرێك بانگی کرد لە نێویان دا کە نەفرینی خوا لەسەر زاڵمانە، ئەوانەی ڕێ لە ڕێبازی خوا دەگرن و دەیانەوێ بێ شێوێنن و بڕواشیان بە ڕۆژی دوایی نیە. وە لە نێوانیان _نێوان بەهەشتیان و دۆزەخی یان_ دا بەربەستێك هەیە_ کە لێکی جوێ کردوونەوە_ لەسەر ئەعرافیش _ کە بریتی یە لە کەنارەکانی ئەو بەربەستەی نێوان بەهەشت و جەهەندەم_ پیاوانێك هەن هەموویان دەناسن_ چ بەهەشتی بن چ دۆزەخی_ بەهۆی سەرو سیمایانەوە، وە ئەو تاقمەی سەر (اعراف) بانگی بەهەشتی یەکان دەکەن دەڵێن: سەلامتان لێ بێت ئێستا ئەوانەی سەر (اعراف) نەچوونە بەهەشتی ئەما بەتەمانە بچن. بەڵام وەختێك چاویان پێ وەردەگێڕرێتە لای دانیشتووانی دۆزەخ دەڵێن: پەروەردگارمان مەمان گێڕە

[1] الأعراف :٤٤-٤٩ .

لە پێڕی زاڵمان، وە دانیشتووانی (اعراف) بانگی چەند پیاوێکیان کرد کە بەسەر و سیما دەیان ناسین گوتیان: کوا دارایی و خۆ بە زل زانینتان چ دادێکی دان؟! ئایا ئەوانە بوون _ئەو بڕوادارانە_ کە سوێندتان دەخوارد خوا هیچیان ناداتێ و ڕەحمیان پێ ناکات، _ ئینجا بەهەشتییەکان دەڵێن _ بچنە نێو بەهەشتێ نەترستان لەسەرە و نە خەم و خەفەت تان هەیە !!
ئەوەش گوزەرانی تاقمی سێیەمە کە توێژەرەوانی قورئان زۆربەیان ڕایان وایە لە دواییدا دەچنە نێو بەهەشتێ.ئینجا نۆرە گەیشتە سەر تاقمی چوارەم.

## تاقمی چوارەم : موسڵمانانی تاوانبار:

وەك پێشتر گوتمان موسڵمانان دەکرێنە دوو دەستە لە ڕۆژی دواییدا، دەستەیەکیان بێ دەردی سەر دەچنە نێو بەهەشتی بەرینەوە و هەر کەسە بە پێی تێکۆشان و هەوڵ دانی خۆی پلەیەکی دیاری کراوی خۆی دەدرێتێ، دەستەی دووەمیان ئەوانەن کە تاوان و سەرپێچی‌یەکانیان زیاترن لە کردەوە و ڕەفتارە ئیسلامی‌یەکانیان و دەبرێنە نێو دۆزەخ و هەر کەسە بە گوێرەی کەمی و زۆری تاوانەکانی سزا دەدرێ و دوایی ڕزگاری دەبێت جا یان درەنگ یان زوو.
پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی : ((أتدرون من المفلس ؟ قالوا: المفلس فينا من لا درهم له ولا متاع، فقال: ان المفلس من امتي من يأتي بصلاة و صيام وزكاة، و يأتي وقد شتم هذا وقذف هذا، وأكل مال هذا وسفك دم هذا، و ضرب هذا، فيُعطى هذا من حسناته، وهذا من حسناته، فان فنيت حسناته قبل أن يُقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار))[1].

---

(١) (مسلم) ڕیوایەتی کردوە.



Scanned by CamScanner

یانی: دەزانن مایە پووچ کێیە؟ گوتیان ئەی پێغەمبەری خوای مایە پووچ لە نێو ئێمەدا کەسێکە ماڵ و دارایی نیە، گوتی : مایە پووچ لە ئۆمەتی من ئەو کەسەیە کە ڕۆژی قیامەتێ دێت نوێژ و ڕۆژوو زەکاتی پێیە بەلام جنێوی بەم داوە و بوختانی بەوەوە کردوە و ماڵی وی خواردوەو خوێنی وی ڕشتوە و لەوی داوە، ئینجا لە چاکە و خێرەکانی دەدرێت بەم و بەو هەتا ئەگەر چاکە و خێرەکانی تێیان هەڵنەهێناو بەر لەوەی مافەکانی لەسەر لابچن تەواو بوون، لە تاوانی وان ـ خاوەن مافەکان ـ وەردەگیرێ و فرێ دەدرێنە سەر کابرای تاوانبار ئینجا بە تاوانەوە فرێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخ .

کەواتە ئەگەر بێت و ئینسان نوێژ و ڕۆژوو زەکات و ئاکاری ئیسلامیانەی نەبێت ئەوە بە موسڵمان حسێب ناکرێ و نابێ وابزانرێ کە ئەویش هەر وەك بابای موسڵمانی مایە پووچ (مفلس) حسابی بۆ دەکرێت و دوای تێهەڵدان و پێ دادانێکی زۆر یان کەم ڕزگاری دەبێت، نەء چونکە وەك گوترا ئەو کەسە موسڵمان نەبووە و وەك موسڵمانانیش مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت . لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتی پێنجەم دا باشتر ئەم باسە دەتوێژینەوە.

بەڵێ خوێنەری ئازیزم !

ئەوەیە ئەنجامی ڕۆژی دوایی جا لە خوای بەخشەر دەپاڕێمەوە کە بمان گێڕێ لەوانەی لە کێڵگەی ژیانی دنیایان دا تۆوی کردار و ڕەفتاری دڵگیری ئیسلامیانە و خواپەرستانە دەچێنن و لە ڕۆژی دوایی دا بە بەروبوومی درەختی ئاکار و ڕەفتاری خوا پەرستانەیان شاد دەبن و دەڵێن: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ.. ﴾[1] سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێنمایی کردین بۆ ئەوە و ئەگەر ڕێنمایی نەکردباین بە ئاکام نەدەگەیشتین.

---

(١) الاعراف : ٤٤ .



Scanned by CamScanner

# گەوهەری سێیەم

## چۆن دەی سەلمێنین کە ڕۆژی دوایی شتێکی حەتمی و پێویستە ؟!

لە دوو گەوهەری پێشوودا ڕوون بۆوە کە ئەم ژیانەی دنیا دوایین قۆناغی ژیان نیە و قۆناغی تریشی بەدوادا دێن، بەڵێ ئەم ژیانەی ئێستامان پەردەیەکە لە شانۆگەرییەک کە دوای مردن و تێك چوونی دنیا پەردەکانی دیکەشی یەك یەك بە دوادا دێن، لەم گەوهەرەش دا سوورێك بە خامە دەدەین بە دەوری سەلماندنی دیاردەی (قیامەت)دا.

پێشەکی با بچینە خزمەت گوتاری خوا بزانین لەم بارەوە چ دەفەرموێ:

١- پەروەردگار لە سوورەتی (النحل) دا فەرموویەتی: ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لاَ يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ بَلَى وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ (٣٨) لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ (٣٩) إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٤٠)﴾[١]

یانی: گاورەکان سوێندێکی گەورەیان بە خوا خوارد کە ئەوانەی دەمرن زیندوویان ناکاتەوە، با _چونکە_ گفتی ڕاستەقینەی داوە ئەمما زۆربەی خەڵکی نازانن، زیندوویان دەکاتەوە بۆوەی ئەو شتەی تێیدا ڕای جوێ جوێیان هەبوو بۆیان ڕوون کاتەوە، وە بۆوەی گاورەکان بزانن کە لە دنیادا درۆیان دەکرد، هەر شتێکیش بمانەوێ پێی دەڵێین: (ببە) ئەویش دەبێت.

لێرەدا پەروەردگار چوار بەڵگەی بەهێزی هێناونەوە بۆ پووچ کردنەوەی ئیددیعای گاورەکان کە گوایە زیندوو ناکرێنەوە:-

---

(١) النحل : ٣٨-٤٠ .



Scanned by CamScanner

١_ ﴿ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا﴾ خوا گفتی داوە و پێویستە گفت و پەیمانەکەی بەرێتە سەر، چونکە ئەو بۆ خۆی فەرمانمان پێ دەکات کە گفت و پەیمانمان بپارێزین ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾[1]، پەیمانتان بەجێ بێنن چونکە لێ پرسینەوەی هەیە، جا چۆن شتێك بە ئێمەی بڵێ بیکەن بۆ خۆی پشت گوێی دەخات؟ نەخێر فەرمانی خوا بەجێیەو بەڵێنی خۆی دێنێتە دی .

٢- ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ..﴾ بۆ وەی بۆیان _بۆ موسڵمانان_ ڕوون کاتەوە ئەوەی کە تێیدا ناکۆکی‌یان هەیە و ڕایان جۆیێ جۆیێیە دەربارەی. بەڵێ زۆر جاران موسڵمانان دە نێو خۆیان دا بۆچوونی جۆیێ جۆیێ‌یان دەبێ و لەسەر هێندێك مەسەلان ڕێك ناکەون و ناکۆکی‌یان دەکەوێتە نێوانەوە _هەڵبەتە ناکۆکی بیر و ڕاو بۆچوون لە قالبێکی برایانەدا _ئەوەش دەبێتە هۆی دروست کردنی گرفت و کرێ کوێرە لە دڵیاندا، بەڵام لە ڕۆژی دوایی‌دا خوا هەموو شتێکیان بۆ ڕوون دەکاتەوە و گرفت و گرێ کوێرەکانی دڵیان نامێنن[2].

٣- ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ﴾ وە بۆوەی گاورەکان بزانن کە لە دنیادا درۆیان دەکرد _کە دەیان گوت خوا نیەو ئیسلامەتی ڕاست نیە و زیندوو ناکرێینەوە و....هتد _. بە واتایەکی تر بۆ وەی گاور و لامەزەبەکان بە سزای تاوانەکانیان بگەن.

(١) الإسراء : ٣٦ .

(٢) دەشگونجێ کە مەبەست لەوانەی کەوتوونەتە ڕاجیایی بەوە کافران بن کە لەگەڵ موسڵمانان دا کێشمە مشت و مڕیان هەبوو دەربارەی ڕۆژی دوایی و ..هتد .



Scanned by CamScanner

٤- ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ.. ﴾ ئێمـە هـەر کاتێك شتێکمان ویست پێمان گوت: ببە دەبێت.

لە سێ حاڵی پێشوودا دەرکەوت کە پاڵنەر (دافع) هەیە بۆ هاتنـە دی ڕۆژی دوایی کە دەتوانین بڵێین ئەو پاڵنەرە بریتی‌یە لە چەسپاندنی دادگەری "العدالە" لەم حاڵەش دا دەردەکەوێ کـە وێـڕای هـەبوونی پاڵنەر بەربەست (مانع)یش نیە لـە ڕێی هاتنـە دی ڕۆژی دوایـی‌دا، شتێکی بەڵگـە نەویستیـشە کـە هـەر شـتێك پاڵنـەری هـەبێ و چ بەربەستێکیشی لە ڕێدا نەبێ هاتنە دی حەتمی و فەرزە.

٣- لە سوورەتی (نبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ (١) عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ (٢) الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ (٣) كَلَّا سَيَعْلَمُونَ (٤) ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ (٥) أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا(٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا (٧) وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا (٨) وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا(٩) وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا(١٠) وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا(١١) وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا(١٢) وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا (١٣) وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا(١٤) لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا(١٥) وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا(١٦) إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا ﴾[1] .

یانی: لە چ پرسیار لە یەکتر دەکەن، لە کارەساتی گەورە (قیامەت)، کـە تێیدا جوێ جوێن، با واز بێنن دوایی دەزانن، _کورە_ بـا واز بێـنن دوایی دەزانن! ئایـا زەویمـان نـەکردوە بـە لانـك ؟ وە شـاخەکانمان نەکردوە بە گولمیخ، وە لە نێر و مێیان نەمان خولقاندوون؟ وە نوستن تانمان نەکردۆتە هۆی سانەوە؟ وە شەو گارمان نەکردۆتـە پۆشـاك؟ وە ڕۆژگارمان نەکردۆتـە تـاق کـار و کاسـبی؟ وە حـەوت _ئاسـمانی_

(١) النبأ : ١-١٧ .

پتەومان لە سەرووتانەوە دروست نەکردوون؟ وە چرایەکی فرە تیشك دەرمان نەهێناوەتە دی؟ وە لە هەورە (متوربە بووە) گوشراوەکان ئاوی زۆر و بەرێژنەمان نەناردۆتە خوارێ؟ تا وەکو دانەوێڵە و ڕووەك و باغی چڕ و پڕی پێ بروێنین؟ ....بە ڕاستی ڕۆژی لێك هەڵاوێردنێ _چاك و خراپان_ کاتێکی دیاری کراوی هەیە.

ئێستا کە کاڵە ڕووشێنێکی مانای ئەم ئایەتانەمان کرد با جارێکی دی ئەما بە وردی تێیان بفکرین:

خوای مەزن لە پێنج ئایەتی هەوەڵی‌دا دوای ئەوەی بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لەو شتە کرد کە گاورەکان دەنێو خۆیان دا قسە و باسی لێ دەکەن کە بریتی‌یە لە کارەساتی گەورە (قیامەت) و خستیە ڕوو کە بۆچوونی جوێ جوێیان هەیە لە ئاقاری‌دا و، ئینجا دوو جار لەسەر یەك هەڕەشەی لێ کردن و پێی ڕاگەیاندن کە لە دوایی‌دا هەموو شتێکیان بۆ دەردەکەوێ، بەڵێ دوای ئەوانە یەکسەر وازی لە مەسەلەکە هێنا و چۆ نێو مەسەلەیەکی دیکەوە کە بە ڕواڵەت چ خزمایەتی لەگەڵ ئەوەی پێشووی‌دا نێ ئەما لە ڕاستی‌دا وا نی‌یە و ئەو باسەی کە یازدە ئایەتی دوایی بۆ تەرخان کردوە هەر هەمان مەسەلەیە کە پێنج ئایەتی هەوەڵی لێی دەدوێن. ڕەنگە بپرسی چۆن؟!

ئەگەر دەتەوێ بزانی گوێ بگرە: پەروەردگاری مەزن دوای ئەوەی هەڵوێستی بێ بڕوایانی خستە ڕوو سەبارەت بە ڕۆژی دوایی و دەری خست تا چ ڕادەیەك چێرە گرتوو ولاملن وای بە باش زانی دەستی ئەوان بێ بڕوایان بگرێ‌ و نەختێك بە نێو بڕێك لە تابلۆ دڵبزوێنەکانی بوونەوەردا بیان گێڕێ، بەشکم خوا بکا تۆزێك سەر لە قەپێلکی خۆیان بێننە دەرێ و نەختێك سەر بڵند کەن و



Scanned by CamScanner

ئاسۆی زەینیان خۆی لێك وەكێشن و بەشكم ئەوە خوایە لە كەرێ شەیتانی بێنە خوارێ و شتێك بەشتێك بكەن.

بەڵێ خوای مەزن دەیەوێ بە كافرەكان بڵێت _هەڵبەتە بە پێی بۆچوونی ئێمە_ كە گومان كردنتان لە مەسەلەی ژیانەوەدا شتێكی نا ماقووڵ و بێ جێیە چونكە سەیری هەر كام لە دیاردە سروشتی‌یەكانی بوونەوەر بكەن بێجگە لە وردەكاری و ڕێك و پێكی و كارامەیی چیدی بەدی ناكەن، جا كەیفێ خۆتانە، سەیری زەوی دەكەن سەیری شاخەكان دەكەن، لە دیاردەی نێر و مێ‌یەتی ورد دەبنەوە، دیقەت لە دیاردەی نوستن دەگرن، دە شەوگارەوە ڕادەمێنن، لە ڕۆژگار دەفكرن، ئاسمانەكان دەكەنە جێی سەرنج، لە دیمەنی هەور و باران بارین ورد دەبنەوە، لە ئاقار خۆردا هەڵوەستە دەكەن، یان لە ئاقار دانەوێڵە و ڕووەك و باغ و باغات دا...لە هەر كام لەمانەدا بێجگە لە وردەكاری و دەست ڕەنگینی و كاریەجێیی چیدی بە چاو نابینن، جا باشە هەیاران مادام بوونەوەری خوا سەر لەبەری ڕێك و پێكی و وردەكاری و شارەزایی تێدا ڕەنگ داتەوە چۆن دەبێ ژیانی ئینسانەكان كە بەشێكن لەم بوونەوەرە ، نارێك و پێك و بێ سەرەو بەرە بێت؟!

چۆن دەبێ ئەوانەی لە ژیانیان دا سەرگەرمی چاكە كردن و خزمەت كردن بوون بە خوا و خەڵك ، وەك ئەوانە كۆتایی بە ژیانیان بێ كە بە بەراوە ژووی وانەوە ژیاون و دایم و دەرەم دڵیان پڕ بووە لە فێڵ و تەڵەكە و جامبازی بەرامبەر بە خەڵك و ئەوەی بە خەونیش نەیان دیوە چاكە و خزمەت بووە؟! ئاخر چ خوا بەردارە ئەو موسڵمانانەی لە پێناوی ڕازی كردنی خوادا و پاراستنی بەرژەوەندی میللەت دا لەگەڵ نەفس و ئارەزووەكانی خۆیان دا بەردەوام سەرگەرمی كێشە و ملانە گرتن و دەبەرێك ڕاچوون بوون وەك ئەوانە



Scanned by CamScanner

حیسابیان بۆ بکرێ کە نەفس ونارەزووەکانیان وەك گورگی هار بەرهەڵدا کردوەو چیان پێ خۆش بووبێت کردبێتیان و بێ دڵی یە خۆیان نەکردبێ و گوێیان نەدابێتە فەرمانی خوا وپێغەمبەر ﷺ و بەرژەوەندی خەڵك و بنچینە ڕەوشت و ئەخلاقی یە بەرزەکان؟!

کەواتە هەروەك چۆن لە بوونەوەردا نارێك و پێکی و بێ سەرەو بەرەیی نابینرێ نابێ و مەحاڵە لە ژیانی ئینسانیش دا ببینرێ، لە هەموانیش ڕوونە کە ژیانی ئینسان نارێك و پێکی تێدایە لە دنیادا چونکە وەك گوتمان ڕەش و سپی و چاك و خراپ وەك یەك دەمرن و کۆچ و کۆچبار تێك دەنێن، مادام وایە پێویستە قۆناغێکی تر هەبێت لە ژیانی ئینسان دا کە ئەم ناتەواوی یەی تێدا پڕ بکرێتەوە و دادگەری تێدا بچەسپێ و چاکان (خواپەرستان) بە پاداشی چاکی یان و بەدان (دوور لە خوایان) بە سزای خراپی خۆیان بگەن.

هەر بۆیەش یەکسەر دوا بە دوای خستنە ڕووی ئەو یازدە تابلۆیە لە کتێبی سروشت، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا﴾[1] بە ڕاستی ڕۆژی لێك هەڵاوێردنێ (چاك و خراپان) کاتێکی دیاری کراوی هەیە.

ئێستا کە لە باغی والآی قورئان ئەم دوو گوڵەمان چنی و کردمانە بەڵگە بۆ سەلماندنی ڕاستی یەتی زیندوو بوونەوە با سەیرێکی باخچەی ژیریش بکەین و بزانین لەوێش شتێکمان دەسگیر نابێت!

خوێنەری بەڕێز!

ژیری و ڕیۆدانت بکە بە دادگەر و تێ فکرە:

ئایا ماقوڵە ئەو هەموو ڕەحمەت و سۆز و بەخشندەیی یەی کە خوا هەیەتی

(1) النبـا : ١٧.



Scanned by CamScanner

هەر هێندەی لێ هەڵوەرێ کە لە ژیانی دنیادا دەبینرێت؟!

ئێمە کە دەڵێین سیفەتەکانی خوا سنووریان نیەو زۆری ناتوانێ سنوورێکیان بۆ دانێت، بۆ وێنە سیفەتی بەخشندەیی و بەزەیی، دەنگونجێ بڵێین ژیان تەنیا ئەم ژیانەیە و هیچی تر؟!

نەء دەزانی بۆچی؟ چونکە مادام خودا خاوەنی سۆز و بەزەیی و توانا و دەسەڵاتێکی بێ سنوور بێت غەیری خۆشی هەمووی حەوجێی بن، دەبێ ئەو ناز و نیعمەتانەی بە غەیری خۆی دەیان بەخشێ دیسان بێ سنوور بن، چونکە ئەگەر وا نەبێت ـ پاکی بۆوی ـ ناچارین بڵێین: یان دڵ ڕەقی و بێ سۆزی پێشان داوە، یان ڕژدی !! شکی تێدا نیە هەر کامێکیشیان بڵێی لە پەروەردگاری مەزن ناوەشێتەوە، (ولله المثل الأعلى في السموات والأرض).

کەواتە دەبێ لە دوای ئەم ژیانە ژیانێکی تریش هەبێت کە دابارین و هەڵڕژانی سۆز و بەزەیی و نیعمەتەکانی خوای تێدا بەردەوام دەبێت، چونکە ژیانی دنیا ناگونجێ بڵێین خوا هەموو ڕەحمەت و سۆز و میهرەبانی خۆی تێدا ڕەکار خستوە، بە تەعبیرێکی دی ڕەحمەت و میهرەبانی خوا هەر هێندەی لێ چاوەڕوان ناکرێ کە لەم ژیانەدا دێتە بەر چاوان و پێویستە ژیانێکی تریش هەبێت نەوەندە ناز و نیعمەتەی تێدا بن کە لە ڕەحمەت و بەخشندەیی خوا بوەشێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویستیش لەم بارەوە فەرموویەتی: ((ان الله تعالى خلق يوم خلق السماوات والارض مئة رحمة، كل رحمة طباق ما بين السماء و الارض، فجعل منها في الارض رحمة فبها تعطف الوالدة على ولدها والوحش و الطير بعضها على بعض، فاذا كان يوم القيامة اكملها بهذه الرحمة))[1].

---

(١) (مسلم) ریوایەتی کردوە.



Scanned by CamScanner

یانی: خوای بەرز لەو دەمەی‌دا کە بوونەوەری خولقاند سەد بەزەیی‌شی هێنایە دی، هەر یەکێکیان پڕ بە پڕی نێوان ئاسمان و زەوی‌یە، لەو سەدە یەکێکیانی لەسەر زەوی دانا، بەویان دایك بەزەیی بە کۆرپەکەی‌دا دێتەوە و جانەوەر و پەڕەوەر سۆز بەرامبەر یەکتر دەنوێنن، کاتێك قیامەت هات هەر سەدی دەخاتە کار.

جا خوایە بمان گێڕی لەوانەی چ لە دنیا و چ لە دوارۆژدا پشکیان لە زۆربەی بەزەیی و سۆزت دەکەوێ.

خوێنەری ئازیزم !

ئەوە بەرچاویی‌یەك بوو سەبارەت بە سەلماندنی ڕاستیەتی ڕۆژی دوایی هیوادارم بایی قەناعەت پێ هێنان و ڕەواندنەوەی تەم و مژی شك و گومانانی کردبێت.

## گەوهەری چوارەم

## ئاو و تەئسیری بڕوا بوون بە پاشەڕۆژ لە ژیانی ئینسان دا

دەتوانین لە چەند خاڵێك دا کاریگەریەتی بڕوا بە پاشەڕۆژ بوون بخەینە ڕوو:

یەکەم: پەیدا بوونی ئۆخژن و ئارامی لە دڵ دا : ئینسانێك بڕوای بە زیندوو بوونەوە ودوا ڕۆژ نەبێت، ناتوانێ هەست بە ئارامی وئۆخژن بکات لە دڵ و دەروونیدا، چونکە دیاردەی مردن لانی کەم هەر بە چەند ڕۆژێك کەرەتێك وەك دێوە زمەیەك سواری سینگی دەبێ و دەستە و یەخەی دەبێ و

خوڵقوتەی مێشکی دەدات و پێی دەڵێت: وا مەزانە لەبەر دەستانم قوتار دەبی، دەم بۆ دەمێ پتر لەمن وەنیزیك دەكەوی و تاو بۆ تاوێ شەقاوێك بەرەو گۆڕی تاریك وترووك دەنێی و ئەگەر چەنگ بگەیەنیە کەشکەشانی فەلەك ڕۆژێك هەر دێت گیانت لێ دەستێنم دەعەرزیت دێخم و سەربازە چالاکەکانم لە مار و مێروو و مشك و کرم و دووپشك و .... هتد لە جەستەی تەڕ و تازەت بەر دەبن و هەر پچکەی بۆ لایەکی دەبەن و پەرەم پەرەم دەبی !!

بەڵێ دیاردەی مردن بۆ ئینسانی بێ بڕوا و لامەزەب جەزرەبە و سزایەکی دەروونی زۆر سامناکە و ژین لە ئادەمی تاڵ دەکات چونکە بە ڕاستی شتێکی ناخۆشە ئینسان تەنیا ئەوەندە ژیانەی سەر زەوی بژیەت و نەتوانێ دەقیقەیەکی لێ زیاد کات و هەر کاتێك مردن هات تێکەوە بپێچرێ و بچێتە بن گڵی و ئیدی جارێکی دی هەرگیزا و هەرگیز چاوی گەشی بە ژیان هەڵ نەهێنێ !

بەڵام بابای خاوەن بڕوا و ئیمان بە گوێرەی ڕێژەی پتەوی بڕواکەی ترس و سامی مردنی لە کن کەم دەبێت، تەنانەت بڕواداری ڕاستەقینە لەوەی وەولای کەوێ کە لە مردنێ ناترسێت ، بگرە زۆریشی کەیف پێ دێ و بە زەردەخەنەوە باوەشی بۆ دەگرێتەوە و وەك میوانێکی لە دوورڕا هاتوو و ئازیز بەخێر هاتنێی لێ دەکا.[1]

(١) محمد اقبال لەم بارەوە گوتوویەتی :

نشانە مرد مؤمن باتو گویم  که چون مرگش رسید خندان بود

واتە: نیشانەی پیاوی بڕوادارت پێ بڵێم: ئەو کەسەیە کە کاتی مردنی هات بە پێکەنینەوە بمرێ.



Scanned by CamScanner

ئاخر بڕوادارێك بزانێت ژیانی دنیای لە ئاقار ژیانی بەهەشتیدا وەك گرتووخانەوایە ((الدنیا سجن المؤمن))[1] چۆن و بۆدەبێ بە مردنی قەلس و نا سەرسەنگ بێت؟! ئەری کێهەتان دیتوویەتی قوتابی زیرەك و ڕەنج دەر لە وەختی تەواو کردنی تاقیکردنەوەدا ماتەمی و دڵتەنگی دایگرتبێ ؟! ئەیا قوتابی تەمبەڵ و تەوەزەل و سەعی نەکەر ئەشـهەدوبیللا زۆر جـێی خۆیەتی کە لە کۆتایی تاقیکردنەوەدا نێو چاوانی تێك نێ و عـەرزێ بـە چاوان نەبینێ و لەداخ وخەفەتان نانی پێ نەخورێ و خـەوی لێ نەکـەوێ، دەوەڵلا قوتابی زیرەك بابـای موسـڵمان و بـڕوادارەو قوتـابی تەمبـەڵ و بلعیش بابای بێ بڕوا و بێ دینە.

لێرەدا قوڵـە نەزیلەیـەکم هاتـەوە یـاد کـە نـازانم لـە چ کتێبێـك دا خوێندوومەتەوە: دەگێڕنەوە کاتێك خوای بە بەزەیی و کاربـەجێ ویـستی گیانی ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ بکێشێ فریشتەی تەرخان کراوی نارد بوو مەبەستە کە (عزرائیل)ە (علیه السلام) پاش ئەوەی ئیبراهیم لە مەبەستی هـاتنی (عزرائیـل) حـاڵی بـوو پـێی گـوت: بـە پـەروەردگارم بڵـێ: چ خۆشەویستێکت دیتوە گیـانی خۆشەویـستەکەی بکێـشێ ؟ دوای ئـەوەی (عزرائیل) قسەکەی ئیبراهیمی گەیاند بە خـوای زانـا _هەڵبەتـە خـوای گەورە پێش ئەوەی ئیبراهیمیش قسە بکات زانیویەتی چی لە دڵ دایە _، خوای باڵادەست و میهرەبان فەرمووی: پێی بڵێ ئەدی ئەی ئیـبراهیم[2] تۆ چ خۆشەویستێکت دیوە حەز بە چوونە لای خۆشەویستەکەی نـەکات؟!

---

(1) رواه مسلم .

(2) حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بـە (خلیـل الله) خۆشەویـستی خـودا ناوبـانگی دەرکردوە.



Scanned by CamScanner

هەڵبەتە ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) قسەی نەما و عزرائیل ئەو فەرمانەی پێی سپێررا بوو بەجێی هێنا.

بەڵێ بە ڕاستی پەروەردگار ڕاست دەکات کەسێك خوای خۆی خۆش بوێ و پەرێزی خاوێن بێ و بڕوای بە بەهەشت هەبێت و خۆی بۆ ئامادە کردبێت ، مردن و کۆچ کردنی لە کن دەبێتە شتێکی ئاسایی و وەك گەشتێکی خۆشی لە قەڵەم دەدات.

لێرەدا وەڵام دانەوەی پرسیارێك بە پێویست دەزانم کە ڕەنگە خوتخوتەی زۆر دڵان بدات: باشە ئەگەر وایە بۆچی ئینسانی موسڵمان بە زووترین کات خۆی ناکوژێ یان لانی کەم خۆی بە کوشت نادات بەشکم زووتر بچێتە نێو ژیانێکی خۆشترەوە؟!.

دەڵێین: مرۆڤی موسڵمان نیعمەتی ژیان و تەمەن بە گرانبایی‌ترین نیعمەتی خوا دەزانێ و ژیانی دنیا بەکێڵگەی‌دوا ڕۆژ دادەنێ، کەواتە فەرزە لەسەری بە پێی توانای ئەو نیعمەتە بپارێزێ و لەو کێڵگەیەدا شتان بچێنێ چونکە پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴾[1] دوایی لە قیامەتی پرسیارتان لێ دەکرێ دەربارەی نیعمەتەکان. مادام وابێ کەسێك بە خرتوخۆڕایی گەورەترین نیعمەتی خوا زایەکا و بە فیڕۆ بدات ، سەربارەی ئەوەی کە شتێکی بێ ئاقڵانەی کردوە خواشی لە خۆی زیز کردوە و دووچاری سزاش دەبێ.

ئەوە لە سەرێکەوە لە سەرێکی تریشەوە، خۆ ئینسانی موسڵمان وەك بابای بێ دین و لامەزەب و بەرهەڵدا و بێ بەند و بار نیە هەرچی

---

(١) التكاثر : ٨ .

ئارەزووی کرد بیکات، نا چونکە موسڵمان بەندەی خوایە و پەیمانی لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا ﷺ بەستوە کە بە فەرمان و دەستوورەکانیانەوە پابەند بێت، دە یەکێك لە یاساکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئینسان بۆ خۆی، خۆی لە نێو نەبات، وە بە فیڕۆ و بێ هوودە خۆی لە قیس نەدات : ﴿ وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾[1] ، واتە : خۆتان مەکوژن خوا لە گەڵتان بە بەزەییە. ﴿وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾[2] واتە : بە دەستی خۆتان خۆ مەفەوتێنن.

بەڵێ موسڵمان هەموو شتێکی بۆ دیاری کراوە و بۆی ڕوون کراوەتەوە کە لە چ کاتێك دا بۆی هەیە لە پێناوی خوادا خۆی بە کوشت دا و لە چ کاتێك دا خۆ بە کوشت دان لە ڕێی ئیسلام دا فەرزە و....هتد.

پوختەی قسان ئەوەیە کە بڕوا بوون بە دوا ڕۆژ وزە و هێزێکی بێ پایان لە دەروونی ئادەمی‌دا دەڕەخسێنێ و دڵی پڕ دەکات لە تیشکی هیوا و ئاوات و بڕوا بە خۆ بوویی و مەردی و پیاوەتی و ئازایەتی و....هتد و هەوری ڕەش و دزێوی ترس و لەرز و نائومێدی و بێ هیوایی لەسەر شاری دڵی ئاوەدانی بە یادی خوا و دوا ڕۆژێکی خۆش و پڕ لە شادی و بەختەوەری دەڕەوێنێتەوە.

دووەم : بڕوا بە دواڕۆژ بوون ئاور و مەشخەڵی شۆڕشی ئازادیخوازانەیە دژی هەر چەشنە زوڵم و زۆر و بێ دادی و مل هوڕی و دیکتاتۆری یەك دەزانن ، بۆ ؟!.

---

(١) النساء : ٢٩.

(٢) البقرة : ١٩٥ .



Scanned by CamScanner

چونکە میللەتێك ئیمانی هەبێت بەوە کە ئەم ژیانەی دنیا شوێنی تێدا تاقی کرانەوەیە و شانۆی تێدا نواندنی شانۆگەری ژیانی ئینسانەکانە و بۆ وەی ئەرەخسێنراوە بە هەتا هەتایە بەرقەرار بن و دوای بەسەر چوونی کاتی دیاری کراو (اجل مسمى) تەختە و مەختە و پەردە و کورسی و کەل و پەلەکانی تری ئەو شانۆیە تێکرا تێکەوە دەپێچرێن و هەڵدەگیرێن و سەر لە نوێ شانۆیەکی تریان پێ دروست دەکرێ، بەڵێ ئینسانێك یان میللەتێك بڕوای وابێت ئەستەمە مەودا بە چ زاڵم و تاغوتان بدات خۆیان لەسەر بکاتە نۆ و نیوو بە دڵخوازی خۆی بیان ئاژوێ، ئەتەوە و گەلێك بە ڕاستی بڕوا بە دوا ڕۆژیان لە دڵ دا چەسپا بێت و بزانن کە ((ما الدنيا في الآخرة الا مثل ما يجعل احدكم اصبعه في اليم فلينظر بم يرجع))[1] ! واتە: دنیا لە چاو (بەهەشت) دواڕۆژدا وەك ئەوە وایە یەکێکتان قامکی بخاتە نێو دەریا دەبا سەیری کات ئەندازەی ئەو ئاوەی بە پەنجەیەوە هاتوە چەندە لە چاو ئاوی دەریا. (ژیانی دنیاش لە چاو بەهەشتێ ئاوایە) میللەتێك ئەوە بزانێت چۆن لە پێناوی چوار پارووە نانی چەور و نەرم و سێ شەو جێگای خۆش و گەرم خۆیان ڕوو زەرد و شەرمەزاری لای خوا دەکەن و ئەستۆ بۆ زۆردار و فیرعەونان کەچ دەکەن و ژیانی بەهەشتێ لە قیس خۆ دەدەن؟!!

ئەمما ئینسانێك یان میللەتێك پێی وابێ کە ئەم ژیانەی دنیا تاقە دەرفەتە هەڵکەوتوە و قەت جارێکی دی وای بۆ ڕێ ناکەوێت و ڕۆژی دەژینێ ناکەوێ، پێم وابێ گەلێك گەلێك جێی خۆیەتی کە بە هەر نرخێك بووە و بەهەر جۆرێك بووە چەنگیان لەم ژیانە کەمە قایم کردوە و نەیان هێشتوە بە خۆڕایی بڕوات و لە دەستیان بچێ.

---

(١) (مسلم) ڕیوایەتی کردوە.

ئینجا، شکی تێدا نیە کە واقیعی ژیانی ئەم جۆرە ئینسان و میللەتانە هەر ئاوا بووە و مەگەر چۆنەکایی دەنا ڕووی نەداوە لەسەر زوڵم و زۆرداری بێدادی چەوساندنەوە وەدەنگ هاتبن و خۆیان فیدا کردبێت.

بەڵێ هەر گەل و نەتەوەیەك بڕوا بە قیامەت و زیندوو بوونەوەی لە نێودا نەبوو وەك زەوی‌یەکی شۆرەك و سوێر و بێ تام هیچ جۆرە درەختێکی ڕەوشت بەرزی و پیاوەتی و فیداکاری و خزمەت کردن و ....هتدی تێدا ناڕوێ چونکە ئەم خەسڵەتە مەعنەوی‌یە بەرزانە گوڵاڵەك نین لە سەر زبلی بڕوێن و زەمینەیەکی پاك و پڕ تام و چێژیان گەرەکە، ئەویش بڕوا بە خوا بوون و بڕوا بە دوا ڕۆژ و هەست کردنە بە پرسیاری.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

درەختی خەسڵەتە مەعنەوی‌یە بەرزەکان مەحاڵە لەسەر زەمینەی بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەکان بڕوێن و ڕەگان داکوتن چونکە گۆزە چی تێدا بێت هەر ئەوەی لێ دەرژێت و لەسەر سەرانگۆزیلکیش دار مێو ناڕوێ.

هەر بۆیەش (ستالین) لە جەنگی جیهانی دووەمدا ناچار بوو سەرلە نوێ کڵێساو مزگەوت و پەرستگاکان ئاوەدان بکاتەوە و پەرە بە خواپەرستی و ئاین پەروەری بدات بۆ خاتری وەی هەست و نەستی ئایینی و خواپەرستی لە دڵی سوپاکەی‌دا بجووڵێنێ و ئەو هەست و نەستە خوایی‌یە ببێتە پاڵنەرێکی کاریگەر بۆ هاندانی سەربازەکانی کە خۆیان بەخت کەن و ببنە بەلاگێڕی دەوڵەت و گەل، ئەمما نەك بە دافیعی ئابووری و بەرژەوەندی ماددی ـ وەك مارکس و باقی ڕیش سپیانی بەدۆزەی مارکسیزم دەیان گوت ـ بەڵکو بە



Scanned by CamScanner

دافیعی ڕازی کردنی خوا و وەدەست هێنانی ژیانی هەتا هەتایی بەهەشتی بەرین.

ئاخر براله بڵێی یان نەڵێی هەر ئینسانێك بیگری خۆویست و بەرژەوەند دۆستە، بێگومان ئینسان کە بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەکانیشی دەوێ و هەوڵیان بۆ دەدات بۆ تێر کردنی ئەو (خۆ) یە یەتی و بۆ پارێزگاری کردنیەتی، دەی باشە پێم ناڵێی ئەو ئینسانە _تاك یان کۆمەڵ_ چۆن دەست بەردار دەبێت لەو (خۆ) یەی کە هەموو بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەکانی دەکاتە بەلاّ گێڕ، لە پێناوی بەرژەوەندی ماددی‌دا _ کە بریتی‌یە لە پاراستنی دەوڵەت _ئاخر چۆن ئینسان شتێك بکاتە بەلاّ گێڕی خۆی دوایی دیسان خۆی دەکاتەوە بەلاّ گێڕی؟!!

هەر لەم هەڵوێستەدا کە ڕێچکە نا ئیسلامی‌یەکان زاریان دەبێتە تەڵەی تەقیو و هیچ وەڵامیان پێ نادرێتەوە بەرزی ئیسلام و گونجانی لەگەڵ سروشتی ئینسان دا دەردەکەوێ، چونکە ئیسلام دەڵێت: وەرە ئەی گەل خۆت بەخت کە لە ڕێی پاراستنی گەل و میللەت دا بۆ وەی خوا لێت ڕازی بێ و هیچ بە خەم ئەم ژیانە شتەوە مەبە کە لە دەستت دەچێ چونکە خوای بالاّ دەست و بە بەزەیی بەهەشتێکی ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوانەی لە قسە و فەرمانی دەرناچن هێندەی ئاسمان و زەوی بەرینەو ژیانی دنیا لە چاو وی وەك دڵۆپە ئاوێك وایە لە ئاقار زەریایەك دا.

کەواتە ئیسلام هەر لەو دەمەی‌دا کە داوای شتێك لە ئینسان دەکات بریکار (بدل) ێکیشی لە جێی‌دا دەداتێ کە هەزاران جار چاکترە لەوەی دەی دەکات ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾[1] خوا ماڵ و نەفسی لە بڕواداران کڕیوە و بەهەشتیان دەداتێ. دەکرێ فرە قازانج

(١) التوبة : ١١١ .

لێرەدا ئیسلامەتی ڕاست وەک ئەو بابایەی کردوە کە دەیەوێ لە بازاڕی شتێک بکڕێ و کە دەچێتە کن کابرای دوکاندار مامەڵەی لەگەڵ دا دەکات بەر لەوەی شتە کڕاوەکەی لێ وەرگرێ حەقەکەی دەداتێ، ئەمما ئەو ڕێچکە و بیردۆزانەی کە دەیانەوێ ئینسان هەڵنێن بۆ خۆبەخت کردن و خزمەت و فیداکاری بێ ئامادە کردنی زەمینە و پاڵنەرێکی گونجاو و ڕاست وەک ئەو کەسانەم دێنە بەر ئیگا کە دەیانەوێ بچنە بازاڕی شەکی بکڕن ئەمما حەشیای خوایان دە باخەڵێدا نیە کە دوایی لە بەرامبەردا بی دەن بە بابای شەک فرۆش !! شکی تێدا نیە کە بە دەستی خاڵی دەگەڕێنەوە و کەس ناڵێ لە کوێ ڕا هاتوون!!

پیرەمێردی شاعیریش ڕەحمەتی خوای لێ بێ زۆر ڕاستی گوتوە:

**پیاوت نارد بۆ ئیش قووەتی بەرێ**
**سەعات قوڕمیشی نەکەی ناگەڕێ**

سێیەم: گرنگی بڕوا بە دوارۆژ بوون لە پێکەوە بەسترانی کۆمەڵگا و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دا:

ئایا ئەو خەڵکەی لە کۆمەڵگایەک دا دەژیەن کە ئەندامەکانی بڕوایان بە زیندوو بوونەوە و سزا و پاداش و بەرپرسیاری نیە و لەسەر ڕەوشت و ئاکاری بڕوادارانە بارنەهێنراون و فرچکیان بە خۆشی و لەزەتی ژیانی بەهەشت و سام و هەیبەتی ئێو دۆزەخەوە نەگرتوە ، چ شتێک بەرگرییان لێ دەکات کە بە کاری بەد و ناڕەوا هەستن ؟!

ئایا میللەتێک بڕوای بە سزا و جەزرەبەی ئاوری جەهەندەم نەبێ و بە هەوریای ناز و نیعمەتەکانی بەهەشتێ نەبێت چ شتێک بەرهەڵستی دەکات لە تاوان و سەرپێچی و زیان بە خەڵک گەیاندن؟!

ئایا میللەتێك هەست بە چاودێری خـوا نـەكات و پـێی وابـێ وەك پاتاڵێکی بێ ساحێب خوێڕی کراوە و بەرهەڵدای وەڵاتی کراوە و ڕێشمەی لەسەر داماڵراوە، هەر کام لە ئەندامەکانی چ شتێك ڕێی لێ دەگرێ کە بکەوێتـە دووی نـەفس و ئارەزووەکـانی و بێجگـە لـە بەرژەوەنـدی‌یـە شەخسی‌یەکانی خۆی هیچ شتێکی دی بە بیردا نەیەت ؟!!..

ڕەنگە بەعزە کەسێکی سادە زەیـن و بـێ ئـەزموون بێـژن: چـۆن چ شتێك بەرگری لێ دەکات ؟! قانوونی سزادان !! بەڵام پێویستە لە وەڵامی ئەم قسە سادەیەدا بگوترێ:

١- قانوونی سزادان نە دەستی وەهەموو جێیان ڕادەگات وە نە توانای بەسـەر هەموو کەس دا ڕادەشکێ، بەڵکو وەك گوتراوە: یاسا و دەسـتوورەکان وەك تەونی جاڵجاڵۆکە وان ئەوانەی وەك مێش و مەگەز و مێشوولە و پەپوولـە هێدی و مەند و هێواشـن دەیـان گـرێ و ئەوانـەش کـە وەك زەردەواڵـە و ژەنگەسوورە وریا و بێ عار و بەهەڵێمن قوتاریان دەبێت !

٢- ئەگەر گریمان قانوونەکان توانیان هەموو میللەت بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە خۆ ناتوانن ئەوانەی کە ئەوانیان داناوە بیانخەنـە بـەر تـەوژمی خۆیانـەوە، نەخێر دەسەڵات و تەوژمی قانوون و دەستوورەکان بەتـەنێ نـاتوانن وا لـە هەموو خەڵکی بکات کە پابەند بن بە ڕژێمی وڵاتەوە و شێوازەی کۆمـەڵگا نەپچڕێنن، چونکە ئینسان هەر هێندە لە دەستوور و قانوونان دەرەوێتەوە و لێیان دەترسێت کە مەترسی سزا درانی لەبەر بێ و بە کـوردی چـاوی لـە قەمچی و کوتەك بێت ، بەڵام ئاخر هەموو دەمێ ئەو کوتەکە لە کوێ بـوو هەتا بابـای ئاوانبـاری پـێ چاوترسـێن بکـرێ و پـێی لـە خراپـەکاری وەرەوێنرێ ؟!!



Scanned by CamScanner

بەڵام کە ئیمان و بڕوا هەبوو ئینسان مەگەر چۆنەکایی دەنا حەوجێی بە قانوون و سزادان ناکات چونکە ئەو ئیمان و بڕوایەکەی بە سەریەوە چاودێرە و نایەڵێ پێی خوار دانێت کە ئاگاداری دەکاتەوە، لە مێژووی ئیسلامیش دا ئەوەندەمان نموونە هەیە لەم بارەوە کە لەژمێرە نایەن بەڵام کورد گوتەنی: (لوێچیك نموونەی تەغارێکە) ئێمەش یەکێك لەو ڕووداوانە بە نموونە دێنینەوە:

شەوێکی عومەری کوڕی خەتتاب خەلیفەی موسڵمانان _خوای لێ ڕازی بێت_ بە کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕا بۆ وەی بزانێ هەست و خوستی نێو شار چیە لە یەکێك لە ماڵەکان دا گوێی لەم وتووێژە بوو:

دایك: دە هەستە کچم ئەختێك ئاوێ بکە نێو شیرەکەوە با زۆر بێ.

کچ : ئاخر دایە عومەر (گەورەی موسڵمانان) نەهی کردوە لەوە.

دایك: دە بڕۆ کچم بڕۆ خۆ عومەر ئاگای لێ نیە.

کچ : جا خۆ دایە ئەگەر عومەر ئاگای لێ نیە خوای عومەر ئاگای لێیە!!.

بەڵێ لە کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا لەو دەمەدا کە دەستی قانوون چیدی بر ناکا دەستی بڕوا و ئیمان دێتە کایەوە و ترس و حەژمەت لە دڵی ئینسان دا دەڕەخسێنێ و نایەڵێ شیرازەی کۆمەڵ بپچڕێنێ، ئەمما لە کۆمەڵگای کوفردا ئەو دەستە نیە.

ئەوە لە سەرێکەوە ، لە سەرێکی دیشەوە لە کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا هەر کام لە ئەندامانی کۆمەڵگاخوا خوایەتی ئیشێکی خێری بۆ هەڵکەوێ کە هێنانەدی سوود و بەرژەوەندی‌یەکی خەڵکی تێدا بێت بەشکم بە هۆی ئەوەوە پاداشێکی بۆ بنوسرێ و تا ئەرازووی خێرانی بیەی گران بێت لە ڕۆژی دوایی‌دا،



Scanned by CamScanner

کە ڕۆژێکە کەس دە فریا کەس نایە و منداڵی شیرە خۆرە لە حەژمەتان سەری سپی دەبێ و ئینسـ ـ نازا و بە جەرگ لە خۆ دەچێ.

بەڵێ کۆمەڵگای ئیسلامی دەزانن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((اتقوا الله ولو بشق تمرة))[1] خۆتان لە سزای خوا بپارێزن ئەگەر بە لەتکە دەنکە خورمایەکیش بێ!! کەواتە هەر خوا خوایانە ئیشێکی چاکیان بۆ هەڵکەوێ تا هەڵی کەنە سەرێ و بە ئومێدی خزمەت کردن بە خەڵك و ڕازی کردنی خوا جێبەجێی کەن.

ئەما ئەم جۆرە پاڵنەرە لە کۆمەڵگای بێ دین و بێ بڕوادا بەدی ناکرێ و لە سۆنگەی ئەوەشەوە لە باتی کۆمەڵگایەکی خێر خواز و کۆمەڵ دۆست و ...ەرست ، کۆمەڵگایەکی شەڕخواز و خەڵك نەویست و خۆپەرست بەچاو دەنگێوین.

خوێنەری ئازیزم !

ئەوە کورتەیەك بوو لە تەفسیری ئایەتی چوارەمی ئەم سوورەتە مەزنە، ئەما نابێ وا بزانی کە لێفەم بۆ لەسەر هەتیوان هەڵدایەوە و هیچ نەماوە بیڵێم دەربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە پڕ پیت و پێزە، ئێستاش نۆرەی ئایەتی پێنجەمە.

---

(١) بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردوە.

# تەفسیری ئایەتی پێنجە

# ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾

## بەس تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش یارمەتی دەخوازین.

ماناى وشەكان :

إياك: بەس تۆ، لێرەدا وشەی (اياك) بەركار (مفعول)ە و پێش كار و كاراكەی كەوتوە.

نعبد: دەپەرستین، لێرەدا (نعبد) كە كاروكارا (فعل و فاعل)یە كەوتۆتە دوای بەركارەكەیەوە، ئەم شێوازەش كاتێك بەكار دێنرێ لە زمانی عارەبیدا كە بابای قسە بێژ بیەوێ كارەكە، یان وەسفەكە لە بەركارەكەدا كورت كاتەوە و بەوەوە تایبەتی كات. كەواتە لێرەدا پەرستن (عبادە)ە كە كورت كراوەتەوە لە دوێنراو (مخاطب)دا كە پەروەردگاری مەزنە.

ئێستاش نۆرەی دەرهێنانی بڕێك لە گەوهەرە گرانبایییەكانی دەریای بێ بابانی ئەم ئایەتە پڕ پیت و پێزەیە:

## گەوهەری یەكەم

### خواپەرستی ( عبادة )

خواپەرستی (عبادة) یانی چی و بە كێ دەگوترێ خواپەرست (عابد)؟!

(راغب الاصفهانی) لە مانای (عبادة)دا دەڵێ: (العبودية: اظهار التذلل،



Scanned by CamScanner

والعبادة ابلغ منه لانه غاية التذلل ولا يستحقها الا من له غاية الافضال وهو الله تعالى ولهذا قال (الا تعبدوا الا اياه).

یانی: بەندایەتی واتە: پێشان دانی گەردن کەچی، بەڵام خواپەرستی (عبادة) لە بەندایەتی پڕ ماناترە چونکە (عبادة) ئەو پەڕی گەردن کەچی‌یە و ئەوەش کەس شایانی نیە ئەوە نەبێ کە ئەوپەڕی چاکە و منەتی هەیە بەسەرمانەوە_ کە خوای بێ هاوتایە، جا بۆیەش فەرموویەتی (بێجگە لەوی کەس مەپەرستن).

هەروەها دەڵێت: (والناس في هذا ضربان عبد لله مخلصاً وهو المقصود بقوله: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾، وعبد للدنيا واغراضها...واياه قصد النبي ﷺ بقوله: ((تَعِسَ عبدالدرهم، تَعِسَ عبدالدينار) وعلى هذا النحو يصح ان يقال: ليس كل انسان عبداً لله فان العبد بهذا المعنى بمعنى العابد....)) .

واتە: خەڵك لە بەندایەتی دا دوو جۆرن، هەیانە بەتەنێ بەندەی خوایە لەم ئایەتەش دا ئەم جۆرە (بەندە)یە مەبەست بووە: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ بەندەکانی من تۆ دەسەڵاتت بەسەردا ناشکێن. هەشیانە بەندەی دنیا و شتەکانیەتی....پێغەمبەریش ﷺ ئەم جۆرەی مەبەست بووە کە فەرموویەتی: (نەگبەتی و بێ خێری بۆ بەندەی درەم، نەگبەتی و بێ خێری بۆ بەندەی دینار). بەم پێیە ڕاستە بگوترێ، هەموو ئینسانێك بەندەی خوا نیە، چونکە بەندە بەم مانایە واتە گەردن کەچ و پەرستار[1]. (کەواتە ئینسان چی ئەوپەڕی خۆش بوێ و گەردن کەچی بۆ بکات ئەو شتەی پەرستووە و بە خوای خۆی حسێب کردوە).

(١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە بۆ خۆم نووسیومە.



Scanned by CamScanner

## دیسان (راغب) دەڵێ:

(ویقال طریق معبد أي مذلل بالوطء، و بعیر معبد أي مذلّل بـالقطران و عبَّدت فلاناً اذا ذلّلته واذا اتخذته عبداً قال تعالی ﴿أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾

واتە: وە دەگوترێ ڕێیەکی (مُعبَّد) واتە گەردن کەچ و خۆش کـراو بـەهۆی پێدا ڕۆیشتن، وە حوشترێکی (معبد)یانی مل پێ کەچ کراو و ژێر دەست کراو بە قەتران[1]، وە دەڵێ(عبدت فلاناً) ئەگەر ملت پێ کەچ کردبێ و بارت هێنابێ یان کردبێت بە کۆیلە (عبد)، خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ یانی (بنی اسرائیل)ت کردوە بە ژێر دەستە و فەرمانبەری خۆت _ئەی فیرعەون_.

مامۆستای خوا لـێ‌خۆش بوو (ابـو الاعلی المودودي) یـش لـەم بـارەوە دەڵێت: (مانای (عبودة، عبودیة، عبدیة) لە گۆشە نیگای زمانەوە بریتـی‌یـە لە: ئەستۆ کەچی و خۆ بە کەم پیشان دان، یانی ئینسان لـە ئاقـار یـەکێك دا گەردن کەچ بێ وبە ئیرادە و ویستی وی بەرێوە بچێ وهیچ جۆرە لاموجوومی و سەرەخەری و بەرهەڵستی‌یەك نەکات لە ئاقار ئەمرو فەرمانەکانی‌دا،لە هەڵس و کەوت و ڕەفتار و کرداری‌دا تەنیا ڕەزامەندی وی ڕەچاو بکا و بە پێی ویست و خواستی وی بژیەت)[2].

باقی سەرچاوەکانی تریش لە تەفسیر و کتێبـە زمانەوانی‌یـەکان، هـەمان مەبەست دووبارە دەکەنەوە لەگەڵ جیاوازی شێوازی دەربڕیندا.

---

(١) (قطران) ماددەیەکی شلە و چەورە لە هێندێك درەخت وەردەگیرێ وەك سنەوبەر (کاژ). سـەیری (المنجد) کە لاپەڕە (٦٣٨) پیتی (ق) چاپی (٢٢).

(٢) سەیری (المصطلحات الاربعة) تەرجەمەی فارسی، لاپەڕە (١٦٧) بکە، چاپی سێیەم.



Scanned by CamScanner

کەواتە ئێستا لەبەر تیشکی قسەی زمان زانان دا دەتوانین بڵێین:

(عبادة) خواپەرستی واتە گەردن کەچی و فەرمانبەری کردن تەنیا بۆ خوا، واتە هەڵس و کەوت کردن و بەڕێوە چوون لە هەموو لایەنەکانی ژیان دا بە پێی ڕێنموونی‌یەکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ ، بەڵێ خواپەرستی یانی پابەند بوون بە بەرنامە و ڕێبازی وی‌یەوە و فڕێدانی هەر ڕێچکە و کوێرە ڕێ‌یەکی تر کە غەیری خوا دایناوە و نەخشەی کێشاوە، وە خواپەرستی واتە گوێ شل نەکردن و بە هیچ حسێب کردنی قسەی هەر کاربەدەست و ڕدێن سپی‌یەك کە قسەکانی لە کانیاوی ڕوونی ڕێباز و دەستووری خوا هەڵنەهێنجاوە و دەیەوێ خۆی لە مەردوم بکاتە پەرستراوو تەمایەتی فیرعەونایەتی‌یان بەسەردا بکا و دەستوور و یاسایان بۆ دانێ.

ئێستاش بۆ خاتری وەی چاکتر مەسەلەکە ڕوون بێتەوە و هیچ کەس لەم بارەوە گرێ کوێرەی لە دڵی‌دا نەمێنێ با سەرنجێکی قورئانی قسەلەجێ بدەین و بزانین لەو بارەوە ڕای چۆنە:

١- لە سوورەتی (مؤمنون) دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَى وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ (٤٥) إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ (٤٦) فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ !﴾.

یانی: دوایی (موسی) و (هارون)ی برایمان بە نیشانە گەلێك و بەڵگەیەکی ئاشکراوە ڕەوانەی لای فیرعەون و دارو دەستەکەی کرد، ئەمما ئەوان خۆیان بە زل گرت و میللەتێکی سەرکەش بوون، گوتیان چۆن بڕوا بە دوو ئینسانی وەك خۆمان دێنین، سەربارەش میللەتەکەیان گەردن کەچ مانن و دەمان پەرستن؟!



Scanned by CamScanner

لێرەدا فیرعەون و دارو دەستەکەی بێ پەردە دەڵێن میللەتی (موسی) کە (بنی اسرائیل)ە ئێمە دەپەرستن، شکیشی تێدا نیە کە مەبەست لە وشەی (عابدون) لێرەدا نوێژ و ڕۆژوو بۆ کردن نیە بەڵکو مەبەست گەردن کەچی و پابەندی ئەو میللەتەیە بە ئەمر و نەهی و دەستوور و بەرنامەی فیرعەونەوە.

٢- هەروەها خوای پەروەردگار تبارك وتعالى لە سەر زمانی مووسا (علیه السلام) فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾[١].

واتە: ئەوەش کە منەتێکە بەسەرم دا دەکەی لە ئەنجامی ئەوەوە بوو کە تۆ _ئەی فیرعەون_ (بنی اسرائیل)ت کردبوو بە بەندەی خۆت.[٢]

٣- دیسان فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنْ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[٣].

واتە: وە لە هەموو کۆمەڵێك دا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردوە کە پێیان ڕابگەیەنێ: خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دوور بگرن.

٤- لە جێیەکی تر فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى﴾[٤].

---

(١) الشعراء : ٢٢ .

(٢) ئەم ئایەتە: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ قسەی (موسی)یە (علیه السلام) لە وەڵامی فیرعەون دا کە پێی گوت: ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً﴾؟ ئایا ئێمە بە منداڵی بەخێومان نەکردی؟ (موسی) لێرەدا دەیەوێ پێی بڵێ: بۆیە ئەمن لە ماڵی تۆدا بەخێو کرام چونکە نەتەوەی من (بني اسرائيل) ژێر دەستەی تۆ بوون.

(٣) النحل : ٣٦ .

(٤) الزمر : ١٧ .



Scanned by CamScanner

یانی: وە ئەوانەی خۆیان لە پەرستنی تاغووت پاراستوە و بۆ کن خوا گەڕاونەوە مژدەیان پێ دەدرێ.

٥- لە شوێنێکی دی فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ؟﴾[1] .

یانی: ئەی وەچەی ئادەم ئەدی ڕام نەسپاردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە؟!

٦- دیسان فەرموویەتی: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا..﴾[2] .

یانی: قەشە و پاپاکانیان و (عیسی)ی کوڕی مەریەمیان کردنە پەروەردگار و فەرمانڕەوا لەباتی خوا، فەرمانیشیان پێ نەکرابوو کە غەیری خوا کەسی تر بپەرستن.

٧- لە سورەتی (الأعراف)دا خوای بالا دەست و بە بەزەیی دەربارەی هەر کام لە نوح و هود و شعیب کە هەرسێکیان پێغەمبەری خوا بوون دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ....﴾، ﴿والى عاد أخاهم هوداً قال ياقوم أعبدوا الله مالكم من اله غيره﴾، ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ..﴾ دەبینین هەر کام لەم پێغەمبەرانە ﷺ فەرموویەتی: (گەلۆ خوا بپەرستن چ پەرستراوی دیکەتان نین) !!

[1] يس : ٦٠ .
[2] التوبة : ٣١ .



Scanned by CamScanner

## خوێنەری ئازیز !

لەوەوە کە ڕابورد وەك مانگی چواردە دەرکەوت کە وشەی (عبادة) چەمك و واتایەکی یەکجار بەرین و بەرفراوانی هەیە و کورت کرانەوەی لە چوار چێوەی بەجێ هێنانی دروشمەکان دا ـ وەك زۆربەی موسڵمانانی ئێستا دەیکەن ـ بە هیچ کلۆجێك لەگەڵ دەقەکانی قورئانی قسە لەجێدا ناسازێ.

بەڵێ (عبادة) لە ڕوانگەی مەکتەبی یەکتاپەرستی ئیسلامەوە واتە: تەنیا و تەنیا ئەستۆ کەچ کردن و فەرمان بەری کردن بۆ خوا و فڕێ دانی هەموو چەشنە کۆیلایەتی و بت پەرستی‌یەك، جا کەیفێ خۆیەتی ئەو بتە کە دەیپەرستێ لەباتی خوا یان وێڕای خوا، دارو بەردە، ڕووەکە، ئاژەڵە، شەیتانە، ئینسانە، ئینجا ئەو ئینسانەش کەیفێ خۆیەتی ڕەشە، سوورە، سپی‌یە، زەردە، ئەرەنگی‌یە، روسیایی‌یە، عارەبە، کوردە، ..هتد هەرچی هەیە با ببێ، مادام لەباتی خوا یان وێڕای خوا پەرستراو فەرمانبەری لە قسە و فەرمان و یاسا و دەستوورەکانی کرا ـ ئەو قسە و فەرمان و یاسا و دەستوورانەی کە لە سەرچاوەی ڕوونی ئیسلامەوە هەڵی نەهێنجاون و بە پێی هەوا و ئارەزووی خۆی دایناون ـ ئەوە کراوە بە پەرستراوێکی ساختە و لە جێی پەرستراوی ڕاستەقینەدا دانراوە.

## بەڵێ خوێنەری خۆشەویستم !

لەوەوە کە ڕابورد دەرکەوت کە مەرج نیە هەتا نوێژ بۆ یەکێك نەکەی و ڕۆژووی بۆ نەگری و کڕنووشی بۆ نەبەی بە پەرستراوی نەژمێرێ با لە هەموو کاروبار و هەستان و دانیشتنێکی ژیانیشت دا پابەندی بەرنامە و گوێ لە مستی قسە و ڕێ نموونی‌یەکانی بی !!

جا ئێستا ئەگەر خوێنەری نازیزم پڕ بە زاری پێ بکەنێ بە وانەی دەڵێن:
باشە چ دەبێ ئەگەر ئێمە وێڕای موسڵمانێتی و خواپەرستی سوودیش لە بیروباوەڕ و بەرنامەکانی دیکەش وەرگرین لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ... هتد دا، هیچ خەتای ناگرم و چ گلەیییانی لێ ناکەم.

چونکە ئەو زەین کورت و لە خوا بێ خەبەرانە نازانن کە خوا فەرموویەتی:
﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾[1] .

یانی: خوا نابووری و چاوپۆشی ناکات کە هاوتا و شەریکی بۆ دابنرێ ئەما غەیری ئەو تاوانە لە هەموو تاوانێکی تر _کە بیەوێ_ دەبووری !!

بەڵێ ئەو لە ئیسلام بێ خەبەرانە نازانن!! ئەدی خوای کاربەجێ نافەرموێ:
﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ...﴾[2] واتە : ئەمڕۆ ڕێبازەکەتانم بۆ تەواو کردن .؟! ...خوای کاربەجێ و زانا دەفەرموێ ڕێبازی خوا (دینی ئیسلامەتی) تەواوە و هیچ کەم و کەسری تێدا نیە بەڵام ئەو لە خوا بێ خەبەرانە دەڵێن: جا چ دەبێت ئەگەر لە بیردۆزە دەسکردەکان سوود وەرگرین لە لایەنەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا!!

گوایە خوای باڵا دەست، ئەو پەروەردگارەی ئەم بوونەوەرە زەبەلاحەی ڕەخساندوە و ڕێك خستوە تەنیا لە لایەنی مەعنەوی و ڕووحیدا پسپۆڕە و سیاسەت و میاسەت و باقی شتەکانی تر نازانێ ؟!

(سبحان الله عما يقول الظالمون علوا كبيراً) پاکی و بێ خەوشی یەکی بێ وێنە بۆ خوا لەوەی کە ستەم کاران دەی بێژن، ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ

(١) النساء : ٤٨ .

(٢) المائدة : ٣ .



Scanned by CamScanner

أَفْوَاهِهِمْ إِنْ يَقُولُونَ إِلاَّ كَذِبًا ﴾[1] واتە : وشەیەکی فرە زل لەزاریان دێتە دەرێ، بێجگە لە درۆ هیچی تر نیە.

ئێستا کە پێم وابێ تا ئەندازەیەك واتا و چەمکی وشەی (عبادة)مان ئاوەڵا کردەوە با دەست کەین بە تێوەڕامانی گەوهەری دووەم.

## گەوهەری دووەم

## خواپەرستی لە ئیسلام دا لەسەر بنەمای خۆشەویستی ڕۆنراوە[2]:

چۆنیەتی دەرهێنرانی ئەم گەوهەرەش لە دەریای پڕ خەزێنەی ئەم ئایەتەدا ئاوایە:

دوای ئەوەی بابای بڕوادار خوای خۆی ناسی و سوپاس و ستایشی کرد و بڕوای کرد بە ژیانێکی دی دوای مردن ، کە هەر کام لەمانە بزوێنەری هەستی خۆشەویستی و ڕێزن بەرامبەر بە خوا، دوای ئەوە یەکسەر گوتی: (ایاك نعبد...) هەر ئەتۆ دەپەرستین، کەواتە خوا پەرستی‌یەکە ئەنجامی وتووێژەکەی پێشەوەیە هەروەك چۆن ئەو مەرِدارانەی هاوینان دەچن بۆ کوێستانەکانی شاخی (قەندیل) ئەگەر لێیان بپرسی بۆچی دەچن بۆ وێ؟ دەڵێن: چونکە ئاووهەوایەکی سازگار و کانی و سەرچاوەی سارد و زەمەند و لەوەڕی چاکی لێیە، کەواتە چوون بۆ کوێستانەکانی (قەندیل) چەند پاڵنەرێکی هەیە کە وەك کۆڵەکان لەسەریان بەندە.

---

(1) الکهف : ٥ .

(2) هەرچەندە لە کاتی توێژینەوەی ئایەتی سێیەم ﴿الرحمن الرحیم﴾دا گەوهەری سێیەمان بۆ ئەم باسە تەرخان کردوە، بەڵام باسەکە هێند گرنگ و بایەخ دارە ئەم گەوهەرە و دەیان گەوهەری تریشی بۆ بکرێنە ملوانکە ئێستا هەر کەمە..

دەکت و مت مەسەلەی پەرستنی پەروەردگاریش بەم چەشنەیە، بۆیە موسڵمان خوا دەپەرستێ چونکە بەدی هێنەرە و خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزی خوایەتی یە و سوپاس و ستایش هەر شیاوی وی یە و گەورەی رۆژی پاداش و سزایە _هەڵبەتە موسڵمان پتر تەمای پاداشتیان هەیە تا سزا_ جا لە سۆنگەی ئەمانەوە دەی پەرستێ، کەواتە پەرستنی خوای مەزن ئاکامی خۆشەویستی بەندەکانە بەرامبەر بە وی، چونکە هەر کام لەو عامیلانەی رابوردن وا لە ئینسان دەکات خوای خۆش بوێ چ جای هەمووشیان خڕوە بن ! ئینجا کەسیش شکی لەوە نیە کە خوای بێ هاوتاش ئەو جۆرە بەندانەی خۆش دەوێ چونکە ئەو هەر بەر لەوەی بەندەکانی بی ناسن و بی پەرستن چاکەی لەگەڵ دا کردوون و خۆشی ویستوون و رێزی لێ گرتوون ! مادام وابێ ئێستا کە بەندەکانی ئەستۆی بۆ کەچ دەکەن و بە تاقە سەردار و گەورە و پەروەردگاری خۆیانی حسێب دەکەن حەوجار حەوجار خۆشی دەوێن.

بەڵێ بنج و بناوانی خواپەرستی خۆشەویستی یە، بەڵام ئایا هەموو کەس بۆی هەیە لافی ئەوە لێ بدات کە خوای خۆش دەوێ و دۆستایەتی لەگەڵ خوادا بەهێز و پتەوە؟![1].

(١) گەرمێنێکی لە کۆڕێك دا لەگەڵ یەکێك لە دانیشتوان بوو بە سەرناقشەمان ئەو ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە هیچ کەس نیە هێندەی وی خوای خۆش بوێ و دۆستایەتی لەگەڵ دا پتەو بێت، ئەدا نوێژ و باقی ئاکارە ئیسلامیەکانی تریشی تێدا نەدەبینران کە پێشم دەگوت: مادام خوات خۆش دەوێ چما پابەندی فەرمانەکانی نابی! زۆرە گەلێك عوزر و بەهانەی بێ جێی دێنانەوە، جا ئەو چەند دێڕەی سەرێ وەڵامی ئەو جۆرە کەسانە دەدەمەوە.



Scanned by CamScanner

هەڵبەتە نەء بەڵکو پێویستە ئەوانەی خوایـــان خـۆش دەوێ و ڕێـــزی لـێ‌دەگرن دروشم و نیشانە گەلێکیان پێوە بێت کە لەوانەی خوایان خۆش ناوێ جوێیان دەکاتەوە و هەڵیان داوێرێ.

چونکە ئیمان و بروا کە ڕیشە و بنەماکەی‌خۆشەویستی‌یە هەست‌و نەست‌و عاتیفە و سۆزێکی دەروونی‌یە و لەبەر چاوان پەنهان و شێرراوەیە و هەستی پێ ناکرێت، بەڵام ئەو هەست و نەست و عاتیفە و سۆزە دەرونی یە دیمەن و ڕواڵەتێکی بەرچاوو دیتراویشی هەیە کە دەکرێتە نیشانە و دروشم و بەڵگەی هەبوونی، واتە ئیمان و بروا دوو دیوی هەیە دیوێکیان شێرراوە و پەنهانە و خوا نەبێ کەسی پێ شارەزا نیە، دیوەکەی دیشیان دیتراوو ئاشکرایە و هەموو ئەس دەی بینێ، ئەویش بریتی یە لەو کردار و ڕەفتار و ڕەوشت و ئاکارەی کە ئینسانی ئیمان دار پێ‌ی هەڵدەستێ و دەیکاتە بەڵگە و شایەت‌و تەرجەمەیەکی واقیعی بۆ ئیمانەکەی.

بەڵێ کەسێك کەسێکی یان شتێکی خۆش بوێ لە پێناوی‌دا ڕەنـج دەدا و تێ دەکۆشێ بۆ وێنە: دەبینین ئەو جحێڵانەی دڵدارن و ئافرەتێکـ  خۆش دەوێ هەر شتێکی لە توانا و بڕستیان دابێ لە پێناوی‌دا بەخت دەکەن، بەڵکو زیـاد لەوەش جاری وایە لە پێناوی یار و خۆشەویستەکەیان دا مـل دەبـەر کـاری وا ڕادەکەن کە بە هیچ کێشانە و پێوانەیەکی ژیرانە ماقووڵ نیـە، لێـرەدا قووڵـە نەزیلەیەکم هاتەوە یاد:

دەڵێن کەرەتێکی سلێمان پێغەمبەر (علیە السلام) بە لای مێروولەیەکی‌دا ڕابورد کە سەرگەرمی گواستنەوەی گردێکی گەورە بوو کە کرابوو بـە مـارەیی خۆشەویستەکەی سولەیمان لـێ‌ی پرسی: جا خۆ ئەگەر هـەزار سـاڵیش بژیـ ئێستا هیچ بە هیچ ناکەی چما بە خۆڕایی خۆت ماندوو دەکەی؟!.



Scanned by CamScanner

مێروولەکە لە وەڵام دا گوتی: کاکی خۆم لە مەزەبی ئاشقان دا لێکدانەوە نیە!! بەڵێ ئەو کەسەی کە گوتوویەتی:

تعصي الاله و تزعـــم حبه — لعمرك هذا في المقال بديع
لو كان حبك صادقا لاطعته — فـان المحب لمن يحب مطيع

وێڕای یاخی بوونت لە خوا گومان دەکــەی خۆشـت دەوێ
سوێنـدم بە خوا ئەم قسەیەت لەگەڵ واقیع ڕێك ناکەوێ
ئەگەر ڕاستە خۆشەویسـتـتە دەبێ مل کەچ کەی بۆ ئەمری
کەسێك کەسێکی خۆش بوێ گوێ لە بۆ فەرمانی دەگری[1]

زۆر ڕاستی گوتوە!!

بەر لەوەی ئەم گەوهەرە بەجێ بێڵین و پەردە لەسەر گەوهەرێکی تری ئـەم ئایەتە هەڵدەینەوە ڕاستی‌یەکی زێدە بایەخ دار ماوە ئالوێ لـێی بێ دەنگ بین.

هەروەك چۆن کەسێك ڕاست بکات لەوەدا کە خوای خۆش دەوێ بە قسەی دەکات و سەرپێچی لە فەرمانەکانی ناکات، دیسان کەسێك بە ڕاسـتی خـوای خۆش بوێ هەمـوو ئەوانەشی خۆش دەوێ کە خـوا خۆشـی دەوێـن وە هـەموو ئەوانەش دەبوغزێنێ کە خوا دەیان بوغزێنی، گومانیش لەوەدا نیە کـە بەنـدە گـوێ ڕایـەڵ و فەرمانبـەرەکانی خـوا بـە گـشتی و لـە ڕیـزی پێـشەوەیان دا پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ و خزم و هاوەڵانی خۆشەویستی خوان و شەیتان و ئینسانە لە خوا یاخی بووەکانیش ناحەز و دوژمنی خـوان، کەواتـە موسـڵمان پێویستە هەموو بەواداران بە گشتی و پێغەمبەر و خزم و نزیکانی و هـاوەڵانی بە تایبەتی خۆش بوێ و لەو لاشەوە شەیتان و داروودەستەکەی لە ئینسان و جن

(١) ئەم دوو دێڕە شیعرە بۆ خۆم تەرجەمەم کردن ئەگەر ناتەواوی یەکی تێدا بێ داوای چاوپۆشی دەکەم.



Scanned by CamScanner

(پەری) ببوغزێنێ، هەر بۆیەش بە ئەدەب و ڕەوشتێکی ئیسلامی دادەنرێ کە ئینسان لە دەمی ناو هێنانی یەکێك لە پێغەمبەران دا [1] داوا لە خوای گەورە بکات کە لە بارانی ڕەحمەت و بەخششی خۆی زیاترمان بەسەردا ببارێنێ بەم جۆرە دەڵێین: ﷺ یان (علیه السلام)، وە لە دەمی ناوهێنانی یارانی پێغەمبەردا بڵێین ﷺ خوا لێی ڕازی بێت، وە لە دەمی ناوهێنانی خواپەرستێکی چاك و موسڵمانێکی خزمەت گوزاردا بێژین: (رحمە الله) خوا ڕەحمی پێ بکات.

دیسان هەر بۆیەش بە ئەدەب و ڕەوشتێکی ئیسلامی دادەنرێ کە هانا وەبەر خوا بەرین لەبەر شەیتان و شەیتانۆیەکان چ نەبینراو بن چ بینراو ﴿من الجنة والناس﴾ ، وە بڵێین: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) پەنا دەبەمە بەر خوا لە شەیتانی نەفرین لێ کراو.

جا خوا بۆ خاتری گەورەیی و بەخشندەیی خۆی بمان گێڕێ لەوانەی وە دوای شەیتان و شەیتانۆیەکان ناکەون و بەلایان دا ناچن. ئامین.

---

(1) هەڵبەتە ئەم سەڵەوات دانە پتر دەربارەی پێغەمبەرمان موحەمەد ﷺ داکۆکی لەسەر کراوە، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ احزاب: ٥٦.



Scanned by CamScanner

# گەوهەری سێیەم

## نزیك كەوتنەوە لە خوا بە كتوپڕی نایەتە دی و خۆڕاگری پێویستە

نیزیك كەوتنەوە لە خوا و ڕۆچوون لە دەریای بێ بنی خواناسین دا بە كت و پڕی نایەتە دی و خۆڕاگری و ئارامی و نەسرەوتوویی گەرەكە، كوردانیش لەمێژە گوتوویانە: كەس لە پڕێك نابێتە كوڕێك.

جا وەنەبێ ئەو پلە و پلەیی وردە وردە پێ هەڵاچوونە تەنیا لە بواری خواپەرستیدا هەبێت بەڵكو هەموو كاروبارێكی دنیا بە گوێرەی ئەو یاسا گشتییە بەڕێوە دەچێ، دەبینین بابای وەرزش كار هەوەڵ جا چل پەنجا كیلۆی بۆ بەرز دەكرێ ئەمما پاش چەند مانگ و چەند ساڵێك دەتوانێ سەری پێ بەسەد و دوو سەدییەوە بنێ، بەڵام ئایا ئەگەر هەر هەوەڵ جار هەوڵی دابا كە یەكسەر سەد دوو سەد كیلۆی بەرز كاتەوە بۆی دەچۆ سەرێ؟!

خواپەرستی و سەركەوتنیش بە پەیژەی خواناسی دا هەر بەو گەزوجاوە.

چۆنیەتی فامرانەوەی ئەم مەبەستەش لەم ئایەتە پڕ پیت و پیرۆزە ئاوایە:

لە پلەی یەكەم دا بەندە بەدی هێنەری خۆی ناسی و زانی كە خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرز و جوانە.

لە پلەی دووەم دا ستایش و شوكرانە بژێری بەرامبەر بە پەروەردگاری دەربڕی، واتە ناسینی خوادا وای لێ كرد سوپاس و ستایشی بكات.

لە پلەی سێیەم دا جارێكی دی دووپاتی كردەوە كە خوا خێوی هەموو سیفەتێكی لەبار و چاكە بۆیەش هەر خەسڵەتی بەزەیی و بەخشندەیی باس كراوە چونكە جێ و مەقام وا داخوازی دەكات.



Scanned by CamScanner

لە پلەی چوارەم دا بروا هێنانی خۆی دەربڕی بە ڕۆژی دوایی ڕۆژی سزا و پاداشت، ڕۆژێك لە دادگەری خوای تێدا دەچەسپێ و پاك و پیس لێك هەڵداوێررێن.

ئینجا لە پلەی پێنجەم دا ئینسان پتر هەڵ دەكشێ و دەچێتە قۆناغی دووان (خطاب)لەگەڵ خوادا دوای ئەوەی كە لە پلەكانی پێشوودا بە شێوەیەكی نا ڕاستەوخۆیی لەگەڵی دا دەدوا.

هەڵبەتە ئەم پلەیەش لە بەرنامەی خوادا بە پلەی (احسان) ناسراوە چونكە لە فەرمایشت دا هاتوە: ((الاحسان ان تعبد الله كأنك تراه....))[1] واتە: (احسان) ئەوەیە كە لە دەمی خواپەرستی‌دا وابزانی خوا دەبینی و تێ‌یەوە ڕادەمێنی.

بێگومان (احسان)یش وەك زانایان دەڵێن بەرزترین پلەی خوا ناسی‌یە. ئێستاش چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەر ﷺ دێنینەوە بۆ پتر ئاوەڵا كردنەوەی مەبەست:

١- (ان الدين يسر ولن يشاد الدين احد الا غلبه....)[2] واتە: دین داری و خواپەرستی ئاسانە و ـ لەگەڵ سروشتی ئینسان دا دەسازێ ـ هیچ كەسێكیش پێش بڕكێی لەگەڵ دین دا نەكردوە دین بەسەری‌دا زاڵ نەبووبێ، واتە: هیچ كەسێك زیادەڕەوی لە خواپەرستی‌دا نەكردوە و زیاد لە پێویست پێ‌ی‌دا قووڵ نەبۆتەوە لە حاڵێك دا نەبێ كە دەری نەبردوە و پەكی كەوتوە و فرزەی لێ براوە.

(١) (بخاري و مسلم و ترمذي و نسائي و ابو داود) ڕیوایەتیان كردوە لە (عمر بن الخطاب)ەوە.

(٢) (بخاري) لە ـ ابو هريرة ـ وە گێڕاویەتەوە.

٢-(سئل رسول الله ﷺ أي العمل احب الى الله؟ قال: ادومه وان قل)[١] یانی: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: چ کردەوەیەك خۆشەویست ترە لە کن خوا؟ فەرمووی بەردەوام ترینی ئەگەر کەمیش بێ.

٣- وقال ﷺ : ( اما والله اني لاخشاكم لله واتقاكم له ولكني اصوم وافطر واصلي وارقد واتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني.)[٢] یانی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بزانن بە خوا لە هەموانتان پتر لە خوا دەترسێم و پارێزی لێ دەکەم ئەمما بە ڕۆژوو دەبم و ڕۆژ بوێریش دەکەم _مەبەست لێرەدا ڕۆژووی سوننەتە_ وە نوێژیش دەکەم و دەشنووم وە دەچمە لای ئافرەتیش هەر کەسێك لە ڕێ و شوێنی من لامل بێ لە _میللەتی_ من نیە !!.

٤- (عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما قال: قال لي النبي ﷺ : الم اخبر انك تقوم الليل و تصوم النهار قلت: اني افعل ذلك، قال: فأنك اذا فعلت ذلك هجمت عينك و نفهت نفسك وان لنفسك حق ولاهلك حق فصم وافطر و قم و نم)[٣].

واتە: (عبدالله بن عمرو بن العاص) خوا لێیان ڕازی بێ گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم : هەواڵم پێ دراوە کە تۆ شەوگار[٤] بە شەو نوێژان دەبەیە سەر و ڕۆژگاریش بە ڕۆژوو، گوتم: ئەمن وا دەکەم، فەرمووی: ئەگەر وا بکەی چاوت قووڵ دەبن و نەفست ماندوو دەبێت،

(١) (بخاري و مسلم و ترمذي) لە _عائشة_ وە گێڕاویانەتەوە.
(٢) (بخاري و مسلم و نسائي) لە _انس_ ڕیوایەتیان کردوە.
(٣) (بخاري و مسلم) لە عبدالله بن عمرو بن العاص _وە گێڕاویانەتەوە.
(٤) واتە هەموو شەوگار بە پێ پسانەوە.

بشزانە کە نەفست مافی هەیە و، خێزانت مافی هەیە، کەواتە ڕۆژووانیش بگرە ـیانی ڕۆژووی سوننەتـ و ڕۆژ بویریش بکە، وە شەو نوێژانیش بکە و بشنوو.

## بەڵێ خوێنەری ئازیز !

بەرنامەی خوا بە پێی سروشتی ئینسان ڕێژراوە ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ﴾ مادام وابێ دەبێ لەگەڵ وزە و توانای ئینسان دا بگونجێ و وانەبێ کە ئینسان بۆی بەڕێوە نەچێت ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[1] واتە: خوا دەیەوێ کارتان بۆ وەسێنایی بخات و نایەوێ لێتان گران بکات.

ئەمما هەر لەگەڵ ئەوەش دا کە ئیسلام لە توانا و وزەی هەموو کەسێك دایە بەهێزترین ئینسانیش مەودای هەیە کە ئەسپی پێش برکێ و بەرەو پێش چوونی تاو بدات لە مەیدانی خواپەرستیدا.

بەڵام دووپاتی دەکەینەوە کە نیزیك بوونەوە لە خوا و زۆرڕا چوون بە پەیژەی خواناسیدا بە پەلەپەل سەرناگرێ و پشوو درێژی و خۆ ڕاگری و وردی بەرزی گەرەکە، پێشینانیش گوتوویانە: ئەوەی لە بلێندان بڕوانێ دە نەویان دەکەوێ، بە چاوی خۆشم بابای وام دیوە لە پێش دا ئیسلامی زۆر بە تین و تاوەوە گرتوە و ویستوویەتی بە دوو ڕۆژان لە هەموو ئاوان وەپەڕێ و بچێتە پێزی ئەو خواپەرست و خواپێداوانەی دوای هەوڵ و خەبات و تێکۆشانی چەند ساڵە گەیشتوون بەو پلە و پایەیە پێی گەیون، ئەمما پاش ماوەیەك نەك هەر

---

(1) البقرة : ١٨٦ .



Scanned by CamScanner

نەیتوانیوە بەردەوام بێت بەڵکو زۆر جاران هەر وازیشی لە خواپەرستی و دین داری هێناوە و پێشی چەند بە گوڕوتاوەوە بە دەریای خواپەرستیدا چۆتە خوار دوایی هێندە بە تین و گوڕەوە کشیوەتەوە و پاشەکشەی کردوە، بە پێی یاسای (لکل فعل رد فعل یساویە في المقدار و یعاکسە في الاتجاه) بۆ هەر کارێك کاردانەوەیەك هەیە، لە ئەندازەدا یارتەقایەتی و لە ئاراستەدا بە پێچەوانەیەتی.

ڕەنگە هێندێ کەس وا لەم قسانەم حاڵی بن کە هەرچی بە گوڕ و تین ڕووەو خواپەرستی چوو دواییش بە گوڕ و تین دەکشێتەوە و پاشەکشەی دەکات، بەڵام نە مەبەستم ئەوەیە وە نە ئەو فامرانەوەیەش لە جێی خۆیەتی، بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەستیش وێنەیەك دێنمەوە:

ئەگەر کوتکێکی لاستیق لە دیوارێکی ڕەق ڕاکێشی، هەتا کوتك لێدانەکە بە تەوژم تر بێت هەڵبەزینەوەکەشی بە تەوژم تر دەبێ، بەڵام هەر هەمان دیوار ئەگەر پاچێکی نووك تیژی لێدەی دەبینێ لەباتی هەڵبەزینەوە و کشانەوە دوا پێیدا دەچێتە خوار.

ئێستا بەم وێنەیە مەسەلەکە ئاشکراتر بوو، ئەوانەی زیاد لە بەرەی خۆیان ئینگان ڕادەکێشن و لە توانایان بەدەر تێ دەنووسێن، شتێکی سروشتی و ئاساییە کە دەرنابەن و پەکیان دەکەوێ چونکە ئەو بەربەستەی خۆی پێ دادەدەن ڕەق و پتەوترە لە ئیرادە و عەزمی نەرمۆڵەی وان، بەڵێ ئەوانە وەك ئەو کەسە وان کە دەیەوێ لە پەیژەیەکی (١٠) پێ پیلکەیی بە دو شەقاوان وەسەر کەوێ !!

ئەمما ئەوانەی بەشێنەیی و هێدی هێدی دەچنە پێش و لە پەڵای خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر ﷺ و ڕێبازەکەیان و شوێن کەوتووانی و ژیانی ئەبراوەی بەهەشت پاچێکی نووك تیژیان دروست کردوە و بە بوغزاندنی شەیتان

دارو دەستەکەی و ڕێچکەکانیان و شوێن کەوتووانیان و ترسان لە دۆزەخ دەمەزەردیان کردۆتەوە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ تۆناغێکی نوێ دەبڕن و بە پلەیەکی تردا سەردەکەون هەتا دەگەنە سەربانی کۆشکی ڕازاوەی خواپەرستی و پلە و مەقامی (احسان).

# گەوهەری چوارەم

## ئەرکی بەندە بەرامبەر بە خوا و ئی خوا بەرامبەر بەوی

خوێنەری ئازیز !

بە ڕاستی ئەم ئایەتە مەزنە جوانی و ڕەونەقی هەرە زۆری ئەم سوورەتەی وەخۆ گرتوە و بە بڕبڕەی پشتی لە قەڵەم دەدرێ، چونکە وەك پێشتر گوترا ئەو چوار ئایەتەی پێشی کەوتوون هەموویان چەند پێشەکی یەکن کە ئەم ئایەتەیان لێ وەئەنجام دێ، دیسان ئەو دوو ئایەتەی دواییش دێن واتە: شەشەم و حەوتەم بەهێزی وی یەوە سەریان هەڵداوە، چونکە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەندەکان بەتەنێ خوا دەپەرستن شیاوی ئەوەیە داوای لێ بکەن ڕێنمایی یان بکات بۆ ڕێی ڕاست و بیان گێڕێ لەوانەی خوا لێیان ڕازییە و نیعمەتی ئیمانی پێ داون نەك ئەوانەی خوا گرتوو سەر لێ شێواون.

ئێستا با بڕێینە سەر چۆنیەتی فامرانەوەی ئەم یاسایە و دەرهێنانی ئەم گەوهەرە لە دەریای پڕ خەزێنەی ئەم ئایەتە:

بەندەکان پاش ئەوەی ئەو ڕاستی یانەیان دیت کە لە چوار ئایەتی پێشوودا هەبوون گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە تەنیا خوا شیاوی پەرستن و ئەستۆ بۆ کەچ کردنەوە و کەسی دی ڕێی ناکەوێ بپەرسترێ و ملی بۆ ئەوی بکەرێ،



Scanned by CamScanner

بۆیە گوتیان: ﴿اياك نعبد﴾ بەتەنێ تۆ دەپەرستین !!

بەڵێ بەندەکان دوای ئەوەی زانیان کە خوا بەدی هێنەرە و خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاکە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾، وە زانیان کە خوا شیاوی سوپاس و ستایش بۆ کردنە چونکە پەروەردگاری جیهانیانە ﴿الحمد لله رب العـالمين﴾، وە زانیان کە ئەو پەروەردگارە مەزنە تەنیا بە پاڵنەری سۆز و بەخشندەیی و چاکە لەگەڵ دا کردن کائیناتی خوڵقاندوە ﴿الرحمن الـرحيم﴾، وە زانیـان کـە خـوای کاربەجێ سەرپەرشت و خاوەنی ڕۆژی قیامەتێیە ﴿ملك يوم الدين﴾، گوتیـان: ﴿اياك نعبد﴾ بەس تۆ دەپەرستین.

ئینجا هەڵبەتە ئەگەر بەندە بە ڕۆیشتن بۆ لای خوای بچێ ئەو بە راکـردن بۆ لای دێ بۆیە بەندەکان دوای ئەوەی پەیمانی بەندایەتی‌یان لەگەڵ خودا بەست و گفت یان پێدا کە غەیری وی نەپەرستن ئامادەیی ئەوەیان پەیدا کرد کـە خـوا بەهانایانەوە بێت ودەستیان بگرێ و لە برینی ڕێی خواپەرستی‌دا پشت گیری‌یان بکات بۆیە گوتیان: ﴿اياك نستعين﴾ وە یارمەتیش هەر لە تۆ دەخوازین.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند دێڕێك لە ئامۆژگاری‌یەکانی (عبـدالقادر الجيلاني)[1] ـ ڕەحمەتی خوای لـێ بێ ـ بخەینە بەر چاوان لەم بارەوە:

دەفەرموێ: (يا غلام أين عبوديتك للحق عز وجل، هات حقيقة العبودية و خذ الكفاية في جميع امورك: انت عبد آبق مـن مـولاك، ارجـع اليـه و ذل لـه و تواضع لامره بالامتثال، ولنهيه بالانتهاء، ولقـضاءه بالـصبر و الموافقـة، اذا تم لك هذا تمت عبوديتك لـسيدك و جاءتك منـه الكفاية قال الله عز وجل ﴿اليـس الله بكاف عبده؟﴾.

(١) کتێبی (الفتح الرباني والفيض الرحماني) نووسراوی (عبدالقادر الجيلاني) لاپەرە (٢٢).



Scanned by CamScanner

اذا صحت عبوديتك له احبك و قوى حبه في قلبك و آنسك به و قربك منه من غير تعب و لا طلب لك صحبة غيره فتكون راضيا عنه في جميع الاحوال، فلو ضيق عليك الارض برحبها، وسد عليك الابواب بسعتها لم تسخط عليه، ولم تقرب باب غيره ولم تأكل من طعام غيره..الخ).

یانی: رۆڵە کوا بەندایەتیی بۆ خوای بەرز و بێ هاوتا؟ بەندایەتی ڕاستەقینە بێنە دی و لەگەڵ بووێتی (کفایە)ی خوا وەرگرە لە هەموو کاروبارێکت دا، تۆ بەندەیەکی زوێر بوو و غەزریوی لە گەورەت، بگەڕێوە لای و ملی بۆ کەچ بکە و ئەمرو فەرمانی جێبەجێ بکە و واز لەو شتانە بێنە کە بەرگری لـێ کردوون و ئارامی و ڕەزامەندیت دەربڕە لە ئاقار قەزا و قەدەری دا، ئەگەر ئەوەت کرد بەندایەتی ڕاستەقینەت هێناوەتە دی بۆ گەورەکەت وە یارمەتی و پشتیوانی خوات بۆ دێ، خوا فەرموویەتی: ﴿اليس الله بكاف عبده؟﴾ ئایا خوا بەس نیە بۆ بەندەکەی؟!

ئەگەر بەندایەتیش بۆ وی ڕاست بێ خۆشی دەوێ‌ی و خۆشەویستی خۆی لە دڵت دا بەهێز دەکات و دەت کاتە هاودەمی خۆی و لە خۆیت وەنیزیك دەخات بێ ماندوو بوون، وە نایەڵێ هاوڕێیەتی غەیری وی بکەی، ئینجا لـە هـەموو حاڵێك دا لـێی‌ڕازی دەبی خۆ ئەگەر سەری دنیایەت لـێ وێك بێتەوە بەو پانو بەرینی‌یەیەوە، وە هەموو دەروانت لـێ داخات بەو فراوانی‌بەیانەوە لێ‌ی تـووڕە نابی و لێ‌ی لە دڵی نـاگری و لـە دەرگـای غـەیری وی وە نیزیـك ناکـەوی و خۆراکی غەیری وی ناخۆی..هتد).

بەڵێ بە ڕاستی گرنگ خۆ ساغ کردنەوە و خـۆ یەکلاکردنـەوە و دڵ سـاف کردنەوەیە بۆ خوای بەخشەر چونکە وەکو ئیمام غەزالی دەفەرموێ، "ڕەحمەتی

خوای لێ بێ" : - هەروەك چۆن ڕۆژ هەموو دەمێ تیشكی پڕ پیت و پیزی بلاو دەكاتەوە خوای مەزنیش دایم و دەرەم تیشكی سۆز و بەزەیی و بەخشندەیی بەخش دەكات بەسەر بەندەكانی‌دا، بەلام هەروەك چۆن ئاسنی ژەنگ گرتوو و لەتكە گۆزە ناتوانن تیشكی ڕۆژێ لە خۆیان دا بخەنە درەوشانەوە و تەجەللا لەبەر ناساغی و بێ ئامادەیی یان هەر ئاواش ئەوانەی دڵ و دەروونیان بە ژەنگ و ژاری چڵك و چەپەری تاوان كەمرەی بە ستووەو وەك ئاوی پیس لیتە و لاڵی لێ نیشتوە ، وەك ئاسنە ژەنگ گرتوو و لەتكە گۆزەكان توانای عەكس كردنەوە و سوود وەرگرتنیان نیە لەو تیشكی سۆز و بەزەیی‌یە، ئەمما ئەوانەی لە ڕێی خواپەرستی و نوێژ و ڕۆژوو دووعا و زیكر و قورئان خوێندن و ئەمر كردن بە چاكە و نەهی‌كردن لە خراپە و بەرێوە چوون بە گوێرەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەر ﷺ و .. هتد هەستاون بە پاك كردنەوە و سپی كردنەوەی نەفس و دڵ و دەروونیان ، ئەوانە وەك ئاوێنەیەكی ساف چۆن تیشكی خۆری تێدا دەدرەوشێتەوە ئاوا نوور و تیشكی بەخشندەیی و سۆزی خوایان لە دڵی‌دا دەدرەوشێتەوە.

كەواتە ئینسان هەتا پتر خۆی ماندوو بكاو زیاتر بەسەر نەفسی‌دا زاڵ بێ و پاكی كاتەوە لە ژەنگ و ژاری سەرپێچی و تاوان و خۆپەرستی و دنیا پەرستی پتر شیاوی داباریین و هەڵڕژانی ڕێژنەی بە تەوژمی بارانی ڕەحمەتی خوا دەبێت.

جا یارەبی خوایە بچینە ریزی ئەوانەی جڵەوی نەفس و ئارەزووەكانیان لە دەست ژێری و دڵ و دەروونی پڕ لە ئیمانیان دایە و هەردەم سەرگەرمی خاوێن كردنەوەی نەفسیانن و خەریكی زاخاو دانی بە دەنگی ساز و خۆش ئاوازی قورئان و سوننەت، ئامین.



Scanned by CamScanner

# گەوهەری پێنجەم

## پوخت ترین شێوەی خوا بەیەکگرتن (التوحید):

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوا بەیەکگرتن یان یەکتاپەرستی (التوحید) بە چاکترین شێوە خراوەتە ڕوو: چونکە ئەو شتانەی ئینسان دەیان کات بە پەرستراوی خۆی و دەیان پەرستێ لە کاتێك دا لە خوا پەرستی وەدوور دەکەوێ لە دوو جۆر بەدەر نین:

١- شتێکە ئەو بابایە بە لەخۆی بەرزتر و باڵاتری دەزانێ جا کەیفی خۆیەتی ئەو شتە بتێکی لە دار و بەرد داتاشراوە، ڕووەکە، ئاژەڵە، ئینسانە، پیرۆزەیەکە، دام و دەزگایەکە...هتد، واتە: ئینسان شتێك بپەرستێ غەیری خوا و غەیری خۆی.

٢- هەوا و ئارەزووەکانی خۆی، وەك قورئان فەرموویەتی: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ..﴾[1] یانی: ئەو بابایە نابینی کە هەوا و نەفسی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی؟!

بەڵێ ئینسان هەر لە خواپەرستی لادات دووچاری بت پەرستی دەبێت و دەبێتە کۆیلە، جا یان کۆیلەی یەکێك لە دیاردە سروشتی یەکان، وەك: دار و بەرد و ڕووەك و ئاژەڵ و ئینسان و ڕۆژ و ئاگر و شەیتان و فریشتە و...هتد، یان کۆیلەی نەفسی خۆی.

ئەم ئایەتە پیرۆزەش دڵ و دەروونی ئینسان لەهەر کام لەو دوو چەشنە کۆیلایەتی یە پاك دەکاتەوە، لە بەشی یەکەمی ئەم ئایەتەدا کە خوێنەر دەڵێت:

---

[1] الجاثية : ٢٤ .



Scanned by CamScanner

(اياك نعبد) بەس تۆ دەپەرستین ، دەروونی لەهەر چەشنە پەرستراوێك پاك دەبێتەوە و نیشانەیەكی (×) بەسەر گشت تاغووت و بت و صەنەمەكان دا دێنێت و تووڕیان دەدات.

بەڵام ڕەنگە بەعزە كەسێك وابزانن كە بە ئازایەتی و شان و پیلی خۆیان و بێ یارمەتی هیچ كەسێك توانیویانە ئەو كارە جێبەجێ بكەن، هەڵبەتە ئەم جۆرە بیر كردنەوەش لەگەڵ یەكتاپەرستی (توحید)ی بێ توێڵك و دەغەڵدا ڕێك ناكەوێ چونكە بت پەرستی هەر بت پەرستییە جا كەیفێ خۆیەتی بتێكی دوورە دەست بێ، وەك جۆری یەكەم، یان لە بنەو پاڵەوە بێ وەك جۆری دووەم، بۆیە لە بەشی دووەمی ئایەتەكەدا ئەو بتەش (×) یكی لێ دراوە و وەلا نراوە و گوتراوە: ﴿وایاك نستعین﴾ یانی: وە یارمەتیش هەر لە تۆ دەخوازین.

ئەم دوو جۆرە بت پەرستی و شەریك بۆ خوا پەیدا كردنەی قسەمان لێ كردن بۆ مسوڵمانان لە زاراوەی (تصوف)دا بە (الریاء) و (العُجْب) ناسراون.

چونكە (الریاء) ئەوەیە كە ئیشێك بكەی غەیری خوای تێدا ڕەچاو بكەی واتە: وێڕای ڕەچاو كردنی ڕازی كردنی خوا بەرژەوەندییەكی تریشی تێدا ڕەچاو بكەی[1]، هەڵبەتە ئەوەش شەریك بۆ خوا بڕیار دانە.

(عُجْب)یش ئەوەیە كە لە كاتی جێبەجێ كردنی كارێك دا خۆت لێ بگۆڕێ و عاجباتیت لە خۆت بێ و شانازی بە خۆتەوە بكەی و بە ئازایەتی خۆتی لە قەڵەم بدەی نەك بە فەزڵی خودا.

یەكتاپەرستی (توحید)ی بێ گەرد و پوختەش ئەوەیە كە نەیەڵی نە خۆت و نە غەیری خۆت ببنە پەردە و خوات لێ وەشێرن.

---

(١) بێگومان جاری واش دەبین ریابازییەكە دەگاتە پلەیەك خوای گەورەی هەر تێدا ڕەچاو ناكرێ.

بەڵام _خوێنەری خۆشەویست_ ئەوەندەش بزانە کە زاڵ بوون و سەرکەوتن بەسەر بتە دەرەکی (خارجی)یەکان دا زۆر بەسێنایی ترە لە زاڵ بوون بەسەر بتی نێوەوەدا !!

هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ جەنگ کردنی لەگەڵ بتە دەرەکی‌یەکان دا بە تێکۆشانی گچکە (الجهاد الاصغر) حسێب کردوە و جەنگ کردنی لەگەڵ بتی دەروونی‌دا بە تێکۆشانی گەورە (الجهاد الاکبر) لە قەڵەم داوە.

خواش هەموو لایەکمان سەربخات بەسەر بتە دەرەکی و نێوەکی‌یەکان دا.

## گەوهەری شەشەم

## بڕوا و کردەوە لێک جوێ نابنەوە

بەڵێ لە ڕوانگەی مەکتەبی یەکتاپەرستی‌یەوە کردەوە و بڕوا شتاقیان بێ شتاقیان نابن و هەرگیز لێک ناترازێن، واتە: ناگونجێ و مەحاڵە ئیمان و بڕوا لە دڵ و دەروونێك دا نیشتەجێ بێت بەڵام کردار و ڕەفتاری لەگەڵ دا نەبێت، دیسان مەحاڵە ڕەفتار و کردەوەی ئیسلامی‌یانە لە یەکێك دا بەدی بکەی کە ئیمان و بڕوای نیە.

هەڵبەتە لەوەدا ڕاجیایی (اختلاف) نیە کە موسڵمانی سەرپێچی کەر و گوناهبار ئەگەر لە دنیادا پەشیمان نەبوویێتەوە و لە گوناهان پاك نەبوویێتەوە ڕۆژی دوایی بارتەقای تاوانەکانی دەسووتێنرێت، ئەوە شتێکە (اجماع)ی زانایانی لەسەرە، ئەمما سەبارەت بە کەسێك کە ئیدیعای ئیمان و بڕوا دەکات و خۆی بە موسڵمان لەقەڵەم دەدات بەڵام نە لەو شتانە دەپرینگێتەوە کە خوا حەرامی کردوون وە نە لەو شتانە نزیك دەبێتەوە کە فەرز و پێویستی کردوون زانایان دوو هەڵوێستی جودایان هەیە:

یەکەم: دەڵێن ئەگەر هەزار ساڵی بابایەک لافی موسڵمانەتی لێ بدات بەڵام هەر بە زار بێ و هیچی پێوە دیار نەبێ ئەوە فری بەسەر ئیسلامەتی‌یەوە نیە و ئیسلامەتی گەلێک گەلێک لەوە بەرزترە کە هەر بە لاف لێدان و ئیدیعایەکی بێ ئەساس ئینسانێک بە شوێن کەوتووی خۆی حسێب بکات.

دووەم: دەڵێن مادام کابرا گوتی ئیمانم هەیە و بڕوای بە خوا و پێغەمبەران و زیندوو بوونەوە و باقی ڕوکنەکانی ئیسلامەتی بوو ئەگەر هیچ ڕەفتار و کرداری ئیسلامی‌یانەشی نەبێت هەر بە موسڵمان حسێب دەکرێ.

هەڵبەتە بە پێی ڕای دەستەی یەکەم نابێ بابای نوێژ نەکەر و زەکات نەدەر و ڕۆژوو نەگر و پارێز نەکەر لە حەرام کراوەکان بچێتە بەهەشت و دەبێ هەتا هەتایە لە دۆزەخ دا بمێنێتەوە ، بەڵام لەسەر ڕای دووەم دوای سزاو جەزرەبەیەکی هاوسەنگ لەگەڵ تاوانەکانی‌دا لە جەهەندەمێ ڕزگاری دەبێ و دەچێتە نێو بەهەشتێ.

بێ گومان لەم دوو ڕایە هەر یەکێکیان ڕاستە چونکە دوو شتی دژ بەیەک ناگونجێ هەردووکیان ڕاست دەرچن، جا مادام وایە با چاوێک بە دەقە ئیسلامی‌یەکان‌دا بخشێنین بزانین هەق بە کام لایەیە:

لە کاتی توێژینەوەی ئایەتی دووەم دا ئیسلاممان بە درەختێک شوبهاند کە لایەنی بیروباوەڕ لە جێی ڕەگ و ڕیشان یەتی و لایەنی کردەوە و جێبەجێ کردنیش لە جێی قەد و لق و پۆپ و گەڵایانە، وە لەوێ گفتمان دا کە ئەو باسە زیاتر ڕۆشن بکەینەوە، هەڵبەتە بەجێ هێنانی گفت و پەیمانیش فەرزە ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾[1] ، جا ئەوە لێرەدا گفت (وعد)ەکەمان دەبەینە سەر:

---

(١) اسراء : ٣٧ .



Scanned by CamScanner

کەس توانای لاملی کردنی نیە لەوە کـە ئەگـەر سـەلماندمان ئیـسلام لـە هەموو شتێك دا وەکوو درەختەکە وایە و هیچ جۆرە جیاوازی‌یەکیان لە نێواندا نیە ئەو کاتـە چ حوکمێـك درەختەکـە بگرێتـەوە ئیـسلامەتیش دەگرێتـەوە، دەفەرموو بە دڵ تێ فکرە و ورد ورد سەرنج بدە:

لە سەرەتادا درەختەکە بە شێوەی نەمامێکی ساوا دەنێژرێ و ئەو سەرەی کە لە بارێ بنەوەیە ڕەگ و ڕیشان دەردەکا و ئینجا ئەو تام و چێژ و خواردن و بژێوەی کە پێویستە بۆ دەرکردنی چرۆ و گەڵایان بە ڕەگە وردیلەکانی دەی مژێ و بەرێی دەکات بۆ سەری[1] ، ئینجا بەو خۆراکە بەرێ کراوە چرۆ و لق و پۆپ و گەڵا پەیدا دەبن و فراژوو دەبن.

ئیسلامیش لە هەوەڵی‌دا نەمامی نەرم و شلکی عەقیدە و بڕوایە کـە لـە زەوی دڵ و مێشك دا چەقەرە دەدا و ڕەگان دادەکوتـێ ئینجـا لـەو خـۆراك و بژێوەی کە دڵ و مێشك لـە ئـەنجامی تێوەڕامـان و بـیر کردنـەوە لـە کتـێبی بوونەوەر و کتێبی قورئان دا وەدەستیان هێناوە پوختەیەکی ـ کە بریتی‌یە لـە ناسین و خۆشەویستی خوا و پێغەمبـەر و ﷺ هەسـت کـردن بـە بەندایەتی ـ بۆوانە دەکرێ بۆ و ئەندامانەی کە بە سەربازی بەو زەیـن و هـۆش حـسێب دەکرێن لە ئەنجامی ئەو کەین و بەینەش دا لق و پۆپ و قەد و گەڵای کردەوە و ئاکار و ڕەفتاری ئیسلامی‌یانە دروست دەبن.

(1) چونکە سەرسوڕمان لێرەدا ئەوەیە کە هێزی کێشندە (جاذبیة)ی زەوی ناتوانێ بەرگری لـە پێهەڵچوونی ئەو ئاوزووخە و بژێوە بکات هەرچەند سەرپێچی کردنیشە لە فەرمانی وی !! بەڵێ بەڵام حو... بالادەست ئەمری لەسەرە و دەبێ هێزی کێشندە گەردن کەچ بێت !!



Scanned by CamScanner

لێرەدا بە بیرم دا نایەت هیچ جۆرە جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ لە نێوان درەختی مەجازی ئیسلام و درەختی ڕاستەقینەدا هەبێت کە زەرەر بە وێ چواندن (تشبیه)ە کە بگەیەنێ.

ئێستا با کەرەتێکی دیکەش سەرنج بدەینە درەختە ڕاستەقینەکە: ئایا کێ ڕەگ و ڕیشە و بنەمای درەختی بەتەنێ دیوە بە بێ قەد و لق و پۆپ و گەلا ؟!

دڵنیام کە کەس نەی دیوە و کەسیش نای بینێ چونکە نیـە، ئەڵلاهومـە مەگەر ڕەگ و ڕیشەی وشك و برینگ و بێ گیـان ئـەویش هـەر بـە ڕواڵـەت جیاوازی هەیە لەگەڵ بەردێك یان کەستەکە گڵێك دا دەنا لـە ڕاستی‌دا هـیچ فەرقیان نیە، چونکە: شتاقیان ئـەو ڕۆڵـەی ڕەگ و ڕیـشە دەی گێـڕن پـێی هەڵناستن کە بریتی‌یە لە خۆراك هەڵمژین و دروست کردنی قەد و لق و پۆپ و گەلا:

ئێستا با بادەینەوە سەر درەختە مەجازی‌یەکە، دەڵـێین مـادام ئیسپاتمان کرد کە کت و مت وەك درەختی ڕاستەقینە وایـە و پێـشتریش گوتمـان ئەگـەر سەلمێنرا وەك یەکن دەبێ چ حوکمێك بەسەر یەکێکیان دا دەدرێ بەسەر ئـەوی دیشیان دا بدرێ و سەلماندیشمان کە وەك یەکن دەتوانین بـە ڕاشـکاوی بڵـێین : ڕەگ و ڕیشەی عەقیدەی ئیسلامی و خواپەرستی هەبوونی مەحاڵە بە بێ‌ی لق و پۆپ و چرۆی کردەوە و ئیلتیزام!!

قسەم لەوەی نیە کە عەقیدە و بنەمایەکی ووشك و ڕەق و تەق و بێ ڕودح بێت! هەڵبەتە ئەو جۆرە کەسانەش کە ئەم چەشنە عەقیدە و بـیر و بڕوایـەیان هەیە عەقیدە و بیرو بڕواکەیان چ فەرقی نین لەگەڵ ڕەگ و ڕیشە وشك و برینگە بێ گیانەکەی درەختی ئاین‌دا !



Scanned by CamScanner

## بەڵێ خوێنەری ئازیز!

ئەمامی بیر و بڕوا و عەقیدە و ئیمانی ئیسلامی لە زەمینەی هەر دڵێکدا ڕوا و چەقەرەی کرد و ڕەگ و ڕیشەی داکوتان یەکسەر بۆ چەسپاندن و سەلماندنی هەبوونی لەو شوێنەدا لق و پۆپ و چرۆ و گەڵای ئاکار و ڕەوشت و کردەوەی بڕوا دارانە دەکاتە هەویە و شایەتی بوونی لەوێدا.

کەواتە: هەروەك چۆن لەهەر جێیەك ڕەگ و ڕیشە و بنەمای دار و درەختان دیتران و لە گەڵیان دا قەد و لق و پۆپ و گەڵا نەدیتران بەڵگەی بێ خێری و وشك و برینگی ڕەگ و ڕیشەکانە بەهەمان شێوەش لەهەر ئینسانێك دا ئیدیعا کردنی هەبوونی ئیمان و بڕوا دیترا و کردار و ڕەفتاری موسڵمانانە و بڕوادارانە نەدیترا بەڵگەیە بۆ قرپۆکی و بێ خێری و بێ گیانی ئەو ئیمان و بڕوایە.

ئێستاش وای بە چاك دەزانم ژمارە گەلێك دەقی ئیسلامی بێنینەوە بۆ پتر ئاوەڵا کردنی مەبەست:

یەکەم: مەگەر چۆنەکایی دەنا لەهەر جێیەك وشەی ﴿الـذین ... ﴾ دێ وێڕای ویش وشەی ﴿وعملوا الصالحات﴾ هاتوە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە بڕوا و ئیمان بە بێ کردار و ڕەفتاری چاك نابێت.

دووەم: خوای زانا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1].



(١) التوبة : ٦ .

یانی: کاتێك ئەو مانگانەی جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە بەسەر چوون، کافرەکان بکوژن لەهەر جێ‌یەك وەبەر دەست تان کەوتن، وە بیان گرن و دەوریان بدەن و لە هەموو سەنگەران دا بۆیان دانیشن، ئینجا کە تۆبەیان کرد و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا وازیان لێ بێنن، خواش لێ بوردە و بە بەزەیی‌یە.

لێرەدا دەبینین خوای زانا و کاربەجێ فەرمان دەکات بە موسڵمانان کە لە کافران بجەنگێن و بیان کوژن بە هەموو شێوەیەك هەتا دەگەڕێنەوە بۆ ژێر ڕکێفی ئیسلام و نوێژ دەکەن و زەکاتی دەدەن.

کەواتە کافرەکان بە (٣) مەرجان بە موسڵمان حسێب دەکرێن و دەبنە بڕوادار:

١- گەڕانەوە لای خوا و ئیمان هێنان بە پەروەردگاریەتی خوا ﴿فان تابوا﴾.

٢- نوێژ کردن ﴿واقاموا الصلاة..﴾.

٣- زەکات دان ﴿وآتوا الزكاة..﴾.

سێیەم : خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ(٢)الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ..﴾[١].

یانی: بە ڕاستی بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە لە دەمی یاد کردنی خوادا دڵیان ڕادەچڵەکێ و کاتێك ئایەتەکانی ویان بەسەردا خوێندرایەوە ئیمانیان پتر زیاد دەبێ، وە پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ دەکەن و لەوەی پێمان بەخشیون دەبەخشن.

(١) الانفال : ٢-٤ .



Scanned by CamScanner

لێرەش دا دیسان دەبینین کە خوای بێ هاوتا کەسانێك بە بڕواداری ڕاستەقینە حسێب دەکات کە لە ترسی خوا دڵیان ڕادەچەنێ و پشتی پێ دەبەستن و ئیمانیان بە خوێندنی قورئانێ زیاد دەبێ و نوێژێ دەکەن و زەکاتێ دەدەن.

کەواتە کەسێك ئیمان و بڕواکەی ئەم دیاردانەی لەگەڵ دا نەبێ بایی پوولێکە و وەك پارەی قەڵب بەسەری‌دا دەدرێتەوە.

چوارەم: دیسان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾[1].

یانی: بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە و هیچ دوو دڵ نین، وە لە پێناوی ڕێبازی خوادا ماڵ و نەفسیان بەخت دەکەن، تەنیا ئەوانەن ڕاستان.

کەواتە: چەمکی پێچەوانە (مفهوم المخالفة)ی ئەم ئایەتە ئاوای لێ دێتەوە:

ئەوانەی بە ماڵ و نەفس لە پێناوی ڕێبازی خوادا خەبات ناکەن ڕاست ناکەن لە بڕوا دارێتی‌یەکەیان دا.

پێنجەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ليس الايمان بالتمني ولا بالتحلي ولكن هو ما وقر في القلب و صدقه العمل..))[2].

(۱) الحجرات : ۱٦ .

(۲) (ابن النجار و دیلمی) ڕیوایەتیان کردوە، تێبینی : فەرموودەناسان ئەم قسەیان بەهی ( الحسن البصري) داناوە .



Scanned by CamScanner

واتە: ئیمان خۆزگە خواستن و قسەی شیرین نییە بەڵکو ئەوەیە کە لە دڵدا جێگیر دەبێ و کرداریش ڕاستی دەگێڕێ و دەبێتە نمایەتی.

شەشەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة))[1].

واتە: لە نێوان ئینسان و کوفردا واز هێنانە لە نوێژ. کەواتە هەر کەسێک وازی لە نوێژ کردنی هێنا بە موسڵمان دانانرێ و دەچێتە پێڕی بێ بڕوایانەوە.

حەوتەم: دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((العهد الذي بيننا و بينكم الصلاة فمن تركها فقد كفر))[2].

یانی: ئەو پەیمان و سنوورەی لە نێوان مە و گاورەکان دا هەیە نوێژە جا هەر کەسێک وازی لێ هێنا کافرە.

هەشتەم: (ابن حزم الاندلسي) دەڵێت:[3] (کۆمەڵێک لە یارانی پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی دوای وانیش لەسەر ئەوەن کە بابای نوێژ نەکەر کافرە لەوانە: عمر بن الخطاب، عبدالله بن مسعود، عبدالله بن العباس، معاذ بن الجبل، جابر بن عبدالله، ابو الدرداء، لە غەیری هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ: احمد بن حنبل، عبدالله بن المبارك، النخعي، ابو أيوب السختياني، ابو داود الطيالسي، ابو بكر بن ابي شيبة، و زهير بن حرب، وە غەیری ئەوانیش[4].

(١) (احمد و مسلم والترمذي وابو داود و ابن ماجه) لە جابر بن عبدالله وە ڕیوایەتیان کردووە.

(٢) (احمد و ترمذي و نسائي و ابن ماجه) لە (بريدة)وە گێڕاویانەتەوە.

(٣) سەیری کتێبی (الله [illegible]) [illegible] بەرگی یەکەم لاپەڕە (٩٣) بکە.

(٤) تێبینی لە کتێبی ([illegible]) ، بەرگی یەکەم دا بەدرێژی باسی حوکمی بابای مسوڵمانە نوێژنەکەرمان کردووە و [illegible] کە لێرەدا تۆمارمان کردووە و هەڵمان بژاردووە لەوێش هەڵمان بژاردووە و [illegible] ، چونکە سەرچاوەکەی ، بۆیە پێویستی سەرلێ ئەوێ بدرێ.

لە کۆتاییدا دەڵێم : ئەم قەڵەمەی ئێستا پێی دەنووسم بۆیە ناوی لێ نراوە قەڵەم چونکە ئەرکی نووسین بەڕێوە دەبا و پێی دەنووسرێ ، بەڵام ئەگەر گریان لە نووسین کەوت ئایا ڕەوایە پێی بگوترێ قەڵەم ؟!

ئایا جیاوازی ئەم پێنووسە لەگەڵ چیلکە دارێك دا چیە ؟!

خۆشتلقیان لەرکی نووسین بەڕێوە نابەن، ئەگەر بگوترێ جیاوازییان ئەوەیە کە پێنووسە نەنووسەکە هەرچەند لە ڕاستیدا هیچی لە چیلکەکە زیاتر نیە بەڵام هەر چۆنێك بێت لە شێوەی پێنووس دایە !! لە وەڵام دا دەگوترێ کاتی خۆی لەبەر ئەوە پێیان نەگوتوە قەڵەم چونکە لەسەر شێوە و ڕوخساری قەڵەم بووە بەڵکو لە سۆنگەی ئەوەوە ئەو ناوەی بەسەردا بڕاوە کە پێی نووسراوە.

هەر بەم پێ و دانە کابرای موسڵمانیش بۆیە ناونراوە موسڵمان چونکە گەردن کەچی فەرمانەکانی خوایە، بەڵام وەختێك لە فەرمانەکانی خوا لاملی کرد و یاخی بوو هیچ صلقرول نیە ئەو ناوەی هەر پێوە بێ لەولاکە کاتی خۆی ئەو ناوەی بۆیە لێ نراوە چونکە ئەمستۆی بۆ ئەمری فەرمانی خوا و [illegible] کە [illegible] تەماوە و لای بووە و لای دایە ناوی [illegible] موسڵمانەتیشی پێوە نەماوە و لە ئیسلامەتی یە هەڵبڕاوە.

ئەلێ دەتوانێ بڵێین هەم قەڵەمە لە نووسین کەوتوەکەش و هەم موسڵمانە لە خواپەرستی دەرچووەکەش کاتی خۆی کە ئەرکی نووسین و خواپەرستییان بەجێ هێناوە بە قەڵەم و موسڵمان حسێب کراون، بەڵام ئێستا کە هەردووکیان ئەرکی خۆیان واز لێ هێناوە و لێی کەوتوون دروست نیە ناوە پێشووەکەیان هەر پێیانەوە [illegible]



Scanned by CamScanner

## بەڵێ خوێنەری ئازیز !

ئینسانی بێ کردار و ڕەفتـار بـە موسـڵمان دانـانرێ ئەگـەر مەرجـەکان هاتنەدی و بەربەستەکان لاچون هەر بۆیـەش لـەم سـوورەتە مەزنـەدا دەبیـنین بەندەکان دوای خوێندنی چوار ئایەتی پێشوو کـە بـڕوا دارێـتی تـەواوی تێدا دەردەکەوێ یەکسەر گوتوویانە: (اياك نعبد واياك نستعين)، چـونکە زانیویانـە کە ئیمانی بێ کردەوە و ئیلتیزام هەر قسەی ڕووتـە و وەك گـوێزێ کـوێر نێـو قرپۆك و پووچە.

جا خوایە بۆ خاتری گەورەیی و سـۆزی خۆت و خۆشـــەویســـتمان بۆ پێغەمبەر ﷺ بمان گێڕی لەوانەی کردەوە و ڕەفتارەکانیان شایەتی ئیمان و بڕوای موســـڵمانەتی یان دەدەن و بمان پارێزی لەوە کە هەر بە زار لافـی خواپەرستی لـێدەین ، ئامین.

## گـەوهـەری حـەوتـەم

## بۆچی ئیسـلام گرینگی بە یەکیەتی و پێکـەوە جۆش درانی کۆمەڵەی مسـوڵمانان دەدات ؟

لەبەر تیشکی حەوتەمین گەوهەری گرانبای دەریای ئەم ئایەتە مەزنەدا ئەم ڕاستی‌یە دێتە بەر چاوان:

گرنگی دانی ئیسلامەتی بـە یەکیـەتی و پێکـەوە جـۆش دانـی کۆمـەڵی موسـڵمانان:

چۆنیەتی دەرهێنانی ئەم گەوهەرەش ئاوایە: خوێنەری ئەم ئایەتـە پـەرۆزە لێرەدا ڕاناوی کۆ (جمع) بەکار دێنێ نەك ...اك (مفرد) واتە ناڵێـت: ﴿ایـاك



Scanned by CamScanner

اعبد﴾ هەر ئەتۆ دەپەرستم، بەڵکو خۆی ڕەگەڵ کۆمەڵی بڕواداران دەخات، کەواتە بێ بێنە و بەرە لەم ئایەتە دەفامرێتەوە کە ئینسانی موسڵمان بەتەنێ خوا ناپەرستێ و بە تەنیا خەریکی بەڕێوە بردنی بەرنامەی خوا نابێت بەڵکو لەگەڵ خوشك و برایانی تری هاو بیر و هاو ئامانجی دا بەو کارە هەڵ دەستێ.

ئەم ڕاستی‌یەش وەنەبێ هەر لێرەدا باسی کرابێ بەڵکو لە دەیان دەقی دیکەی ئیسلامی‌دا ڕانوێنراوە، بۆ وێنە:

١- ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾[1]

یانی: خوا بە ڕاستی ئەوانەی خۆش دەوێ کە بە کۆمەڵ و بەڕیز لە پێناوی‌دا دەجەنگن هەر دەڵێی دیوارێکی پێکەوە جۆش دراون !!

لێرەدا وێڕای فامرانەوەی ئەوە کە پێویستە بڕواداران لە کۆمەڵ دا خۆیان بنوێنن ئەوەش دەفامرێتەوە کە : یەکەم: پێویستە بەڕیز و بە ڕێك و پێکی خەبات بکەن. دووەم: پێویستە وەك چینی دیوار پێکەوە جۆش بدرێن و وەك بەنکە تەسبیحێك لە تەنیشت یەکەوە ڕیز بن و پاڵ وێك دەن و شان لێك بدەن.

٢- ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا...﴾[2] .

یانی: توند دەست بە بەرنامەی خواوە بگرن و لێك پەرتەوازە مەبن.

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ومن مات وهو مفارق للجماعة فأنه يموت ميتة جاهلية))[3]

یانی: هەر کەسێکی لە کاتێك دا بمرێ کە لە کۆمەڵی موسڵمانان جوێ بۆتەوە مردنێکی نەفامانە مردوە !!.

---

(١) صف : ٤ .

(٢) آل عمران : ١٠٤ .

(٣) (مسلم) ریوایەتی کردوە لە (عبدالله بن عمر)ەوە.



Scanned by CamScanner

٤- دیسان فەرموویەتی: ((كلكم راع و كلكم مسئول عن رعيته))[1].

واتە: هەر کامێکتان چاودێرە و هەر کامێکتان [illegible] میللەتەکەیدا بەرپرسیارە.

٥- هەروەها فەرموویەتی: ((ولا تباغضوا، ولا تحاسدوا، ولا تدابروا، ولا تقاطعوا و كونوا عباد الله اخواناً، ولا يحل لمسلم ان يهجر اخاه فوق ثلاث..))[2].

واتە: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئیرەیی بە یەکتر مەبەن، وە پشت لە یەکتر مەکەن، وە لێك دابڕ دابڕ مەبن، هەمووتان بەندەی خوا و برای یەك بن، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ موسڵمانێك کە دەنگ لە براکەی دابڕێ پتر لە (٣) سێ ڕۆژان.

٦- لە جێیەکی دی فەرموویەتی: ((مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى))[3].

یانی: وێنەی بڕواداران لە دۆستایەتی و بەزەیی بە یەکتردا هاتنەوەیان و میهرەبانییان لەگەڵ یەك دا وەك جەستەیەك وایە، کاتێك ئەندامێکی تووشی ئازارێك دەبێ هەموو ئەندامەکانی تری لەش لێی دەگیرێنەوە بە شەوخوونی و گرانەتێ.

هەڵبەتە ئەمانە لوێچێك بوون لە تەغارێکی ئەو دەقە ئیسلامییانەی دەربارەی چۆنیەتی و شێوەی پێك هاتن و بەرێوە چوونی کۆمەڵگای ئیسلامی

---

(١) (بخاری و مسلم) ڕیوایەتیان کردوە لە (عبدالله بن عمر)ەوە.

(٢) (بخاری و مسلم) ڕیوایەتیان کردوە لە (انس)ەوە.

(٣) (بخاری و مسلم) ڕیوایەتیان کردوە لە (ابو موسى الاشعری)یەوە.



Scanned by CamScanner

دەدوێن کە دەتوانین لە دوو سێ دێڕدا [illegible] بکەینەوە: "ئیسلام دەیەوێ موسڵمان بە تەنیا نەبێ [illegible] و کاریگەر بێت لە نێو کۆمەڵێک موسڵمانی ڕێک و پێک و ڕیز بەستوو و پێکەوە جۆش دراو و تێک ترنجاودا.

بێگومان ئەم باسە یەکجار گرنگە و [illegible] و توێژینەوەیەکی فرە هەڵدەگرێ، کورد گوتەنی: ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەک کە ڕەنگە لە بابای ژیر و وردبین شێرراوە نەبن بەم ئەندازەیە وازی لێ دێنین، بەڵام دوای ئاراستە کردنی پرسیارێک و وەڵام دانەوەی:

هۆی بایەخ دانی ئیسلام بە ڕیز بەستنی موسڵمانان و خۆ نواندنیان لە کۆمەڵێکی ڕێک و پێک و جۆش دراودا چیە؟!!

لە وەڵام دا دەڵێین:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام بەرنامە و ڕێبازێکە بۆ سەر لەبەری ژیانی ئینسان بە تاک و کۆمەڵەوە و سەرتاپای لایەنەکانی ژیانی وەبەرخۆ دەدات و هیچی لێ نابوێرێ چ مەعنەوی بێت چ سیاسی چ ئابووری چ کۆمەڵایەتی...چ...چ...هتد، بەڵێ لە سۆنگەی ئەمەوە، مەحاڵە تاقە ئینسانێک بتوانێ بەتەنێ بەسەریدا بڕوا و بەندایەتی خوای بەرزو مەزن بەجێ بێنێ، نەک هەر تاقە ئینسانێک بەڵکو کۆمەڵە مرۆڤێکی زۆریش _مادام پرژو بڵاو بن سەرەو بەرەو لێک ترازاو بن_ ناتوانن ئیسلامەتی بەڕێوە ببەرن و لە گشت لایەنەکانی ژیانیان دا دەستوور و یاساکانی خوا بکەنە ڕێباز و ڕاستە شەقامی ژیان، جا لەبەر ئەوە ئاینی ئیسلام ئەو هەمووە گرنگیەی بە ڕێک و پێکی و ڕیز بوونی موسڵمانان داوە.

جا خوای بەبەزەیی ڕێنمایی‌مان بکات بۆ بیر کردنەوەی ڕاست و ئاخاوتنی ڕاست و ئیش کردنی ڕاست، وە بمان گێڕێ لەوانەی لە پێناوی ڕازی کردنی خوا و بەجێ هێنانی ئەرکی بەندایەتی و خزمەت کردنی ڕێبازەکەی‌دا هەموو بەرژەوەندی‌یەکی شەخسی دەخەنە ئەولا.

# گەوهەری هەشتەم

## ئیمان و بڕوا تاقە بنچینەی کۆمەڵگای ئیسلامیە

کۆمەڵگای ئیسلامی تەنیا یەک بنچینە و بنەمای هەیە لەسەری ڕاوەستێ، بە تەعبیرێکی تر ئەو شتەی دەتوانێ هەموو موسڵمانان پێکەوە گرێدا و بیان هۆنێتەوە تەنیا شتێکە ئەویش ئیمان و بڕوایە:

شکی تێدا نیە هەر کۆمەڵ و پێڕو تاقمێك پێویستە بنچینەیەکی هەبێت کە لەسەری ڕاوەستێ و هەموویان کۆ بکاتەوە، جا ئەو بنەما و بنچینەیەی کۆمەڵگای موسڵمانانی لەسەرخۆ دەبێتەوە و لاقانی لەسەر دەچەقێنێ بریتی‌یە لە ئیسلامەتی و ئیمانداری.

لە مەکتەبی ئیسلام دا هیچ کام لە ڕەنگ و زمان و ڕەگەز و بنەچەکە و سنووری جوگرافیایی و ئاستی ئابووری نەکراونە بناغەی کۆمەڵگای ئیسلامی، با بزانین بۆچی؟!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام بەبیرەوو پرۆگرامی خوایە بۆ گشت ئینسانەکان بە تەعبیرێکی تر ڕێنموونی و نامەی بەدی هێنەرە بۆ وەدی هێنراوەکانی، شتێکی وا کراوە بە جوغز و بازنەی تێدا خڕ بوونەوەی شوێن کەوتووانی بەرنامەی خوا کە بتوانێ هەموو ئینسانەکان لەهەر تیرە و نەتەوە و



Scanned by CamScanner

ڕەگەزێك بن و هەر ڕەنگ و زمانێکیان هەبێت لە نێو خۆیدا بحەوێنێتەوە و هەموویان بخاتە بن باڵی میهرەبانی خۆیەوە.

بەڵام ئەگەر هاتبا و پەروەردگار سنوورێکی تەسکی کردبا بە جوغزی خڕ کردنەوەی ئینسانەکان وەك:

١- تیرە و هۆز بۆ وێنە : جاف.

٢- یان نەتەوە بۆ وێنە : کورد.

٣- یان ڕەگەز بۆ وێنە : ئاری.

٤- یان ڕەنگ بۆ وێنە : سپی پێست.

٥- یان زمان بۆ وێنە : هیندی.

٦- یان باری ژیان بۆ وێنە : هەژاری.

٧- یان ئاستی بیر و هۆش بۆ وێنە : خوێندەواری.

ئەوە لە حاڵەتی یەکەم دا بێجگە لە عەشیرەتی جاف و، لە حاڵەتی دووەمدا بێجگە لە نەتەوەی کورد و، لە حاڵەتی سێیەم دا بێجگە لە ڕەگەزی ئاریو، لە حاڵەتی چوارەم دا بێجگە لە سپی پێستەکان و، لە حاڵەتی پێنجەم دا بێجگە لە هیندی زمانەکان و، لە حاڵەتی شەشەم دا بێجگە لە هەژارەکان و، لە حاڵەتی حەوتەم دا بێجگە لە خوێندەوارەکانی لە نێو خۆیدا نەدەحەوانەوە، بێگومان ئەوەش شتێکی ڕەوا نیە و لەگەڵ دادگەری و کاربەجێی خوادا ناسازێن.

جا بۆیە پەروەردگار مەودای بەرنامەکەی هێندە لێك کێشاوەتەوە ـ بە بەراوەژووی ڕێچکە و کوێرە ڕێ دەسکردەکانەوە ـ کە هەموو ئینسانەکان بتوانن لە ژێر سێبەریدا بحەوێنەوە و بە یەکێك لە شوێن کەوتووانی حسێب بکرێن.

جا لەبەر ئەوەی ئێرەکانە جێی تەرجمان کردنی تۆژینەوەی ئەم باسە نیە[1] بە هێنانە بەرچاوی چەند دەقێکی ئیسلامی کۆتایی بە باسەکە دێنین:

١- خوای تاک دەفەرموێ: ﴿لاَ تَتَّخِذُوا آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[2].

واتە: ئەی بڕواداران باب و برایانتان نەگرن بە دۆست کە کافرێتیان هەڵبژارد بەسەر ئیمان دا هەر کەسێکیش لە ئێوە بە دۆستیان حسێب بکات ئەوانە ستەم کارن.

٢- دیسان فەرموویەتی: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾[3].

یانی: بەڕاستی ـ ئەی موسڵمانان ـ پێشڕەوێکی باشتان هەیە لە ئیبراهیم و شوێن کەوتوانی دا کە بە نەتەوەی خۆیان گوت: ئێمە لێتان بەریین و لەوەش کە دەی پەرستن لەباتی خوا بڕواتان پێ ناکەین، وە دوژمنایەتی و ڕق و قین لە نێوانمان دا هەیە هەتا هەتایە تاکو بەتەنێ بڕوا بەخوا دێنن.

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ...﴾[4]

---

(١) ئەڵقەی چوارەمی زنجیرەی (دەیەرێك راچوونی ئیسلام و ڕێچکەکان بەسەر [illegible] بۆ لێکۆڵینەوە و چارەسەر کردنی ئەم مەسەلەیە تەرخان کراوە، ئەڵقە [illegible] چاپی بە چواران [illegible]، وەک هەموو ئەڵقەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە، [illegible] (١، ٢، ٣، ٤) چاپ کران.

(٢) التوبة : ٢٣ .

(٣) الممتحنة : ٤ .

(٤) المجادلة : ٢٢ .

یانی: میللەتێکت وەدەست ناکەوێ بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێ، کەسێکیان خۆش بوێ کە دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکات، با ئەوانە باییان یان کوڕیان یان برایان یان عەشیرەتیان بن، ئەوانە _واتە ئەو موسڵمانانە_ خوا ئیمان و بڕوای لە دڵیان دا جێ گیر کردوە.

کەواتە: خوێنەری ئازیز ! مادام خۆت بە شوێن کەوتووی ڕێبازی خوا دەزانی و دەتەوێ لە تاقی کردنەوەی ئەم ژیانەت دا دەرچی و لە ئاوری دۆزەخێ سەرفراز بی و بە بەهەشتی بەرین شاد بی بۆت نیە دۆستایەتی و برادەرایەتی بگری لەگەڵ بابایەکی بێ دین و نا موسڵمان دا با باب و خزم و خوێشیش بێ، تەنیا لە کاتێك دا نەبێ کە بتەوێ بەرەو سەرچاوەی زوڵاڵ و سازگاری بەرنامەی خوای بەخشندەی بێنی و لە چەنگ گومڕایی و سەرگەردانی ڕزگاری کەی، بەڵێ تەنیا لە حاڵێکی وادا نەبێ بۆت نیە لێی نیزیك وەبی و لەگەڵی‌دا بگەڕێی و تێکەڵاوی لەگەڵ دا بەرقەرار بکەی.

لێرەدا دەمەوێ بە خێرایی نیگایەك بخشێنین بە مەسەلەیەك دا کە لەسەر دڵی زۆر کەس بۆتە گرفت و گرێ کوێرە، ئەویش مەسەلەی نەتەوایەتی‌یە:

هەڵبەتە وەك گوتمان لێرەدا تەنیا سەرنجێکی خێرایی دەدەینە ئەو مەسەلەیە چونکە لەجێیەکی دیکەی تەرخان کراودا تا ڕاددەیەك ئاوەڵامان کردۆتەوە[1]:

خوای مەزن ئیسلامی بە گوێرەی سروشتی ئینسان ناردوە و هیچ جۆرە کەم و کەسری و زیادە ڕەوی‌یەکی تێدا نایەتە بەرچاو.

مەسەلەی خۆشەویستی گەل و نیشتمانیش یەکێکە لە غەریزە پێك هێنەرەکانی سروشتی ئینسان، مادام وایە پێویستە لە ئیسلام دا ئەو

(1) لە کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی) دا کە لە ئەسڵ دا ئاڵقەی چوارەمی زنجیرەی: (دەبیەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) ە، بڕوانە چاپی چوارەمی کە نووسینگەی تەفسیر کردوویەتی.

غەریزەیەش ڕەچاو کرابێت، هەروەك چۆن گشت غەریزەکانی تری ئادەمی تێدا ڕەچاو کراون و حیسابیان بۆ کراوە، وەك غەریزەی : خواردن و خواردنەوە ﴿وكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا﴾[1] ، بخۆن و بخۆنەوە و زیادە ڕەوی مەکەن. غەریزەی جل و پۆشاك : ﴿يَابَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ..﴾[2] ، ئەی وەچەی ئادەم پۆشاکمان بۆ ناردوون ئەو ئەندامانەتان دادەپۆشێت کە حەز ناکەن بە دەرەوە بن. وە غەریزەی شت هەبوون (التملك): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ..﴾[3] ئەی بڕواداران ماڵ و دارایی‌تان بێ ئاگاتان نەکات. وە غەریزەی جینسی : ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ..﴾[4] ژنانتان جێی زاووزێ و بەرهەم هێنانی ئێوەن هەر کاتێکی ویست تان بچنە لای کێڵگەکانتان بچن.

هەروەها هەموو غەریزەکانی دیکەی ئینسان هەر بەم شێوەیە، جا مادام لە سروشتی ئینسانیش دا هەیە کە ئەو میللەتەی خۆش بوێ کە لە نێویان دا پێ گەیوە و ئەو خاك و ئاوەی خۆش بوێ کە تێ‌یدا پێ گەیوە، نابێ ئیسلام ڕێی لە ئینسان گرتبێ کە گەل و هۆز و خاك و نیشتمانەکەی خۆش بوێ، چونکە ئەگەر گرمان ڕێی لێ بگرێ مانای وایە ڕێ لە غەریزەیەکی ئینسانی دەگرێ، ئەمما چونکە چ ئینسانیش و چ ئیسلامیش هەردووکیان لە کارگەی بەدی هێنەرێك دا دروست بوون و ڕەخساون مەحاڵە و چاوەڕوان نەکراوە کە تێك بگیرێن و لە ڕاستێك ڕابێن.

---

(١) الأعراف : ٣١ .

(٢) الأعراف : ٢٦ .

(٣) المنافقون : ٩ .

(٤) البقرة : ٢٢٣ .



Scanned by CamScanner

کەواتە ئیسلامەتی دژی ئەو چەشنە نەتەوایەتی‌یە نیە کە سروشتی ساغی ئینسان دەی خوازێ، بەڵام ئەو چەشنە نەتەوایەتی‌یەی لە ئەندازەی سروشتی خۆی دەچێتە دەرێ و دەبێتە ڕەگەز پەرستایەتی و بت پەرستێتی و بە کورتی دەبێتە (فاشیزم و شۆڤینیزم) ئەوە بە هیچ ڕەنگێك لە بەرنامەی خوادا ڕەوا نیە و بە توندی تاوانبار دەکرێ، چونکە ئەو کاتە لەگەڵ بنچینە ئیسلامی‌یەکەدا تێك دەگیرێن و دژایەتی پەیدا دەکەن، هەڵبەتە هەر شتێکیش لەگەڵ دەستوور و یاساکانی بەرنامەی خوادا دژ بوەستێ ڕەفز دەکرێ و مۆری ناهەقی پێوە دەنرێ، چونکە ئێمە لەسەر ئەو بنچینەیە پەروەردگارمان بە خوای خۆمان زانیوە و دەی پەرستین و گەردن کەچی بەرنامەکەی دەبین کە لە هەموو سیفەتێك دا تەواوە و بێ لەکەیە و هەرچی بی فەرمووی(١٠٠ ٪ ) ڕاستە و بێ خەوشە.

## خوێنەری ئازیز !

ئەوەش کۆمەڵێك بوون لەو گەوهەرانەی کە بە چاوی بێ هێزی بەندە لە دەریای دەوڵەمەندی (اياك نعبد واياك نستعين)دا دیتران، بەڵام نەچی وا بزانی هەموو شتێك گوتراوە و لە بنی کدووی دراوە، چونکە قەت قەت سنووردار (محدود) بۆی نالوێ بێ سنوور (لا محدود) دەورە بدات و دەنێو خۆی بگرێت، ئایا لە پەرداخێك دا ئاوی زەریاکان دەحەوێتەوە و جێی دەکرێتەوە ؟!

ئێستاش نۆرەی ئایەتی شەشەمینە و دەمێکە چاوەڕوان دەکا، ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ؟﴾[1] یانی: بە ڕاستی قورئانمان سێنا کردوە بۆ حاڵی بوون ئەوە کەس نیە بێ لێی حاڵی بێ؟!

---

[1] القمر : ١٥ .

# تەفسیری ئایەتی شەشەم

## ﴿ اهدنا الصراط المستقيم ﴾

## ڕێنمایی مان کە بۆ ڕێی ڕاست

مانای وشەکان:

إهدنا: (راغب الاصفهانی) دەڵێت: (الهداية_دلالة بلطف) واتە: هیدایەت ڕێنمایی کردنێکی هێدی و نەرم نیانە.

ئینجا دەڵێت : ڕێنمایی کردنی خواش بۆ ئینسان چوار شێوەی هەیە:

یەکەم: ئەو ڕێنموونی‌یەی کە هەموو ئینسانێکی گرتۆتەوە ئەویش بریتی‌یە لە ژیری و فام و تێ گەیشتن، وەك فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾[1] .

دووەم: ئەو ڕێنموونی‌یەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (عليهم السلام) وە کتێبە خوایی‌یەکان ناردوویەتی: وەك فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا...﴾[2].

سێیەم: ئەو ڕێنموونی و یارمەتی دانەی تایبەتە بەو کەسانەوە کە هیدایەتی دراوە و ڕێبازی خوای گرتوە، خوای گەورەش لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى﴾[3] ، وە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾[4] .

---

(١) طه : ٥٠ .

(٢) السجدة : ٢٤ .

(٣) محمد : ١٧ .

(٤) التغابن : ١١ .



Scanned by CamScanner

چوارەم: ڕێنمایی کردنی ڕۆژی دوایی بۆ چوونە ناو بەهەشتی، وەک فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا..﴾[1]

هەڵبەتە ئەو چوار هیدایەتانەش پێکەوە پەیوەستن و هەر کامێکیان ئەنجامی ئەوی پێش خۆیەتی، چونکە کەسێک نی یەکەمیانی بۆ نەڕەخسابێت نی دووەمی لێ چاوەڕوان ناکرێ، وە کەسێکیش دووەمی نەبێت نی سێیەمی بۆ پەیدا نابێت، وە هیچ کەسێک نی چوارەمی بۆ نایەتە دی تاکو ئەو سێیانەی پێشەوەی تێدا نەهاتبێتە دی..."[2]

دیارە لێرەدا وشەی (هدایة) بە مانای جێگیربوونیەمیان بەکار هێنراوە واتە: ئەو ڕێنموونییەی کە خوا دەیبەخشێتە بەندەکانی کە ڕێبازی خوای گرتووە. پێشەوای توێژەرەوانی قورئانیش (ابو جعفر الطبري) هەر لەسەر ئەم ڕایەیە وەک دەڵێت: (و معنى قوله ﴿اهدنا الصراط المستقيم﴾ في هذا الموضع عندنا: وفقنا للثبات عليه).

یانی مانای (اهدنا...) لێرەدا لە کن مە: یارمەتی مان بدە کە لەسەر ڕێی ڕاست بمێنینەوە[3]...

الصراط المستقيم: ابو جعفر الطبري دەڵێ: (اجمعت الامة من اهل التأويل جميعاً ان الصراط المستقيم هو الطريق الواضح الذي لا اعوجاج فيه و كذلك ذلك في جميع لغات العرب).

---

[1] الأعراف : ٤٣.

[2] معجم مفردات الفاظ القرآن [illegible] لاپەرە (٥٣٦).

[3] جامع البيان بەرگی یەکەم [illegible] لاپەڕە شەشەم.

واتە: گشت توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوەن کە ﴿الصراط المستقیم﴾ ئەو ڕێیە ئاشکرا و ڕاستەیە کە هیچ پێچ و پەنای تێدا نیە، هەروەها لە هەموو زار_دیالێکت_ە کانی عەرەبیش دا هەر وایە.

ئینجا دوای چەند قسەیەکی دیکە دەڵێت: وە ئەوەی کە بەلای منەوە چاکترە بۆ مانای ئەم ئایەتە واتە: ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾ ئەوەیە کە مەبەست لێرەدا ئەوە بێت: یارمەتیمان بدە کە لەسەر ئەو ڕێبازە بەرقەرار بین کە هەڵت بژاردوە و بەندە خۆشەویستەکانی خۆتت بۆ ڕێنمایی کردوە، کە ئەویش ڕێی ڕاستە.

چونکە هەر کەسێك ڕێنمایی بکرێ و یارمەتی بدرێ بۆ گرتنی ئەو ڕێیەی ئەوانە گرتوویانە کە خوا پێداون لە پێغەمبەران و صدیقان و شەهیدان ئەوە ڕێنمایی کراوە بۆ ئیسلام و باوەڕ بە پێغەمبەران و پابەند بوون بە قورئانەوە و ئیش کردنی بەوە کە خوا ئەمری پێ کردوە و ڕەوینەوە لەوە کە خوا بەرگری لێ کردوە و شوێن کەوتنی ڕێ و شوێنی پێغەمبەر ﷺ و ڕێ وشوێنی ئەبو بەکرو عومەر و عوسمان و عەلی خوایان لێ ڕازی بێ و هەر بەندەیەکی تری خواپەرست، هەموو ئەوانەش لە ﴿الصراط المستقیم﴾دا هەن[1].

کەواتە پوختەی قسان ئەوەیە کە مانای: ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾یانی: خوایە ڕێنمایی‌مان بکە بۆ ئیسلام و یارمەتی‌مان بدە کە لەسەری بەردەوام بین.

ئێستاش با بچینە سەروکاری ئەو مرواری و گەوهەرانەی لە دەریای دەوڵەمەندی‌دا هەن و بە پێی توانا و بۆ لوان برێکیان لێ دەرێنین و لەسەر سینی زمانی کوردی بۆ خوێنەرانی ئازیزیان ڕانوێنین:-

(١) سەیری (جامع البیان) بکە بەرگی یەکەم تەفسیری سوورەتی فاتیحە.

# گەوهەری یەكەم

## بەرنامە و ڕێبازی ژیان پێویستە تەنیا لە لایەن خواوە نەخشەی بۆ بكێشرێ و دابنرێ

چونكە ئینسان هەرچەندە زانا و بلیمەت و لێ هاتوو بێ شتی وای لە باران دا نیە و لە ئاقار كاری وادا داماو دەستەو ستانە. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش دوو بەڵگان دێنینەوە:

بەڵگەی یەكەم:

بێزاری و نارەزایی دەربڕینی زانا و مشوور خۆرانی وڵاتە ڕۆژئاوایی و ڕۆژ هەڵاتی یەكان سەبارەت بەو باروذۆخەی تێیدا دەژین و بەو ڕێ و ڕەسم و دەستوورانەی حوكمیان بەسەردا دەكەن، وە ئیعتیراف كردنیان بە كەم و كوڕی و ناتەواویی ئەو ڕێچكانەی ئینسان دای ناون :

هەڵبەتە ئێمە ناتوانین هەڵوێستی هەموو ئەو زانا و ڕدێن سپی یانە بخەینە بەرنیگا كە بە دەست شارەستانەتی یە ماددی یە بێ ئەخلاق و بێ ڕووحەكەیانەوە زاڵەیانە چونكە نەك هەر لە قەرەی چەند لاپەڕەیەك بگرە لە قەرەی چەند كتێبێكیش دا نین، بەڵام لوێچێك نیشانەی تەغارێكی یە و چەند نمونەیەكی دێنینەوە:

١- شایەتی دانی دكتۆر (الكیس كاریل) كە پاداشتی (نۆبل)ی ستاندوە ئەو كابرایە لە كتێبی (ئینسان ئەو نەناسراوە)دا دەڵێت: [1](...هەرچەندە

---

[1] سەیری كتێبی : (الإنسان ذلك المجهول) بكە ص ٢٩، ٣٠، ٣١.

پزیشکان و فێرکاران و زانایانی تەندروستی زان بە دڵاوایی‌یەوە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ سوودی ئینسان ئەمما نەگەیونە ئامانج، چونکە ئەوان چەند نەخشە و پیلانێکیان ڕۆناوە کە تەنیا بەشێك لە ڕاستی‌یان لە نێو خۆ گرتوە.

وە دەگونجێ ئەم قسەیە سەبارەت بە وانەش بگوترێ کە ئارەزوو و خەیاڵ و ویستێکی تر دەگۆڕنەوە لە پێناوی هێز و پێزی ئینسانی‌دا[1]...وە ئەو خاوەن بیردۆزانە شارەستانەتی‌یەك دروست دەکەن کە هەرچەند بە ئامانجی وەدەست هێنانی بەختەوەری مرۆڤ ڕەخسێنراوە بەڵام تەنیا لەگەڵ ڕواڵەتێکی ناتەواو یان شێوێنراوی ئینسان دا دەگونجێ. (باش سەرنج بدە).

ئەو ڕژێم و بەرنامانەی خاوەن بیردۆزەکان لە بیری خۆیان دا دروستیان کردوون هیچیان لە باران دا نیە... ئاخر بەندەکانی شۆڕشی فەرەنسا و خەیاڵاتی (مارکس) و (لینین) تەنیا بەسەر چەند بابایەکی وشك دا دەچەسپێن.. مادام وابێ پێویستە بە ئاشکرا بزانرێ کە دەستوور و ڕێ و ڕەسمی پەیوەندی‌یەکانی ئینسانەتی تا ئێستا نەناسراون!، چونکە زانیاری‌یە کۆمەڵایەتی و ئابووری‌یەکان چەند زانیاری‌یەکی گۆترەکارین.

بەو پێ‌یە دەردەکەوێ کە ئەو بارودۆخەی زانیاری و تەکنۆلۆجیا تێیدا سەرکەوتوە و بۆ ئینسانی ڕەخساندوە لەگەڵ ئینسان دا ناسازێ، چونکە هەر لە خۆوە و بە گۆترە کاری دروست کراوە و بە بێ ڕەچاو کردنی هیچ چەشنە تێوەڕامانێك لە سروشتی ڕۆنراوە.

ئینجا درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێت:

---

(٢) وا دیارە وەرگێڕە عارەبەکە چاك نەی توانیوە چەمکی ئەو بەڵە دوور دێڕە دەربڕێ، هەڵبەتە ئەمنیش ئەو چی نووسیوە هەر ئەوەم وەرگێڕاوەتەوە.

پوختەی مەبەست، زانیارییە ماددییەکان فرە وەپێش کەوتوون و پەرەیان ستاندوە، ئەما زانیارییە ئینسانیەکان لە حاڵەتێکی سەرەتایی دان، هۆی هێواش بەرەو پێش چوونی زانیاری ژیان (علم الحیاة)یش دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتە جۆر بە جۆرەکانی ژیانی ئینسان و باروزرووفەکانی، وە هاڵۆزی دیاردەی ژیان، وە بۆ جۆری پێك هاتنی ژیریمان کە زۆر زۆر دڵخۆشە بە نقووم بوون لە دنیای ماددی و میکانیکیدا.

... پێویستە ئینسان پێوەری هەموو شتێك بێت بەڵام واقیع بە بەراوەژووەوەیە، ئینسان زۆر ڕیز پەڕ و غەریبە لەو دنیایەدا کە دروستی کردوە، ئینسان نەی توانیوە دنیای خۆی ڕێك و پێك بکات چونکە شارەزایی ڕاستەقینەی دەربارەی خۆی نیە...ئەو نێوەندەی کە ژیری و زانستیمان هێناویەتە دی گونجاو نیە بۆ مە... ئێمە گەلێکی چارە ڕەشین چونکە ژیری و ڕەوشتمان دادەبەزێ و نزم دەبێتەوە..

ئەو دڵە ڕاوکێ و غەم و پەژارەیەی دانیشتووانی شارە هاوچەرخەکان بە دەستی‌یەوە دەناڵێنن زادەی ڕژێمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی‌یەکانیانە.. ئێمە کوشتەی دواکەوتوویی زانیارییە ئینسانی‌یەکانین لە زانیارییە ماددی‌یەکان.

ئینجا دەڵێت: تاقە ڕێی چارەسەر کردنی ئەم گیروگرفتە و لابردنی ئەم کۆسپە پەیدا کردنی زانیاری‌یەکی قووڵ ترە بە نەفسی خۆمان... جا مادام شارستانەتی ماددی هاوچەرخ حاڵەتی سروشتی ژیانی تێك شکاندوە و شێواندوویەتی، زانیاری ئینسان ناسی لە هەموو زانیاری‌یەك پتر بۆتە پێویست."



Scanned by CamScanner

بەڵێ لە ڕوانگەی (الكسیس كاریل)ەوە پتر شارەزا بوون دەربارەی ئینسان تاقە ڕێی چارەسەر كردنی گیروگرفتەكانمانە و تاقە ڕێی ڕاست كردنەوەی لاتەڵی و خواری باری ژیانی شارەستانەتی ماددی ئەمڕۆیە، بەڵام لە ڕاستیدا (الكسیس كاریل) پەی بە دەرمانی ڕاستەقینە نەبردوە و زۆریش جێی گلەیی نیە چونكە ئەو لە نێوەندێكی وادا ژیاوە كە لە ئیسلام بێ خەبەری تا ڕاددەیەكە كە هەندێكیان هەر ناویشیان نەبیستوە دەنا لە ڕاستیدا ئەو تاكە ڕێ و ئەو تاقە دەرمانەی دكتۆر (كاریل) بە دوایدا وێڵە تەنیا ئیسلامە، بەڵێ تەنیا ئیسلامە كە هەموو لایەنەكانی مرۆڤ ڕەچاو دەكا و هیچیان پشت گوێ ناخات، تەنیا ئیسلامە كە وێڕای گرنگی دانی بە پیشەسازی وئاوەدانی گرنگی‌یەكی زۆریش بە لایەنی ڕووحی و ئەخلاقی ئینسان دەدا و نایەڵێ لاتەڵ بێ و خوار و خێچ بێت. دیسان د.كاریل دەڵێت:

(لە ڕاستیدا مرۆڤایەتی هەوڵێكی زۆری داوە خۆی بناسێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە خەزێنەیەك زانیاری و تێبینی‌مان هەیە كە زاناو فەیلەسووف و شاعیر و زانا گەورە ڕووحی‌یەكان كۆیان كردۆتەوە، تا ئێستا تەنیا چەند لایەنێكی دیاری كراومان لە نەفسی خۆمان ناسیوە، ئێمە نازانین ئینسان بە شێوەیەكی گشتی بریتی‌یە لەچی..ئێمە هەر هێندە دەزانین ئینسان لە چەند پارچەیەكی لێك جوودا پێك هاتوە..هەر كامێكمان پێك هاتوە لە كۆمەڵە تارماییەك لە نێوەڕاستیدا ڕاستی‌یەكی نەناسراو هەیە !!

..لە ڕاستیدا نەزانی‌یەكەمان هەمە لایەنەیە، چونكە زۆربەی ئەو پرسیارانەی ئەوانە ناڕاستەیان دەكەن كە دەربارەی مرۆڤ لێ دەكۆڵنەوە بە بێ وەڵام ماونەوە چونكە چەند لایەنێكی بێ سنوور لە دنیای شێرراوەمان دا هەن كە هەتا ئێستا پەییان پێ نەبراوە.



Scanned by CamScanner

ئێمە تا ئێستا وەڵامی زۆر پرسیاران نازانین بۆ وێنە:

چۆن مادده کیمایی‌یەکان پێکەوە دەنووسێن بۆ پێکهاتنی ئەندامەکانی خانە؟!

چۆن (کرۆمۆسۆمەکان)[1] کە لە نێوەڕاستی هێلکۆڵەی پیتێنراو (البویضة الملقحة)دا هەن سیفەتەکانی ئینسان لەو هێلکۆڵە وەردەگرن؟!

چۆن خانەکان سەربەخۆ بە کۆمەڵ ڕیز دەبن و دەبنە هۆی پێکهێنانی شانەو ئەندامەکان؟! ئەو خانانە هەر دەڵێی پۆلە مێروو و مێشەنگوینەن پێشەکی ئەو ئەرکە دەزانن کە بۆیان دیاری کراوە؟

پێکهاتنی سروشتی دەروونی و فسیۆلۆجی‌مان چۆنە؟!

ئێمە دەزانین کە لە چەند شانە و ئەندام و شلەیەك پێکهاتووین، ئەما پەیوەندی نێوان شعوور و دەماغ (مێشك) تا ئێستا نهێنی‌یە.

ئێمە تا ئێستا پێویستی‌مان بە شارەزایی تەواو هەیە دەربارەی فسیۆلۆجیای خانەکانی مێشك..تا چ ئەندازەیەك ئیرادە کار دەکاتە سەر لەش؟

ژیری چۆن تەئسیری تێ دەکرێ لە لایەن ئەندامەکانەوە...

ئێمە تا ئێستا زۆر دوورین لە ناسینی ماهیەتی پەیوەندی‌یەکانی نێوان پەیکەری ئێسکی و ماسولکە و ئەندامەکان و جۆرەکانی چالاکی ژیری و گیانی.

(1) کرۆمۆسۆم: پێکهاتەی کیمیاوییان لە پرۆتین و ترشی ناوکی DNA پێکدێن کە DNA هەڵگری سیفاتە بۆماوەییەکان لە باوانەوە بۆ وەچەکان، وەك ڕەنگی چاو و درێژی و زیرەکی و ... ، وە ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان لە گیانەوەرێکەوە بۆ گیانەوەرێکی تر دەگۆڕێ، ئەم گۆڕانەش کاری سروشت و ڕێکەوت و بازدان نیە چونکە ئەندازەی دروستکردنیان زۆر زۆر وردە.



Scanned by CamScanner

وە تا ئێستا ئەو عامیلانە ناناسین کە دەبنە هـۆی هاوسـەنگی مێشك و بەرهەڵستی کردنی ماندوویی و تێکۆشان دژی نەساغی یەکان. .ئێمە نازانین چۆن هەستی ئەدەبی و هێزی دەربڕین و جورئەت زیاد دەبن.

ئەمانە و چەندین پرسیاری تری نەژمێرراو دەگونجێ بکرێن...بەڵام گشتیان بێ وەڵامن ئاشـکرایە کـە هەرچـی زانایـان پێـشکەشیان کـردوە لـەوەدا کـە پەیوەندی هەیە بە ئینسانەوە : هەتا ئێستا ناتەواوە، وە زانستی مان سەبارەت بە خۆمان هەر لە قۆناغی سەرەتایی دایە[1].

کەواتە بە ئیعترافـی یەکێك لە گەورەترین زانایانی ژیـان ناسـی ئـەوروپا زانیاری مان دەربارەی ژیان و ئینسان زۆر کـەم و کورتـە و هـەر لـە قۆنـاغی سەرەتایی دایە، وە ئەو ژیانەی کە تێیدا دەژین و پڕە لـە تـەنگ و چـەڵەمە و گێرە و کێشە زادەی نە شارەزایی و کەم و کورتی و ناتەواوی شارەزایی یەکانمانە دەربارەی خۆمان.

هەڵبەتە کەسێکیش هێندە نە شارەزاو نەفام بێت دەربارەی خۆی بۆی نیەو ڕەوا نیە هەستێت بە دانانی بەرنامەی ژیان بۆ خـۆی، چـونکە شـتێك لەسـەر نەفامی و نەزانی دابمەزرێ هەر ناتەواو و کەم و کەسر دەردەچێت وەك گوتراوە:

خشت اول چون نهاد معمار کج<br>تـا ثریـا میرود بنیـان کج[2]

---

(١) (الانسان ذلك المجهول) ص١٣، ١٤. وەرگێڕانی عادل شفیق.

(٢) واتە: کە وەستا خشتی یەکەمی بە نارێکی دانا، ئەگەر خانوو تا (ثریا_کۆ)یشدا هەر خوار دەبێ. (کۆ: کۆمەڵە ئەستێرەیەکن).



Scanned by CamScanner

ئێستاش با بچینە لای یەکێکی تر لە بلیمەت و شارەزایانی شارستانەتی ماددی بزانین چ سکاڵایەکی هەیە سەبارەت بە شارەستانەتی یەکەیان و چەند بێزار و نا ڕازی یە لێ ی:

٢- شایەتی دانی (رینیە دوبو) هەڵگری پاداشی نۆبل لە زانیاری یەکان دا: ئەو کابرایە لە کتێبی : (انسانیة الانسان، نقد علمي للحضارة المادية)دا دەڵێت:

(زانیاری و تەکنۆلۆجیا ئامێرێکن هیچ ڕەوشت و ئەخلاقیان نیە و دەگونجێ بەکاربهێنرێن بۆ خێر یان بۆ شەڕ یان بۆ ئاوەدانی یان بۆ کاول کردنێ).

(ئێمە لاف ئەوە لێ دەدەین کە لە چاخی زانیاری دا دەژیەین، بەڵام لە ڕاستی دا مەیدانی زانیاری ئەمڕۆ هاوسەنگی یەکی وای تێدا نیە. کە مەودا بدات بە زانیاری لە هەڵسووڕانی کاروباری مرۆڤ دا سوود بەخش بێت)[1].

(..بڕوا بوون بەمە کە دنیای هاوچەرخ پووچ و بێ نێوە شتێك نیە هەر کورت کرابێتەوە لەسەر فەیلەسوفەکان و ئەدیبە بەرزەکان، بەڵکو شتێکە لە نێو گشت کۆمەڵە ئابووری و کۆمەڵایەتی یەکان دا باوە و کاردەکاتە سەر هەموو دیاردە و چالاکی یەکانی ژیان).[2]

(..ئینسانی ئەم ڕۆژگارە لە زۆر لاوە وەك ئەو ئاژەڵە کێوی یە دەچێ کە ژیانی خۆی لە باغی گیانداران (حديقة الحيوانات)دا دەباتە سەر ، ئینسانی ئەمڕۆ وەك ئەو ئاژەڵە خۆراك و پارێزگاری لێ کردنی تەواوی هەیە، بەڵام لەو هاندەرە سروشتی یە بنەڕەتی یانە بێ بەشە کە بنچینەی زۆر لە ئەرکە جەستەیی و

[1] (انسانیة الانسان) ص٢٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو ص ٣٣.



Scanned by CamScanner

ڕووحی‌یەکانی، ئینسانی ئەمڕۆ نەك هەر بە بـرای ئینـسانی بێگانەیـە و بـە سروشت بێگانەیە بەڵکو زۆر لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بە خۆشی بێگانەیە)[1].

(..ئەو ڕەش بینی‌یە نوێ ـە زۆری هـەڵقوڵاوی سەرچـاوەی دڵنیـا نـەبوونی گشتی‌یە بەهۆی دەرك کردنـی ئـەوە کـە زانیـاری توانـای چارەسـەر کردنـی گیروگرفتە ئینسانی‌یەکانی نیە).[2]

(..زانیاری بەوە تاوانبار دەکرێ کە بەکاردەهێنرێ بۆ ڕووخاندنی بنـچینە دینی و فەلسەفیەکان بۆ ئەوەی چەند جێگر (بدیل) ێکی وایـان لـە شـوێن دا دابنێت کە ڕەوشت و ڕەفتاری ئینسان ئاراستە بکات و تێڕوانینێکی ماقووڵ و بە قیمەت پێش کەش بکات سەبارەت بە بوونەوەر.)[3]

(..وە ئێمە ناتوانین شـێوازی ژیانـان بگـۆڕین مـادام چـەند ڕەوشـتێکی کۆمەڵایەتی نوێ نەیەنینە کایە..بەڵکو دینێکی کۆمەڵایەتی نوێ ..جا کەیفێ خۆیەتی شێوەی ئەو دینە نوێیە هەر چۆنێك بێت پێویستە بنچینەکەی پێکەوە هەڵکردن و پێکەوە گونجان و تەبایی بێت لە نێوان ئینسان و سروشت دا لەباتی ئارەزووی شێتانە بۆ چەوساندنەوە و زاڵ بوون)[4].

(..هەوڵدانیش بۆ هێنانە دی هەڵوێستێکی ئینسانی گەردن کەچ نەبوو بۆ فەرمانـەکانی تەکنـەلۆجیا بـەرەو دوا گەڕانـەوە و تـێ شـکان نیـە بـەڵکو هەڵوێـستێکی بەرەو پێش چوونە و کۆششێکی پاڵەوانانەیە.)[5]

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص ٣٣.

(٢) سەرچاوەی پێشوو ص ٣٣.

(٣) سەرچاوەی پێشوو ص ٦٣.

(٤) سەرچاوەی پێشوو ص ٦٣.

(٥) سەرچاوەی پێشوو ص ٢٣٢.



Scanned by CamScanner

(..زۆر کەس ماندوو بوون لەم ڕاکردنە شێتانەدا بۆ گۆڕینی بەردەوام، وە ئەوانەی بە تەمەنن ماندوو بوون، بەڵام تازە پێ گەیشتووان وایان لێ هاتوە هیچ بایەخێکی تێدا بەدی ناکەن، وە کاتێک ئەوانە هاڵۆزی ئەم ژیانە سەرگێژکەرە دەبینن و ئەو هەموو تێکۆشانە دەبینن بۆ داهێنانی تەکنۆلۆجیای نوێ تاکو ئەو گیروگرفتانە چارەسەر بکات کە هەر نەفسی تەکنۆلۆجیا خوڵقاندوونی !! هاوار دەکەن:

(ئەم جیهانە بوەستێنن، ئێمە دەمانەوێ بچینە دەرێ)[1]

دیسان (رینیەدوبو) دەڵێت:

(...زۆربەی زۆری گیروگرفتەکانی ئینسان لە دنیای هاوچەرخ دا دەگەڕێنەوە بۆ خۆدانە بەر تەئسیری شارەستانیەتی و شارنشینی پیشەسازی، وە پیس بوونی دەوروبەری جۆراو جۆر وە تێك چوونی فسیۆلۆجی کە لە گۆڕانە کت و پڕی یەکانی شێوازەکانی ژیان پەیدا دەبێ، وە دوور کەوتنەوە لە مەیدانە سروشتی یەکانی ژیان و دەوروبەر، تەگەرە عاتیفی یەکان، گۆشە گیری دەروونی لە شارە قەڵەبالغەکان دا، وە وشکی و ماندوویی و ڕابواردنی ناچاری ـــ بە کورتی هەموو ئەو بارودۆخانەی تەکنۆلۆجیا دروستی کردوون بە بێ یاسا و پرۆگرام و بێ نەخشە کێشان و سنوور بۆ دانان ئەمانە گشتیان تەئسیر دەکەنە سەر هەر کەسێك لە دانیشتووانی وڵاتە دەوڵەمەندەکان بە بێ جیاوازی، ئەم تەئسیرانەش شتێکی ڕەسەن نین لە سروشتی ئینسان دا بەڵکو کاردانەوەی، سروشتی ئینسانن لەبەرامبەر شتە داهێنراوە تەکنۆلۆجی و کۆمەڵایەتی یەکان دا).

[1] سەرچاوەی پێشوو ص(١٩٨).

ئەوەش ئیعترافی یەکێکی تر بوو لە کەڵە بلیمەت و زاناکانی دانیشتووی شارستانەتی ماددی لەسەر پووچی شارستانەتی یەکەیان و دەستەوستانی زانیاری لە ئاقار هێنانە دی بەختیاری و خۆشبەختی بۆ ئینسان.

٣- ئیعترافی (ڕوجیە گارودی) فەیلەسووفی مارکسی فەڕەنسایی: ڕوجیە گارودی کە بە گەورەترین پێشەوای مارکسیزم حسێب دەکرێ لە سەدەی بیستەم داو تەنانەت مارکسی یەکان بە نوێ کەرەوەی مارکسیزمی لە قەڵەم دەدەن، لە ماوەی پێشوودا بە شێوەیەکی ڕەسمی ئیسلام بوونی خۆی دەربڕی و وازی لە بیردۆزەی مارکسیزم هێنا و لە بیری ماتریالیستی یەوە پەڕییەوە بۆ بیری خواناسی و موسڵمانەتی، جا بە دەردی کوردەکە گوتی: بەسەد حەکیم هێندەی دەردەدارێك نازانن، دەبا بزانین گارودی نوێ موسڵمان و کۆنە مارکسیست ڕای چیە سەبارەت بەو بیردۆزانەی ئینسان دایناون و بەو شارستانەتی یە ماددی یەی لەسەر بنچینەی زانیاری ڕووت و پچڕاو لە ئایین ڕۆنراوە:

دکتۆر (محمد جابر الانصاري) لە چاو پێ کەوتنێك لەگەڵ ڕۆجیە گارودیدا ئەم وتووێژەمان بۆ دەگێڕێتەوە:[1]

دکتۆر محمد جابر: بۆچی لە مارکسیزم هەڵگەڕایەوە و دژی شارستانەتی ڕۆژئاوای سەرمایەداری دەوەستی و دەستت کردوە بە بانگەوازی کردن بۆ بەرنامەیەکی نوێ..کە ئیسلامە؟

ڕۆجیە گارودی: گەورەترین تاوانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا ئەوەیە کە تەنیا پشتی بە بەرەو پێش چوونی ماددی بەستوە..زیادی بەرهەم هێنان و

(١) ئەم چاو پێ کەوتنە لە گۆڤاری (الدوحة)ی ـقطرـ ی دا لە ژمارە (٨٤)ی ساڵی ١٩٨٢ تۆمار کراوە لاپەڕە (ل: ١٠، ١١، ١٢، ١٣).

هەلکشینی ئاستی رابواردن بە تاقە پێوەری پێش کەوتن و بەختیاری دەزانێ، بەلام ئایا ئەنجام چ بوو.؟ ئەنجام چ بوو پاش بەرهەم هێنانی زۆر لە ترۆمبێل و مەکینە و ئامێری کۆمپیوتەر؟ پاش زۆر لە بانق و سەرمایەی گەورە؟ پاش شار و رێ و بان و کارگە و فابریقەخانەی زۆر و زەوەند؟!

دوای ئەم هەموو بەرهەم هێنانە سەرمان بە کوێ دەگات..کوا بەرەو پێش چوون لە لایەنی رووحی و رەوشت و ئاکاری بەرز و رەفتاری ئینسانانە و بەختەوەری راستەقینە؟!

تاقە ئەنجامی ئەو بیردۆزە مادییە ئێستا ئەوەیە کە جیهانی ئەمرۆ هێزی خۆ لە نێو بردنی نەك جارێك سەدان جار وەدەست هێناوە..بەلام بە بێ هەلکشین و فراژووبوونی هاوسەنگ و بەرامبەر لە رەوشت و ئەخلاق و ئاکارە رووحیەکان کە دەبنە پەرچ و لەمپەر لە رێی هێزی وێران کاری مرۆڤ دا.

ئینجا مارکسیزمیش هات تاکو هەمان تاوان دووبارە بکاتەوە بەلام بە شێوەیەکی تر، مارکسیزمیش بیردۆزەی هەلکشین و بەرەو پێش چوونی سەرمایە و دارایی کردە سەنگی مەحەك و پێوەری پێش چوونی سەرمایە و لایەنی ماددی کرد بە قانوونێکی حەتمی و بەردەوام بۆ فراژوو بوونی سۆشیالیزم، ئینجا رژێمی سەرمایەداری و رژێمی مارکسیزمی کەوتنە پێش برکێ لەیەك مەیدان دا، مەیدانی بەرهەم هێنانی ماددی بەردەوام هەتا هەتایە و بە بێ ئامانج.

تاقە جیاوازی یەك کە هەبێت لە نێوان ئەو دوو رژێمەدا ئەوەیە کە یەکێکیان تاك (فرد) دەکاتە بنەمای رژێمەکەی و یەکێکیشیان (کۆمەل) ، بەلام مێژوو بەرەو دوا ناگەرێتەوە و هەلەدەن دەبێ بەرنامە و پەیرەوێکی دیکە هەبێت بۆ دروست بوونی شارستانیەتی و گەشە کردن.

شتێکی سەلمێنراوە لە ڕوانگەی منەوە کە سۆشیالیزم لەسەر ئەو بنچینە ماددی‌یەی ئەمڕۆ مەحاڵە، سۆشیالیزم نایەتە دی بە بێ گەشە کردن و فراژوو بوونی ڕووحی و ئەخلاقی لەسەرووی ماددەوە و لە سەرووی گەشە کردنی ئابووری‌یەوە، هاتنە دی ئەوەش مەحاڵە چ لە ڕژێمی سەرمایەداری داو چ لە ڕژێمی مارکسیزم دا چونکە هەردووکیان کەوتوونە هەمان هەڵەوە کە بریتی‌یە لە هەوڵ دان بۆ هێنانە دی شارستانیەتی بە بێ ئیمان و عەقیدە و بە بێ لایەنی ئەخلاقی و ڕووحی).[1]

بەڵێ خوێنەری ئازیز!

ئەوەش ڕای گەورەترین پێشەوای مارکسیزمی سەدەی بیستەمە سەبارەت بە ڕژێم و فەلسەفەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە تەعبیرێکی تر مارکسیزم و کاپیتالسیم، وەك دیتمان بڕوای وایە کە هیچ کامیان پێز و بڕستی ئەوەیان نیە بتوانن شارستانەتی ڕاستەقینە بێننە دی و خۆشبەختی و کامەرانی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد فەراهەم بێنن.

بە پشتیوانی خوا لە گەوهەری دووەم دا دەری دەخەین کە گارودی و هاوبیرانی چ بیروباوەڕ و بەرنامەیەك بە چارەسەر و شیفای زامی ئینسانەتی دەزانن.

٤- ئیعترافی (میلۆفان دوجیلاس) ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی یۆغسلافیای پێشوو:

---

(١) لە گەوهەری دووەم دا دیسان دەگەڕێینەوە سەر گارۆدی قسە بە ترخەکانی.

میلۆفان دوجیلاس کە یەکێك بوو لە ئەندامە هەرە بەرزەکانی حیزبی مارکسیزمی یۆغسلافیایی چۆنیەتی کەوتنە گومان و هەڵگەڕانەوەی خۆی لە پەرۆزەی مارکسیزم دا ئاوا دەگێڕێتەوە:

(..:ئەمن هەموو شتێکم لە بیرە بە ڕۆژو سەعاتەوە هەروەك چۆن تۆبەکار وەختی تەجەللا و درەوشانەوەی خوای لە بیر دەمێنێ:

ئەوە هەمووی لە شەوی ۷، ۸ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۵۳ز دا ڕووی‌دا، پاش ئەوەی وەك شەوانی تر چوومە سەر جێ و نووستم، کت و پڕ لە نێوە ڕاستی شەوێدا وەخەبەر هاتم، بیرێکی نوێ هاتە مێشکمەوە بەڵام یەکسەر بڕیارم دا کە مەحاڵە واز لە بیروباوەڕەکەم _مارکسیزم_ بێنم. ئەمن لەو سەروحەدەی‌دا چەند وتارێکم لە ڕۆژنامەی حیزب دا نووسی بوو کە بەعزێك بە (کۆنەپەرستی)یان لە قەڵەم دابوو.

دەمزانی کە ڕایەکانم ئەوەندە ناخایەنێ دەبنە هۆی تێکچوونی پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێیانی لیژنەی مەرکەزیم، ئەوانەی کە هەموو تەمەنی لاوی و زۆربەی تەمەنی (قەیرەیی)م لەگەڵ دا بردبوونە سەر، لە ئاواتێکی هەرە بەرزمان دەکۆڵیەوە و پاش ئەوەی دڵی خۆمان زۆر پێ خۆش کرد و خەفەتمان لێ خوارد و ئارەق و خوێنمان لە ڕێدا ڕشت، بۆمان دەرکەوت کە وڕێنەیەکە و هاتنە دی مەحاڵە.

خێزانەکەم (ستیفانا) بە ئارامی نووستبوو لەولای ژوورەکەوە، بەڵام هەستم بە هەبوونی دەکرد لە نێو تاریکی و ئارامی شەوگاری بێ بڕانەوەدا.

ویستم زەینم لەسەر ئەو جۆرە شتە مەترسی لێ کراوانە هەڵەنگێوم تەنها فایدێی نەبوو بڕیارێکی کۆتایی لە ئەفسم دا دراوە، شتێك کە ناچارم ژیانم و ئاواتەکانم و لە هەمووشی گرنگتر خاوو خێزانی لە پێناودا دانێم، ، دەمزانی کە هیچ هیوام نیە لەم جەنگەدا، لەو دەمەی‌دا چارەنووسی (تروتسکی)...

دەهاتەوە و لە دڵی خۆم دا دەمگوت: وا چاكترە پیاو وەك (ترۆتسكی) بێت نەك (ستالین)، وا چاكترە كە تێ شكێ و بهارڕێ نەك خیانەت و ناپاكی لەگەڵ ویژدان و هەست و نەستی ئینسانانەیدا بكات.

تەنانەت بیرم لەو ساڵە درێژانەی گرتووخانەش دەكردەوە، كە دیاری كرابوو بۆ یەكێك كە حوكم درێت بە سزای خیانەت !! یان سزای پڕۆپاگەندەی دژانە (الدعایة المعادیة) كە بریتی بوو لە (٧، ٩) ساڵ ئەوانەم بەزەین دا دەهات وەكو حوكمەكە دەرچووبێت.

ئاوا ـ بە خەیاڵ ـ خۆم بەتەنێ و بە سووك سەیر كراو دەهاتە بەرچاو پاش ئەوەی هاوڕێیانم خیانەتیان لەگەڵ دا كردم و سزای تۆقێنەر خاوو خێزانمی گرتەوە.

ئەما ئەو مل ملانێ سەختەی لە دەروونم دا دەگەڕا بە زوویی كۆتایی پێ هات تەنانەت پتر لە چەند دەقیقەیەكی نەبرد، یەكسەر هاتمەوە سەرخۆم و زەینم كۆ بۆوە دوای ئەوەی بەهۆی خەواڵوویی‌یەوە پەرت بوو بوو.[1]

چونكە دەمزانی بەڵێ دەمزانی كە حەقیقەتی من لێرەدایە و مەحاڵە وازی لێ بێنم، هەر چەند بەڵایەكی ئەستەمیش چاوەڕێم كات كە پێی‌دا تێپەڕ ببم.

ئینجا ڕۆیشتم بۆ ژوورەكەم چەند دێڕێكم نووسی كە ئەمانەم ڕەگەڵ خستبوون:

ناكۆكیم لەگەڵ سەرۆكانی حیزب دا پێهەڵا چووە و پێویستە خۆمیان لێ بپچڕێنم ..هەڵبەتە پاش ئەوە بە سێ هەفتان بە شێوەیەكی ڕەسمی هەواڵی هەڵوێستی دەوڵەتم پێ ڕاگەیەنرا لە دژی من.[2]

---

(١) مجتمع غیر كامل الشیوعیة المفككة، میلوفان دوجیلاس ص٢٨.

(٢) سەرچاوەی پێشوو میلوفان وجیلاس ص٢٩.



Scanned by CamScanner

بەڵام مادام خۆیەخت کردنم بە ژیانم لە پێناوی ویژدانم دا، وە زاڵ کردن و هەڵبژاردنی ڕایەکانم بەسەر واقیع دا بە ئیمان دابنرێ، کەواتە ئیمانی خۆمم لەو شەوەوە دیتۆتەوە و گیانی هیوا و بڕوا بەخۆ بوونی هێزی پێدا کردووم تاکو ڕووداوەکانی ڕۆژگار و کۆسپەکانی پێ ڕووبەڕوو بم، هەروەک چۆن ئەو ئیمانە درابوو بە هاوڕێ پیرە گیراوەکانم[1].

لە شوێنێکی تردا دەڵێت:

(...سۆز و پەرۆشی ئینسان بە پەروەردگاری ئاسمانەکان ناگونجێ لە دڵی ئینسان دابنرێ..)

هەروەها دەڵێت:

(... نوسراوەکانی مارکس وەک نووسراوی باقی نووسەرە بلیمەتەکانی بریتی‌یە لە پێکەوە جۆش دانی بیردۆزە جوێ جوێ کان، چونکە ئەو بیردۆزەکەی لێك داوە لە ئابووری سیاسی ئینگلیزی (الاقتصاد السياسي الانكليزي) ی (آدم سمیث وریکاردو) وە سۆشیالیستی فەرەنسایی (سان سیمون فورییە)وە فەلسەفەی ئەڵمانی کلاسیکی (کانت و هیگل و فیورباخ)[2].

لە جێیەکی تردا دەڵێت:

(... وە ئەوەی کە پێویستە کەرەتێکی تر زۆر بە ڕوونی باس بکرێت ئەوەیە کە ئەم کتێبە (کتێبی ناوبراو) نایەوێ مارکسیزم شی بکاتەوە و تەفسیری بکات بەڵکو دەیەوێ دەری خات کە بەکارهێنانی توند و تیژی خراپەکاری لە ژیانی ئینسان دا _تاك و کۆمەڵ_ شتێکی حەتمی و فەرزە لە

(١) سەرچاوەی پێشوو میلۆڤان وجیلس ص٣١.
(٢) سەرچاوەی پێشوو ص ٤١.

كاتێك دا ماركسیزم بە شێوەیەكی گشتی بەسەر كۆمەڵگایەك دا بچەسپێنرێ یان باشتر بڵێین بسەپێنرێ).[1]

لە شوێنێكی تردا دەڵێت:

(... ئەمن بۆیە هێندە دەگەڕێمەوە لای (ئاینشتاین) و فیزیایەكەی، تاكو ئاماژە بكەم بۆ ئەو مەیدانە پان و بەرینەی زانیاری نوێ داگیری كردوە دوای ئەو چاخەی لینین و ستالین یاسا (دیالكتیكیەكانیان) تێدا داڕشت، كەواتە زۆر گرنگە كە بۆ یەكەم نیگا هەست بەو جیاوازییە بكەین لە نێوان شێوەی ئەو دنیایەی فەلسەفەی ماركسیزم دروستی كردوە و ئەو شێوەیەی ئانیشتاین یان زانیاری نوێ هێناویەتە دی..).[2]

دیسان دەڵێت:

(... زانستی هاوچەرخ نەك هەر جوێیە لەو بیردۆزانەی لینین و ئەنگلز داكۆكییان لەسەر دەكردن بەڵكو زانستی هاوچەرخ ئەو بیردۆزانە پووچ دەكاتەوە.

ناسرانی مادده و هەرچی ئێمە دەربارەی دەیزانین گەردن كەچە بۆ گۆڕانكاری و بە هیچ كلۆجێك ڕەوا نیە كورتی بكەینەوە لەسەر ئەو ئەندازەیەی هەستەكانمان دەیزانن، ناسینی مادده (ماتەر) بەشێكە لە ناسینی تەواوی جیهان، ناسینی جیهانیش لە چاخێكەوە بۆ چاخێكی تر و لە بلیمەتێكەوە بۆ یەكێكی تر كە سەرگەرمی ناسینی فەرقی هەیە).[3]

هەروەها دەڵێت:

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص ٦٤.

(٢) سەرچاوەی پێشوو ص ٦٩.

(٣) سەرچاوەی پێشوو ص ٧٦.



Scanned by CamScanner

(ئەو ئەنجامەی کە دەگونجێ بیگەیەنێ لە ئەنجامی توێژینەوەمان دەربارەی کۆمۆنیزم و هەر ئیدۆلوژییەکی تر ئەوەیە کە: ئیدولوژی کۆمۆنیزم لە چەند هۆیەکی عیلمی پەیدا نەبووە، بەڵکو چەند عامیلێکی سیاسی داخوازی کردوە ئەویش داخوازی‌یەکانی حیزبن، ئینجا لە دوایی‌دا بۆیەیەکی عیلمی لێ دراوە و پێش کەشی جیهان کراوە وەک زانیاری‌یەک و وەک بیروباوەڕێکی عیلمیانە کە تەفسیری جیهان دەکات).[1]

## خوێنەری ئازیز و بەڕێزم:

ئەوە ئیعتیرافی چوار کەس بوو لە کەڵە زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دوویان (ئەلیکسیس کاریل و رینیە دوبو) نوێنەی شارستانەتی ڕۆژ ئاوان دووشیان (روجیە گارودی و میلۆفان دوجیلاس) نوێنەری شارستانەتی ڕۆژ هەڵاتی مارکسیزمی، وەک دیتمان هیچ کامیان لە ڕوانگەیەکی ئیسلامی و ئاینی‌یەوە ڕەخنە لە ڕژێمەکانیان ناگرن تا بڵێین: ئەوانە عاتیفەی دینی پاڵی پێوە ناون ئەو قسانە بکەن، بەڵکو هەموویان لەسەر بنچینەیەکی زانستیانە و واقیعی‌یانە قسە دەکەن، بەڵێ ئەوانە کەڵە زانا و چاوساغی شارستانەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوان _ کە سەدان نموونەی تری وەک وانیش هەن _ ئیفلاس و مایە پووچی شارستانەتی ماددی و دوور لە خوایی دەخەنە ڕوو بەو پەڕی بێ پەردەیی‌یەوە دەری دەبڕن کە ڕێچکە دەسکردەکان و بیردۆزە ئینسان کردەکان زۆر لەوە کەمترن کە بتوانن خۆش بەختی و کامەرانی و ئاوەدانی ڕاستەقینە بۆ ئینسان دابین بکەن.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص ٨٤.

بەڵێ هەموویان بە یەک دەنگ ئەو ڕاستییە دەڵێن کە قورئانی مەزن و قسە لەجێ بەر لە (١٤٠٠) ساڵ ڕای گەیاندوە: ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ﴾، لە دوای هەق (ئیسلام) بێجگە لەسەر لێ شێواوی چیدی هەیە؟! کەواتە ڕاستە دەبێ بەرنامەی ژیان تەنیا لە لایەن خواوە دابنرێ و بەس.

ئێستاش با بێینە سەر بەڵگەی دووەمی ڕاستیەتی گەوهەری یەکەم:

بەڵگەی دووەم:

ناخۆشی و پڕ تەنگ و چەڵەمەیی و سەر لێ شێواوی ژیانی دانیشتووانی شارستانەتی ماددی دوور لە خوا و نا ئیسلامی ئەو ڕۆژگارە:

زۆر کەس بیر کورت و ساویلکە پێیان وایە دانیشتووانی دەوڵەتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییە بێ دین و نا ئیسلامییەکان لەو پەڕی بەختەوەریدا دەژین و لە هیچیان کەم نیە و بەهەشتیان لە دنیایەدا بە نسیب بووە !!

بەڵام لە ڕاستیدا خراپ حاڵی بوون و بە هەڵەدا چوون ئێستاش بۆ خاتری وەی ئەو خراپ حاڵی بوون و بەهەڵەدا چوونەمان بۆ دەرکەوێ با سەرنجێکی خێرایی ئەو وڵاتانە بدەین:

١- پێش بڕکێ کردن لە زیاتر دروست کردن و داهێنانی چەکی کوشندە و قڕکەر:

لە ساڵی (١٩٧٧ز) ڕێکخراوی یونسکۆ کۆنگرەیەکی بەست کە (٣٣) کەس لە زانایان و هونەرمەندان و فەیلەسوفان و سیاسەت مەداران بەشداریان تێدا کرد کە تێیان دا هەبوو پاداشی (نۆبڵ)ی وەرگرتبوو، کارەکانی ئەو کۆڕە لە چوار سووڕگەدا دەسووڕان:



Scanned by CamScanner

أ. ئایا ئینسان سەرپەرشتی کەرە یان بووکە شوشەیە بەدەست بەرهەمەکانی یەوە؟

ب. ئینسان لە بەرامبەر هێزەکان دا.

پ. گرێ کوێرەیەکی کۆمەڵایەتی تر.

ت. جەنگی بەردەوامی ڕۆشنبیری.

هەڵبەتە ئێمە نامانەوێ هەموو وتووێژەکانی ئەو کۆڕە لێرەدا تۆمار بکەین و تەنیا ئەو باسەی (شین ماکبراید) دەنووسین لە ژێر ناوونیشانی (شتنی زەین بە بۆمبایەکی باش و خاوێن!) لەگەڵ دوو کورتە باسی (فیلیب نویل) و (فیلی برانت) دا، شین ماکبراید دەڵێت:

(...لەگەڵ دان پێدانانی سەرۆکانی ئەمریکا و ڕووسیا کە پێویستە چەکی ئەتۆمی کەم بکرێتەوە یان نەهێڵرێ، بەلام چەکی ئەتۆمی هەر لە زیاد بوون دایە، تەنانەت قسە کردنێ دەربارەی کەم کردنەوەی چەکی ئەتۆمی هەر لە بنێ چووە، تا ئێستا واتە ساڵی (۱۹۷۷) چەکی کۆکراوەی ئەتۆمی بایی ئەوە دەکات (۲۰) کەرەتان هەموو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە نێو بەرێ!!

ئینجا ماکبراید دەربارەی بۆمبای نیوترۆنی دەڵێت:

(...ئێستا جۆرە چەکێکی کاریگەرتر و هەرزانتریان دیتۆتەوە کە ژمارەیەکی زۆر دەکوژێ بەهۆی تیشک دانەوە (اشعاع)ەوە، ئەویش بۆمبای (نیوترۆنی)یە، ئەم بۆمبایە زۆر زیاتر لە بۆمبای کۆن کار دەکات وێڕای ئەوەش هیچ کارناکاتە سەر خانووبەرە و شمەک !!

بێگومان ئەوە یەکێکە لە شێوازەکانی نەهێشتنی ئینسان، بەلام لە چەند هەفتەی پێشوودا هەندێك لە شارەزایانی چەك و تەقەمەنی هەواڵیان پێ دام کە ئێستا کۆششێکی زۆر سەرف دەکرێ بۆ دروست کردنی بۆمبایەکی سەروی

دەنگ (القنبلة فوق الصوتية) کـە دەتوانـێ مێشکی ئینـسان بهـەژێنێ و دانیشتووانی ناوچەیەك بکاتە شێت و شوور، ئـەوەش بـەهۆی لـەنێو بردنـی خانەکانی مێشك بەتایبەتی...ئەم بۆمبایەش وەك دەڵێین: لە هـەموو ئـەوانی پێشوو مرۆڤانەترە چونکە ئینسان ناکوژێ، تاقە شتێك کە دەیکات ئەوەیە کە ئینسانەکان دەکاتە ئاژەڵ یان رووەك..!!).

دوای ئەوە ماکبرایـد وێنەیـەکی ترمـان دێنێتـە بـەرنیگا لـەو کارانـەی کاربەدەست و بلیمەتانی سەدەی بیستەم پێیانەوە خەریکن:

(...چەند مانگێك لەمەوبەر هەواڵێك بلاو کرایەوە کـە سـەرنجی کەسـی رانەکێشا لە خەلکی ئەوروپا ئەو هەواڵە دەیگوت:

وەزارەتی جەنگی ئەمریکا (٤٥,٠٠٠) چل و پێنج هەزار کۆرپەی بەستراو (مجمد)ی لە کۆماری کۆریاوە هێناوە کە بە هۆی لە بارچواندن (الاجهـاض)ەوە دەسگیر کراون، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە ئەم کۆرپانە پێویست بـوون بـۆ تـاقی کردنەوەی تەئسیری تیشکی بۆمبایی لەسەر پێستی ئینسانی تازە بەستراو..)!!

ئینجا دەڵێت:

(ئەوەی باسم کرد بەڵگەیەکی نوێ ترە لەسەر رووخانی رەوشت و خوو لـە دنیادا، ئەو بەرەو پێش چوونەی مرۆڤایەتی بەخۆیەوەدی لـە شـەڕی دووەمـی جیهانی بەم لاوە، وێڕای ویش رەوشت و خوو وەهەست کردن بە لـێ پرسـراوی پەرەی نەستاندوە .. لەم (٣٠) سی ساڵەی دواییدا رووخانێکی تەواو رووی‌دا لە ئەخلاق و رەوشت داو زانیاری دین و رەوشتی لەگـەڵ دا نـەبوو بۆیـە بۆتـە جێی مەترسی بۆ مرۆڤایەتی و هەرەشەی لەنێو بردنی لێ دەکات).

لە هەمان کۆنگرەدا (فیلیب نویل بیکر) لە ژێـر ناوونیـشانی : (درنـدەی چەکە نێوکیەکان)دا گوتی:

هیتلەر شەش ساڵان جەنگی کرد و دنیای پڕ کرد لە جەنجاڵ لەگەڵ ئەوەش دا بۆمبای ئەتۆمی لەبەر دەست دانەبوو، جەنگی وی هەر بە چەکە کۆنەکان بوو، بەڵام تا ئێستا دکتۆر (هربرت یورك) لە ساڵی (١٩٧٣)دا نووسیویەتی کە چەکی هەڵگیراوی ئەتۆمی ئەمریکا دەگاتە (١٥,٠٠٠) میگا تەن (میگاتەن یەك ملیۆن تەنە).

لە ماوەی ئەو شەش ساڵەدا (١٩٣٩_١٩٤٥) هاوپەیمانەکان (الحلفاء) (١,٢) ملیۆن تەن تەقەمەنی‌یان خستە خوار لەسەر ئەڵمانیا کە بوو بەهۆی کاول کردنی ئەڵمانیا لەسەرێوە بۆ خوارێ و لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای، بەڵام ئەو ئەندازەیەی کە لە ماوەی شەش ساڵان دا لەسەر ئەڵمانیا خرایە خوارێ ئێستا هەر یەك بۆمبا هاوێژ دەتوانێ لە ماوەی یەك چرکەدا لە یەك جێ‌دا فڕێی داتە خوارێ !!. هەڵبەتە ئەوە لە ساڵی (١٩٧٣)زدا بووە !![1]

بەڵێ شێتی چەك دروست کردن گەیوەتە ڕادەیەك کە بە پێی هەواڵی ئەمریکا کە لە ساڵی (١٩٨٠) بڵاوی کردەوە ئەمڕۆ قیمەتی چەك سازی لە جیهان دا لەهەر دەقیقەیەك دا گەیوەتە یەك ملیۆن دۆلار کە ئەگەر لەگەڵ ساڵی (١٩٠٠)دا بەرامبەری پێ بکەین (٣٠) بەرامبەرە، بە پێی هەمان هەواڵ (٤٠٠,٠٠٠) زانای پلە یەکەم سەرگەرمی دروست کردنی چەکی نوێی ئەتۆمی ترن، ئەوە لە کاتێك دا دەکرێ کە دەتوانرێ بە دوو هەزار بۆمبا لە یەکەمین سەعاتی جەنگ دا (١٧٥) ملیۆن ئینسان لە دانیشتووانی شوێنە قەڵەباڵغەکان بکوژرێ، وە لە ئەمریکا (٢٤٠,٠٠٠) بۆمبای (مگانتی) هەیە کە دەڵێین دەتوانێ (١٢) جاران هەموو گۆی زەوی تەخت کات!! وە لە رووسیادا (٨٠,٠٠٠) و لە بەریتانیا (١٥٠٠٠) بێگومان چین و فەرەنساش لەم جۆرەیان هەیە!!

(١) سەیری گۆڤاری (العربي) کوێتی بکە ژمارە ٢٨٧ی ساڵی ١٩٨٢ لاپەڕە (١٤، ١٦، ١٧، ١٨).

(فیلی برانت) لە باسێکی‌دا لە هەمان کۆنگرەی ناوبراودا دەڵێت:

(...ئەو ماڵ و دارایی‌یەی کە لە چەك و تەقەمەنی ئەمڕۆدا خەرج دەکرێ هەر ئی دانە ڕۆژێکی بایی بەڕێوەبردنی هەموو ئەو ڕێکخراوە تەندروستی‌یانەی جیهان دەکات کە تەرخانن بۆ لەنێو بردنی مەلاریا (لەرزوتا)، وە نرخی یەك فڕۆکەی (نفاثة) (٢٠ملیۆن دۆلار) بەشی دروست کردنی (٤٠,٠٠٠) دەرمانخانەی لادێ‌یی‌یانە دەکات!![1]

تاقی‌کرانەوەی بۆمبای ئەتۆمی لەیەك شاری یابانی‌دا[2] :

شەشەم ڕۆژی مانگی ئابی (١٩٤٥) سەر لەبەیانی عاسمانی (هیرۆشیما) بێ گەردو دلگیر بوو، خەلکی تازە لە ماڵی وەدەر دەکەوتن و ڕووە و کەسابەت دەچوون، بەڵێ لەو ڕۆژەدا سێ فڕۆکەی دوژمن بەرەو هیرۆشیما ملیان لێ نا یەکێك لەو فڕۆکانە تەنیا یەك بۆمبای لەسەر شاری هیرۆشیما خستە خوارێ و لە بەرزایی (٥٧٠) مەتر تەقی‌یەوە و هەورێکی زەبەلاحی لەسەر شاری



هێزی هەڵتەکاندنی چەندەها دار و درەخت و فڕێدانی چەندەها ئینسان و

(١) گۆڤاری (العربي) ژمارە ٢٧٧ ساڵی ١٩٨٢ لاپەڕە ١٩.

(٢) سەیری (مفاسد تمدن غرب) بکە لاپەڕە ٤١ مهرداد مهرین.



Scanned by CamScanner

ڕووخاندنی سەدان خانووبەرە و شوشەی پەنجەرە و دەرگاکانی شار وەك خەنجەری تیژ و بڕندە بەم لاولادا بلاو بوونەوە.

ئەندازەیەکی کەم لە دانیشتووانی شار کە نەمردبوون زۆر بە پیسی بریندار بوو بوون و هەندێکیان پاش ماوەیەك مردن و هەندێکیشیان تووشی نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان) بوون و بە دەردەداری گیانیان سپارد.

ئیجا بەراوردێك بکە لە نێوان ئەنجامی ئەو بۆمبایەدا و ئەنجامی تەقینرانی ملیۆنەها بۆمبای ئەتۆمی نوێ بزانە دنیا چی لێ بەسەر دێت ؟!!

١- هێندێك قڕن و هێندێك پڕن:

(مصطفی لطفي المنفلوطي) لە یەکێك لە نوسراوەکانیدا دەڵێت:[1]

دوێ شەو بە کن پیاوێکی نەداردا ڕابوردم، دیتم دەستی لەسەر زگی دانا بوو وا دیار بوو ئازاری هەبوو، بەزەییم پێدا هاتەوە و لێم پرسی چیتە؟ گوتی ئازاری برسیەتی تینی بۆ هێناوم، بەوەندەی کە لە دەسەڵاتم [illegible] دا، ئینجا ئەوم [illegible]

[illegible]

[illegible] نەدارەکەشی ڕاکێشاوەتە پێش خۆی، خواش لە تۆڵەدا تووشی زگ زلی کردوە، تاکو بابای ستەمکار خۆشیان لە خۆی نەبینن، ئاوا ئەو پەنـــدە

(١) سەیری (تاریخ الادب العربي) احمد حسن الزیات بکە لاپەڕە (٤٦٣).

وەراست دەگەڕێ کە دەڵێت: زگرلیی دەوڵەمەند تۆڵەی برسیەتی هەژارە!!. بە ڕاستی خوێنەری بەڕێز ئەو قوڵە ئەزیلەیەی (منفلوطي) گێڕایەوە بەسەر گشت دەوڵەتە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی یەکانی ئەمڕۆدا دەچەسپێ،[1] دەبا بڕێك سەرنجی ژیانی ئابووری ئەو وڵاتانە بدەین، بزانین لە چ حاڵێك دا دەژین:

٢- (جورج بـخت) ڕاوێژ پێ کراوی زانیاری پێشووی ئەڵمانیا (المستشار العلمي السابق في المانيا) لە کتێبێکی‌دا بە ناوی (افكار على حافة الهاوية) دەڵێ: برسیەتی بەرپرسیارە لە ئاقار مردنی (٥٥) ملیۆن کـەس هـەر لـە (٢٠) مانگ دا، واتە لە هەر (٢٠) مانگێك دا برسـیەتی هێنـدەی کـوژراوانی جەنگی جیهانی دووەم لە نێو دەبات !!

شارەزایان دەڵێن ئێستا لە جیهان دا (٥٠٠) ملیـۆن ئینـسان هەیـە کـە خۆراکی تـەواوی دەسـت ناکـەوێ و لـە ئـەبوونی‌دا دەژیـەت کەواتـە (٨/١) هەشتیەکی جیهان لە برسیەتی‌دا دەژین، وە دەڵێن: ساڵانە ٤٠ ٪ ی منداڵانی ئەفریقیا لە برسان دەمرن، هەروەها ساڵانە تـەنیا لـە (برازیـل) (٢٥٠,٠٠٠) دووسەد و پەنجا هەزار (٤/١) یەك لەسەر چواری ملیۆنێك منـداڵ دەمـرن لـە برسیەتی و نەداری‌دا، ئەوە هەمووی لە حاڵێك دا کـە ئـەمریکا سـاڵی بـایی (٤٠) ملیار دولار گەنم دەسووتێنێ بۆ خـاتری وەی نرخـی گـەنم دانەبـەزێ و تووشی زەرەرێ نەبێت !!

پێم وایە چ کەسێك گومانی نیە لە هەبوونی چەوساندنەوە و چینایەتی لە ژێر سایەی ڕژێمی سەرمایەداری‌دا بۆیە بە پێویستی نازانم زۆر لەو بارەوە بدوێم

[1] هەڵبەتە دەوڵەتانی جیهانی سێ یەمیش هەر وان بەڵام ئێمە مەبەستمان هەیە کە تەنیا ناوی وڵاتە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی یەکان دێنین، مەبەستەکەش شێرراوە نیە !!

بەلام ڕەنگە هێندێك کەسی ساویلکە هەبن ئەوەی کە بە خەیاڵیان دا نەیەت هەبوونی دەوڵەمەندی و هەژاری و ڕژێمی چینایەتی بێت لە ولاتە سۆشیالیستەکان دا لە ژێر سایەی ڕژێمی مارکسیزم دا بۆیە بە پێویستی دەزانم نیگایەك بە بارودۆخی ئابووری بڕێك لە وڵاتە کۆمۆنیستەکان دا بخشێنین:

ئەندرەژید [1] نووسەری بەناوبانگی فەڕەنسایی دەڵێت:

(...هەردەم باس و خواسی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا (چینی کرێکار) یان بە گوێدا دەدایین، بەلام ئێمە زۆر لە واقیعەوە دوور بووین چونکە لە ڕاستیدا دیکتاتۆری بۆروکراتییە کە دەستی بەسەر پرۆلیتاریادا گرتوە، پرۆلیتاریا تەنانەت توانای هەڵبژاردنی نوێنەرە پارێزگارەکانی خۆشیان نیە کە بەرگری مافە خوراوەکانیان بکەن...!!). [2]

(ئەلکساندر سولژنیتسن) نووسەری ڕووسی بەناوبانگ کە بە هۆی ڕەخنە گرتنیەوە لە ڕژێمی ڕووسیای مارکسیزم گیرا و دوایی لە ڕووسیا وەدەرنرا دەڵێت:

(..لە ڕاستیدا ئەوەی چینی کرێکاری وڵاتی مە وەدەستی دێنێ جگە لە سواڵ چیدی نیە، کرێکاری مە تەنانەت دەسەلاتی نیە دیفاع لەسادەترین مافی ژیانی خۆشی بکات، چینی کرێکاری ڕووسیا مافی کەمترین مان گرتن (اعتصاب)ی نیە بە مەبەستی زیاد کردنی کرێ یان چاك کردنی هەل و مەرجەکانی ژیان.

---

(١) ئەندرەژیدا یەکێك بوو لە مارکسوییەکانی فەرەنسا، بەلام دوای ئەوەی لە هاوینی ساڵی (١٩٣٦) یەکیەتی نووسەرانی ڕووسیا دەعوەتیان کرد و چاوی بە ڕووسیا کەوت و هەموو شتێکی بە چاوی خۆی دیت کتێبێکی دانا بە ناوی (گەڕانەوە لە ڕووسیا) و لەوێدا پەردەی لەسەر واقیعی لابرد و واقیعی ڕوسیای دەرخست.

(٢) سەیری (بەرنامەدارانی شووروی) بکە نووسراوی : الکساندر سولژ نیتسن لاپەڕە (٩٦).



Scanned by CamScanner

هەر چەشنە مان گرتنێکی کرێکاران بە کارێکی دژ [illegible]ۆڕشانە لە قەڵەم دەدرێ: ئێوە هەرگیز ناتوانن لەمان گرتنەکانی کرێکاری ڕووسیا کەمترین زانیاری وەدەست بێنن.[1]

هەروەها دەڵێت: (واتە الکساندر سولژ نیتسن):

(ئەم بیروباوەڕە ـیانی مارکسیزمـ کە بە میرات بۆمان جێماوە نەك هەر کاتی بەسەرچووە و باوی نەماوە و جێی دڵ پێ خۆش کردن نیە، بەڵکو لە چاخی زێڕینی دا لە هەموو پێش بینی یەکانی دا وەدرۆ کەوتۆتەوە و هیچ کاتێك واقیعی نەبووە.

ئەو پێش بینی یەی دەڵێت: گوایە چینی کرێکار هەموو کاتێك لەبەر تەوژمی تینی بڕۆوایی قەرار دەگرێ لە وڵاتە سەرمایەدارەکان دا و هیچ شتێك وەدەست نایەنێ، سەرتاپا هەڵە و ناتەواو بوو، خۆزگە ئێمەش دەمان توانی وەك ڕژێمی [illegible] ئاك و پێداویستی یەکانی

[illegible]

[illegible] از گذشت از شورەوی) بکە نوسراوی ئەندرەیە لاپەڕە (١٢).

(...تێ شکانی مارکسیزم ئەنجامی هەڵە و کەمتەرخەمی سەرۆك و ژەنەراڵەکانمان نیە بەڵکو بە وردی ئەنجامی دەستوور و بنەماکانی مارکسیزم ـ لینینیزمە ـ).[1]

(...ڕابەرانی کۆمۆنیزم بەهۆی پابەندی‌یان بە دەستووره کۆنە وشکەکانیانەوە وایان بە خەیاڵ دا دەهات کە گشت دنیا بێجگە لە دنیای کۆمونیزم بەهۆی ناکۆکی نێو خۆ دووچاری بەجێمان و شپرزەیی دەبێ، بەڵام وا نەبوو ڕۆژئاوا چ لە لایەنی ئابووری و چ لە لایەنی فیکری لە ئێمە پێشکەوتوو تره).

(اندرو سوخاروف) زانای گەورەی گەردیلەناسی ڕووسیایی کە بە تاوانی ڕەخنە گرتنی لە سیاسەتی ڕژێمی مارکسیزمی لە ڕووسیا دەرکرا دەڵێت:

(...ئینسان مادام ژیانی لە نێو ژوورێکی داخراودا بێت هەست بەوە



(١) بە زمامدارانی شووروی: لاپەرە (٦١).

(٢) سەیری کتێبی (کشورمن و جهان) بکە نووسراوی سوخاروف لاپەرە (٦٣).

(٣) (سوخوز) کێڵگەیەکی ئیشتراکی‌یە کە بە پێچەوانەی کولخۆزەوە هیچ جۆرە خاوەنایەتی‌یەکی سەڵتی تێدا نابینرێ.



Scanned by CamScanner

(٢×٢,٥)، هەر نەفەرێك پێویستە دوو ڕۆبل کرێی ئەو خانووە بدات، هەر خواردنێکی چێشتخانەی (سووخوز) دوو ڕۆبل ی گەرەکە، بەلاّم ئەم جۆرە خواردنە بۆ کەسانێك کە مانگانەیان لە (٧٥) ڕۆبل پتر نیە نالوێ، بۆیە پێویستە هەموویان بێجگە لە نان بە یەك ماسی نیو قوتوو قەناعەت بکەن و ڕازی بن.[1]

لە جێیەکی تردا دەڵێت:

(..چۆن دەگونجێ لەبەرامبەر بە سووك سەیر کردن یان لانی کەم ئەمیەت پێدانی خۆشبەختان و پارە دارانی ڕووسیا سەبارەت بە ژێر دەستان واتە خزمەت کاران و کرێکاران و ژنان و پیاوانی کرێ گرتە _چاکتر بڵێم سەبارەت بە نەداران_ تووڕە نەبم و هەست بە ئازاردانی دەروون نەکەم؟! لە ڕووسیا چینایەتی نیە، بەلاّم هەژار و نەدار زۆرە ، زۆر زۆرە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمن بۆیە گەشتم کرد بۆ ڕووسیا کە هەژاران نەبینم یان لانی کەم چەند سبەینەیەك هەژاران نەبینم.

پێویستە ئەوەش بڵێم کە لە ڕووسیا هیچ جۆرە خێرخوایی و چاکە کردنێك نیە، چونکە لە پرۆگرامی دەوڵەت دا هەیە کە دەوڵەت ئەو کارە _تێر کردنی دانیشتووان_ بە ئەستۆوە بگرێ، بۆیە هیچ پێویست ناکات خەلکی هەندێکیان دەسگرۆیی هەندێکیان بکەن !!

لەوەوە جۆرە وشکی و ساردییەك لە پەیوەندی نێوان خەلکی دا دەردەکەوێ، هەرچەند بە ڕواڵەت هاوڕێی یەکترن).[2]

---

(١) سەیری کتێبی (کشورمن و جهان) بکە نوسراوی سرخاروف لاپەڕە (٦٣).
(٢) سەیری (باز گشت از شوروی) بکە لاپەڕە ٤٤.

میلۆفان دوجیلاس دەڵێت:[1]

(هەموو ئەو لایەنە سەلبی‌یانەی مارکسیزم گومانی وابـو لـە داهـاتوودا نایان هێڵێ لە نێو خودی ئەویش دا پەیدا بوون و بوونە بەشێکی پێك هێنەری، مارکسیزم جووڵانەوەیەکی جەماوەری بوو بە ناوی زانیاری‌یـەوە وای ڕاگەیانـد کە ئەو خەڵکەی لە ژێر نیری زوڵم و زۆر و چەوساندنەوەدا دەناڵێنن بەهەشتیان لەسەر زەوی بۆ دروست دەکـات، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە ملیۆنـەها ئینـسانی بەکوشت دا لە پێناوی هێنانەدی ئەو خەونەی لە هەوەڵی مێژووەوە خوتخوتـەی دڵی مرۆڤایەتی دەدات، بەڵام هـەر هێنـدە زانـرا بـوو بـە چـەند دەوڵـەتێکی بیروقراتیانـە کـە لەسـەر دەسـەڵات و گەورایـەتی و سەرچـاوەکانی دارایـی و بازارەکانی جیهان و هەر شتێکی تر کـە دەوڵـەت و سیاسـی‌یـەکانی جیهـان یەکتری لەسەر دەکوژن، یەکدی دەکوژن و بەردەوامیش یەکدی دەهاڕن.

...شیوعیایەتی بە لەبەر کردنی کاڵای ئیشتیمان پـەروەری و بـە گرتنـە بەری چەند ڕێیەکی تایبەتی کەمەندکێش کرا بۆ چەند ڕێیـەکی نـەزانراو کـە بوون بەهۆی چەندین گێروگرفت و بەڵا، لە ڕاستی‌دا مارکسیزم تۆوێکە بە زەوی ئیشتیمان پەروەری وەرکراوە و بۆتـە هـۆی هێنانـە بەرهـەمی گێرەوکێـشە و چەرمەسەری، ڕەنگە ئەوەش شتێکی چاوەڕوان کراو بووبێ بۆ بیردۆزەیـەك لاڤی تەفسیر کردنێکی تەواوی بوونەوەر لێ دەدا و چارەنووسێکی دیکتاتۆرانە لەسەر ئینسان فەرز دەکات.

ئەو یاسا و دەستووورە ئابووری‌یانەی کە شیوعی‌یەکان پێیان وابوو بە پێی نەخشەیەك دەبێتە هۆی لابرانی بەرهەم هێنانی بازاڕ و دەبێتە هۆی ئـەوە کـە هەر ئینسانێك بە پێی پێویست سەرف بکات، یان لینین گوتەنی: دەبێتە هۆی

(1) سەرچاوەی پێشوو ص ٤٦.

گۆڕینی زێڕ بۆ کانزایەك کە تەنیا بۆ دروست کردنی ئاودەستان بەکەڵك بێت، ئەو دەستووره ئابووری‌یە ئەمڕۆ بە دوای چارەسەرێك دا دەگەڕێت لە بازاڕی ئازاد دا، لە جێی لابردنی جەنگ وەك شیوعی‌یەکان بیریان لێ دەکردەوە دەوڵەتە شیوعی‌یەکان دەوڵەتە گچکەکانیان کردە کۆیلە، ئەوەتا مرۆڤایەتی ئێستا لە ژێر مەترسی ناکۆکی نێوان دوو دەوڵەتە زلە شیوعی‌یەکان دا دەژیەت واتە ڕووسیا و چین، ناکۆکی‌یەك کە کەمتر نیە لە ناکۆکی ئەو دەوڵەتە شیوعی‌یانە لەگەڵ دەوڵەتی ڕژێمە کۆنەکان دا.

بەم شێوەیە (ڕزگار کەرانی مرۆڤایەتی) بە پەلە بەرەو جەنگی نێو خۆیی دەچن و (بەدی هێنەرانی بەختیاری) ناچار دەبن بە خەم ڕزگار کردنی خۆیانەوە بن.

مارکسی‌یەکان بۆیان نیە جگە لە خۆیان گلەیی لە کەس بکەن لەسەر ئەو نەگبەتی و ڕۆژ ڕەشی‌یەی بەسەریان هات، چونکە سووربوونیان لەسەر بڕوا بەوە کە لە توانایان دا هەیە سروشتی ئینسان بگۆڕن و هەوڵیان بۆ هێنانە دی خەونەکەیان بە ڕسقاندنی کۆمەڵگایەکی خەیاڵی، تەنیا یەك ئەنجامی لێ هاتە دی ئەویش ئەوەیە کە بیرەکانیان و خۆشیان بوونە نێچیری ئەو توند و تیژی‌یەی هەڵیان ئایساند.

ئینسان لە ژێر سایەی مارکسیزم دا سەلماندی کە بە زەحمەت ڕام دەکرێ هەروەك لە گشت قۆناغە مێژوویی‌یەکانی تردا سەلماندوویەتی.

دیسان سەلماندنی کە ناتوانن خۆی بگونجێنن لەگەڵ چەند بیردۆزەیەکی میسالیانەدا بە تایبەتی ئەو بیرە میسالی‌یەی کە خۆی خڕ هەڵداوە لە تەسك کردنەوەی سنووری ئازادی و دیاری کردنی چارەنووسی دا).[1]

---

(١) (مجتمع غير كامل الشيوعية المتفككة. ميلوفان دوجيلاس. لاپەڕە (١٩، ٢٠، ٢١).

لە جێیەکی دیکەدا دەڵێت:(١)



(... [illegible] بەهەشتە زەمینیی یە [illegible] مەگەر بە قسە نەبێ [illegible]

گیروگرفتی مارکسیزم و ئەو گەلانەی لە ژێر ڕکێفی دا دەژین [illegible] بەرین و هاڵۆزە هیچ ژیری‌یەك ناتوانێ دەخۆیدا وەحەوێنێ یان گرێ‌یەکانی بکاتەوە.

... ئەگەر بێت و وشەی (سەرمایە) بگۆڕینەوە بە وشەی (حیزب)، دەتوانین بەچاوی خۆمان چارەنووسی شیوعیایەتی ببینین لە هەمان چارەنووسدا کە مارکس بۆ سەرمایەداری دیاری کردوە: (دەس بەسەرداگرتنی سەرمایە (حیزب) دەبێتە کۆسپ و لەمپەر لە ڕێی ئەو بەرهەم هێنانەدا کە لە گەلیدا و لە ژێری دا گەشەی کردوە...)

(..هەر خوا دەزانێ داهاتوو چۆن دەبێ، بەڵام ئێمەی ئینسانی ئاسایش دەتوانین تێبینی بکەین کە مارکسیزم دوو هەڵەی پشت شکێنی کردوون:

١- ئەو ئەنجامە کۆتایی‌یەی ڕەچاوی کردبوو بۆ ڕژێمە سەرمایەداری‌یەکانی ڕۆژئاوا نەهاتە دی، چونکە ئەو ڕژێمانە نەك هەر نەمردن بەڵکو زانیشیان چۆن ڕێ دەپێون لە پێش کەوتنی تەکنۆلۆجیادا.

٢- ڕێکاری ژیان لە وڵاتە مارکسی‌یەکان دا زۆر نزمتر بۆتەوە لەو ئاستەی بۆیان دانابوو)(٢)

(١) سەرچاوەی پێشوو ص (١٥٦، ١٥٧).
(٢) سەرچاوەی پێشوو ص (١٦٢).

## خوێنەری بەڕێز !

زۆر جاران کە لەگەڵ مارکسی یەکان دا دەکەویە گفتوگۆو بەهێنانەوەی چەندەها بەڵگەی واقیعی لەسەر پووچی مارکسیزم لە واقیعی ژیانی ئەو کۆمەڵگایانەدا کە بیردۆزەی مارکسیزمیان تێدا چەسپێنراوە، پێت دەڵێن ئاخر بابە تا ئێستا ئەو بیردۆزەیە بە چاکی جێبەجێ نەکراوە و خەتای بیروباوەڕەکە نیە !!

بەڵام با بزانین (میلۆڤان دوجیلاس) چ دەڵێت لەو بارەوە:

(...ئەو تێشکان و سەرنەکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ زاتی مارکسیزم، بۆیە وەك دەردەکەوێ چارەکردنی ئەستەمە...مارکسیزم لە مل ملانێ دایە لەگەڵ ژیان دا، وە ئەوانەی گۆڕی بۆ هەڵ دەقەنن هەر ئەو کەسانەن کە بە پێی ڕێنموونی یەکانی کار دەکەن، لە ماوەی پشت (جیل) ێك دا سەرکردەکان لە شۆڕش گێڕی یەوە گۆڕان بۆ چەوسێنەرەوە و لە چەوسێنەرەوەیی یەوە بۆ بێ بەند و باری و جارێکی دی بیرەکانی مارکسیزمیان بەکارنەهێنا مەگەر وەك دروشمێکی بازرگانی.

وە ئەو هەموو دەسکاری کردنەی سەرکردەکان و بەرهەڵستی نەفامانەیان لە ئاقار واقیعی ژیان و بیردۆزەی نەگونجاوو پێکەوە دژدا شێوەی مارکسیزمی گۆڕی و دزێوی کرد، ئەو مارکسیزمەی کە لە ڕابوردوودا جێی هیوا و ترووسکەی ئاواتی ملیۆنەها زەحمەت کێش بوو وای لێ هات بوو بە ناقۆلاترین و نالەبارترین ڕژێم !!)[1].

---

(١) مجتمع غير كامل الشيوعية المتفككة، ميلوفان دوجيلاس ص(١٦٧).

٣- ئەوە کورتەیەك بوو دەربارەی واقیعی پڕ گێرە و کێشە و (قڕی و پڕی) هەردوو جیهانی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوا، ئێستاش با سەرێك لە ژیانی ئەو ولاَتانە بدەین لە لایەنی کۆمەلاَیەتی و ئەخلاقی‌یەوە:

## أ- ڕەگەز پەرستی:

(..لە شارستانەتی ڕۆژئاوا ئینسانی سپی پێست لە هەموو شتێك دا جوێیە لە ئینسانی ڕەش پێست، ئەو ڕێیەی سپی پێیدا دەڕوات بە هیچ کلۆجێك ڕەش بۆی نیە توخنی کەوێ، وە کاتێك (سپی) ناچار دەبێ ئیش بە بابای (ڕەش) بکات _لەبەر هەرزانی کرێ‌کەیان_ لەسەری پێویستە هەر پاش دەست هەلگرتنی لە کار یەکسەر لە کێلگەی سپی‌یەکان بچێتە خوار بۆ کۆلێتەکانیان، کە زۆر لە خانووبەرەی سپی‌یەکانەوە دوورن !!

هەروەها سپی‌یەکان دەرگا و ڕێ و بانی تایبەتی‌یان هەیە لە وەزارەت و دایرەکانی دەولەت دا، وە شوێنی دانیشتنی تایبەتی‌یان هەیە لە نێو پاسی هاتووچۆدا ؟!)[1] .

(..لە چاخانە و باغی گشتی و گۆمی مەلەکردنیش دا سپی‌یەکان ئیمتیازی تایبەتی و قانوونی خۆیان هەیە!

بۆ وێنە لە (جوهانسبورغ)دا کە بە دەولەمەندترین شاری دنیا دادەنرێ، لێك جوێ کردنەوەی ڕەگەز پەرستانەی ڕەش و سپی تەنیا لە ترومبێلە گشتی‌یەکان و چێشخانە و شانۆ و خەستەخانەکان دا بەڕێوە نابرێ، بەلکو لە بینا گشتی‌یەکانیش دا دەرگا و ئەسانسۆر (مصعدة)ی تایبەتی هەیە بۆ سپی‌یەکان و جۆرێکی تریش بۆ ڕەشەکان !!

(١) سەیری (صور متقابلة من حضارتين متقابلتين) بکە (هادي المدرسي) لاپەڕە (٢٩).



Scanned by CamScanner

لە قەراغ دەریاکان دا هەموو کاتێك ئەندازەی (٥٠٠) مەتر هەیە کە ڕەش پێستەکان لە سپی یەکان جوێ دەکاتەوە و بۆیان نیە تێکەڵ بن!![1].

.. هەڵبەتە خانوو بەری سپی یەکان و ژن و ژن خوازی یان جوێ یە لە ڕەش پێستەکان بەڵام ئایا تەنیا ئەوەندە هەیە لە هەگبەی شارستانەتی ماددی دا و هیچی سەبارەت بە ڕەگەز پەرستی؟ دیارە نەء !

لە خوارووی ئەفریقادا پێویستە هەر ئەفریقایی یەك ئیجازەی هاتووچۆ (اجازة مرور)ی پێ بێ کە تێ یدا نوسرا بێ ئەو کەسە بۆی هەیە لە گەڕەکی سپی پێستەکان دا دانیشێ لە نیزیك شاری (جوهانسبورغ) وە تێ یدا نوسرابێ بۆی هەیە بچێتە نێو شار بۆ ئیش کردنێ وە تێ یدا بێت کە بۆی هەیە بە شەوێ لە نێو شاردا بێنێتەوە ![2].

... وە لە ڕۆدیسیا کە (٩٠) هەزار سپی دەستیان بەسەر چارەنووسی (١٦) ملیۆن ڕەش دا گرتوە، هەر بە هەمان پێ و دان حیساب لەگەڵ ڕەش پێستەکان دا دەکرێ، بۆ وێنە:

(جوردون وود) ئەفسەرێکی پێشووی سوپای سپی پێست لە لەندەن بە ڕۆژنامە نووسەکانی گوت: بە فەرمانی (أیان سمیث) سەرۆك وەزیری سپی دوو ئەفریقایی مەدەنی بێ چەك و بێ تاوانم کوشت.

هەروەها گوتی: لە ڕۆدیسیا یاسای هەڵس و کەوت لە نێو سپی و ڕەش دا ئەوەیە: ئەی سپی ڕەش بکوژە، ئینجا بپرسە بۆچی بێرەدا دەڕۆیی، یان لێرەدا ڕاوەستابوو؟!

(١) سەرچاوەی پێشوو ص (٣٣).

(٢) سەرچاوەی پێشوو ص (٣٦).



Scanned by CamScanner

دیسان گوتی: زۆر جاران لەگەڵ برادەرانم دا ئەفریقایی یەکانم کوشتوون و ئینجا پارچە پارچەم کردوون و دەرخواردی کەر گەدێنانم داون، هەرچەندە هیچ کام لەوانەش چەکیان هەڵنە گرتوە.

هەروەها (جوردون وود) چەند وێنەیەکی پیشان داوە لە کۆمەڵە قامک و گوێ و لووت و ئەندام جینسی براوی ڕەش پێستەکان..)[1].

(...لە ئەمریکاش تا ئێستا دیاردەی چەوسێنرانەوەی ڕەش پێستەکان هەر ماوە بۆ وێنە:

لە بیست ویلایەتی ئەمریکی‌دا ڕێگە بە ڕەشەکان نادرێ کە لەگەڵ سپی یەکان لە یەك قوتابخانەدا بخوێنن.

دیسان لە زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکادا ڕێگە نادرێ کە پیاوێکی ڕەش ژنێکی سپی بێنێ یان بە پەراوە ژووەوە.

لە مەیدانی ئیش کردنیش دا قانوونی هەندێك لە ویلایەتەکان ڕێ بە کرێکارە ڕەشەکان نادات کە لەگەڵ کرێکارە سپی یەکان لە یەك شوێن دا بن، هەروەها کرێکارە ڕەشەکان بۆیان نیە لەو دەرگایەوە هاتووچۆ بکەن کە تایبەتە بە سپی یەکانەوە!).

لە مەیدانی کۆمەڵایەتیش دا قانوونی (١٤) ویلایەت حوکم دەکات بە جوێ کردنەوەی نەفەرە سپی یەکان لە ڕەشەکان لە شەمەندەفەران دا ، وە لە ئەووری تەلەفۆن کردن و لە خەستەخانەدا، تەنانەت لە خەستەخانەی نەخۆشی یە مێشکی یەکانیش دا، جیاوازی لە نێوان شێتی سپی شێتی ڕەش دا دەکەن !!

وە تەنانەت لە کەنیسەکانیش دا جیاوازی ڕەگەز پەرستانە هەیە !!

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص (٣٧، ٣٩).



Scanned by CamScanner

ئەوە هەمووی لە کاتێك دا کە (١٠٪)ی دانیشتووانی ئەمریکا ڕەشن واتە (٢٣) ملیۆن!!

جێی سەرنجە کە ڕێژەی خۆکوشتن (انتحار) لە ڕیزی ئەو گەنجە ڕەشانەدا کە تەمەنیان لە نێوان (١٥_٢٤) دایە زۆر زۆر بووە، خۆ لە نێـو ئافرەتـان دا ڕێژەکە (٣) چەندانە بووە!

دیسان تەمەنی ئینسانی ڕەشی ئەمریکایی بە (٦) ساڵ کـەمترە لـە نـی سپی، وە ڕێژەی مردووانی دایـك و شـیرە خـۆرە ڕەشـەکان دەگاتـە (٣) سـێ ئەوەندەی نی سپی پێستەکان.[1]

ب- بێ ئەخلاقی و ڕەوشت پیسی:

(...هەر لە پێنج کچی ئینگلیزی کە دەچن بۆ کەنیسە یەکێکیان زگ پڕە، وە لە لەندەن هەموو ساڵێك زیاتر لە (٥٠٠,٠٠٠) بیژوو (زۆڵ) لە دایك دەبن، وە لە هەر (٢٠) منداڵێك یەکێکیان زۆڵە !!

لە ئەنجامی ئەو هەموو بەرهەڵدایی یە کە لە ویلایەتی (کالیفۆرنیا) لە ساڵی (١٩٥٦)دا لـە (٨٧٤٥٢) ژن هێنـان (٤٤٧١) تـەڵاق دان ڕوویدا، هەروەها لە بەریتانیا: ژنان لە تەعدا لێ کردنی جینسی مەترسییان هەیە، وە باوکان مەترسی ژنان و کچانیان هەیە.

تەنانەت ماوەیەك لەمەوبەر پیرەژنێکی (٩٠) ساڵە کەوتـە بـەر ڕکێفی تەعدا و کوتەك لێدانی (٣) کەسی لاو کە تەمەنیان لە (١٧) ساڵ پتر نـەبوو، پیرەژنەکە سەرەڕای شکانی دەم و چاوو شەویلاگەی سێ پەراسووشی شکابوون !!

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص (٤٤، ٥٥، ٤٩).



Scanned by CamScanner

لەهەر (١٥) ئافرەتی پیر یەکێکیان مەترسی تەعدای جینسی لێ دەکرێ، ژنان لەم تەمەنی پیری‌دا لە هەموو کەسێکی دیکە زیاتر جێی مەترسی تەعدان.

لە (٥٠%) ژنانی (٦٥) ساڵە و زیاتر مەترسی هێرش بردنە سەر و تالآن کردن و گیرفان برینیان هەیە !

لە هەر (١٥) ژن (٧) یان مەترسی‌یان لێ‌دەکرێ کە شەوێ بەسەر شەقامەکان دا برۆن.

گرنگترین سەرژمێر (ئامار) کە بە دەست گەیوە ئەوەیە کە نیوەی خەلکی بەریتانیا چ ژن و چ پیاو چ گەنج و چ پیر لە هێرشی شەوانەی سەر کۆلآن و جادەکان دەترسێن.

لەهەر (١٠) کەسێك چوار لە دایك و باوکان مەترسی منداڵەکانیان هەیە کە لە دەمی یاری کردن دا بێگانە زیانیان لێ بدەن.

لەهەر (١٠) دایك و باب (٣) یان مەترسی زیان گەیاندنیان هەیە بە منداڵەکانیان لە دەمی چوون و هاتنەوە لە مەکتەب.

زۆربەی زۆری ئەو تاوانەی کە لە ئەمریکا و ڕووسیا و ئەوروپادا ڕوو دەدەن بەهۆی خوو پێوە گرتنی خەلکی ئەو شوێنانەوەیە بە ئارەق (مەی خواردنەوەوە.

یەکێك لە سەرکردەکانی ئەمریکا گوتی: ئەمریکا لە ماوەی (١٠) ساڵدا (١٨) هەزار بیلیۆن دۆلاری لە مەی خواردنەوەدا سەرف کردوە، لە ئەنجامی ئەوەدا پتر لە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار گەنج براونە (دار المساکین) و[1]

(١) خانووی پەك کەوتان.

(٢٠٠٠) دوو هەزار خۆیان کوشتوەو (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار ئافرەت براونە بەندیخانە و (١٥٠٠) هەزار و پێنج سەد کەس کوژراوە و (٢٠٠,٠٠٠) دوو سەد هەزار ژن بێوە ژن بووە و یەك ملیۆن (١٠٠٠,٠٠٠) منداڵ بێ باب بەجێ ماوە.

دیسان بەهۆی ئەو مەی خواردنەوەوە لە ئەمریکا لە هەر (٢٥) دەقیقەدا یەك تاوانی گەورە و لە هەر (٢٤)سەعات دا (٣)قەتڵ و پێنج زینای بە زۆرە ملی و سێ دزی گەورە و سێ هەزار دزی گچکە ڕوو دەدات.

ڕۆژنامەی (پراڤدا)ی ڕووسی نوسیویەتی: (خواردنەوەی مەی لە ڕووسیادا بۆتە هۆی زیاد بوونی ژمارەی تاوان و غایب بوون و کەم و کەسری لە کاری کارخانەکان دا)[1].

سولژنیتسن دەڵێت:

(..مەترسی مەی خواردنەوە لەکۆمەڵگای ڕووسیاییدا شتێك نیە گومانی لێ بکرێ، تازە ڕۆژنامەی (ژن مین ژیبانو) چاپی پکین نووسیویەتی:

(..کۆمەڵگای ڕووسیا دووچاری خراپەکاری ، دزی ، سوود خۆری، داوێن پیسی و مەی خواردنەوە و مادده بێ هۆش کەرەکان بووە، بڵاو بوونەوەی ئەو خراپی و ناتەواوی‌یانە ماهیەتی کۆنەپەرستانە و مشەخۆری کۆمەڵگای ڕووسیایی‌مان بۆ دەردەخات.

کرێکارانی ڕووسیا زۆربەیان چونکە ناتوانن هەست و نەستی دژ بە دەوڵەتی خۆیان سەبارەت بە کاربەدەستانی خۆیان دەربڕن پەنا دەبەنە بەر (مەی)، شەخسی مام نێوەندی ڕووسیایی دوو هێندەی شەخسی مام نێوەندی

(١) مفاسد تمدن غرب لاپەڕە (٣٢، ٣٣، ٣٤) از مهرداد مهرین.



Scanned by CamScanner

ئەمریکی مەی بەکاردێنێ، وە هەر ساڵێك (٦_٧) ملیۆن نەفەر لە خەڵکی ڕووسیا بە مەبەستی تەرك کردنی مەی دەبرێنە دەزگا ووریا کەرەوەکانەوە، سەرەڕای ئەوەش مادده بێ هۆش کەرەکان زیادیان کردوە و لە بارتەقای ویش دا سزا و جەزرەبەی ئەو مادده بێ‌هۆش کەرانەش هەلکشیوە.

چونکە پلەی بڕوانامە (الشهادة) یەکێکە لەو ڕێ‌یانەی لێیانەوە دەگەی بە ناوو شۆرەت و سامان لە ڕووسیادا، زۆربەی خەڵکی وێ دەستیان داوەتە دزین یان کڕینی بڕوانامە.

...داوێن پیسی دیسان وردە وردە لە ڕووسیا تەشەنە دەکات و ئەو نەخۆشی‌یانەش کە ئەنجامی سروشتی وین پەرە دەستێنن..)[1]

(...پزیشکانی ستۆکهۆڵم لە کتێبۆلکەیەك دا کە لە پاریس بلاو کرایەوە دەریان بڕی کە منداڵێك بە سەرخۆشی لە دایك بووە بەهۆی بەردەوامی دایکی لەسەر مەی خواردنەوە !!

لە ئەڵمانیا سێ پزیشك وتووێژێکیان کرد لەگەڵ قوتابیانی زانکۆی (بۆن) بۆ زانینی ئەندازەی بلاوبوونەوەی خواردنی مادده بێ هۆش کەرەکان لە نێو قوتابیان دا، وە دەرکەوت کە ١/٥ی قوتابیان جۆرێك لەو مادده بێ هۆش کەرانە دەخۆن، قوتابیانی کولێجی (پزیشکی گەری) لە پێش هەموانەوە دێن..)[2].

(...بەڵام ئەگەر ئەنجامی ئەو پشکنینە کە لە زانکۆی (بۆن)دا بەڕێوە برا بەرامبەری پێ بکرێ لەگەڵ ئەوەی بەڕێوە برا بۆ قوتابیانی زانکۆی (سوربون)

(١) بەرماسدارانی شوورەوی (سولژنیتسن) لاپەڕە (٢٢، ٢٣).
(٢) (صور متقابلة من حضارتين متقابلتين) هادي المدرسي. لاپەڕە (٦٣، ٦٥).



Scanned by CamScanner

لە ساڵی (١٩٧٦) دەبینرێ کە ڕێژەی زانکۆی سوربون زیاترە لەو بارەوە چونکە لە زانکۆی سوربون دا ڕێژەی قوتابیانی مەی خۆر گەیوەتە (٦٣٪).

(...پۆلیسی فەرەنسی ڕای گەیاند کە نیوەی تاوانەکانی پاریس بەهۆی ماددە بێ هۆشکەرەکانەوە دێنە دی، چونکە بابای مەی خۆر دەبێتە دز و ڕێ گر و پیاو کوژ، بۆ هێنانە دی ماڵ و دارایی بۆ کڕینی پێویستی یەکانی.

(...لە ئەمریکا (٣٥) ملیۆن کەس ماددە سەرخۆش کەرەکان بەکار دێنن...لە نێویان دا هەرسێك کوڕەکەی (کارتەر) هەن، هەروەها هەر بە شەش سەعات لە ئەمریکا نەفەرێك دەمرێ تەنیا بە هۆی (هیرۆیین)ەوە!!

(...وە لە ئیتالیا یەکێك لە دەزگا کۆمەڵایەتی یەکان ڕای گەیاند کە بەردەوامی لەسەر مەی خۆری پڕ مەترسی ترین نەخۆشی کۆمەڵایەتی یە کە تووشی گەل هاتوە، وە ڕاپۆرتەکان ئاماژە دەکەن کە ژمارەی مەی خۆران گەیوەتە (٤) ملیۆن کەس، مەی خواردنەوە لە ئیتالیا سێیەمین هۆیە بۆ مردن لە دوای شێر پەنجە و نەخۆشی یەکانی دڵ.

بەڵام ئایا هۆی ئەو هەموو مەی خواردنەوە چیە؟!

یەکێك لە پزیشکە فەرەنسایی یەکان دەڵێت: (ئێمە لە کۆمەڵگای خۆمان دا بەختیاری نابینین، ماددە سەرخۆش کەرەکان تاقە هۆی وەدەست هێنانی بەختیاری زایە بوو و لە دەست چوومان)[1].

هەڵبەتە هۆی نەبوونی بەختیاری و کامەرانیش: نەبوونی ئیمان و عەقیدە و هەبوونی خەفەت و دڵەڕاوکێ و بێ ئیشی و بڵاو بوونەوەی داوێن پیسی و بەسینایی وەدەست هێنانی ماددە بێ هۆش کەرەکانە.

---

(١) ـ چاوەی پێشوو لاپەڕە (٦٥و٦٧).



Scanned by CamScanner

ج. هەبوونی مەترسی و هەست نە کردن بە ئاسایش:

(... بە شێوەیەکی گشتی لە ئەمریکا لە هەر چرکەیەک دا تاوانێك و دزی‌یەك دەقەومێ !

وە لە هەر (٣٠)چرکەدا دزی‌یەکی چەکدارانە:

وە لە هەر (٦٠) چرکەدا دزینی کچێك !

وە لە هەر (٥) دەقەدا دزینی ترومبێلێك !

وە تەنیا لە ساڵی ی(١٩٧٤) دا (١٠) هەزار ئەمریکی کوژران[1].

(.. وە لەگەڵ ئەوەش دا دەوڵەت هەر ساڵێك (٩١) ملیار دۆلار خەرج دەکات بۆ نەهێشتنی تاوان، وە لە بەندیخانەکان دا (٣٥) هەزار تاوانباری مەترسی لێ کراو هەن!

(... سەرژمێری‌یەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا دەڵێن:

١. (٣) ملیۆن تاوان لە ئەڵمانیا ڕوو دەدات لەهەر ساڵێك دا.

٢. لە (٢٠٪)ی ئەڵمانیەکان حەوجێی پزیشکی نەفسین واتە لە (٦٠) ملیۆن (١٢) ملیۆن سەر لە خەستەخانە ژیری و دەروونی‌یەکان دەدەن.

٣. لە ئەڵمانیا هەموو شتێك قابیلی دزرانە هەر لە پێڵاوو خانوو و بەرەوە بیگرە هەتا شەمەندەفەر و بەنزین خانە و چەك.

٤. چینایەتی (قری و پری) لە کۆمەڵگای ئەڵمانی‌دا بە پیسی بلاّو بۆتەوە چونکە لەگەڵ دەوڵەمەندی ئەو دەوڵەتەدا ١/٤ی دانیشتووان لە هەژاری دا دەژین، (٥) ملیۆن خێزان[2] سەرمایەی مانگێکیان ناگاتە (٥٠٠)

(١) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٨٩).
(٢) واتە هەر خێزانێك لەو (٥) ملیۆنە.

مارك، واتە (٦٠) دینار، بەڵام ١٢ هەزار خێزان سەرمایەی هەر ساڵێکیان پترە لە (١) ملیۆن مارك !![1]

هەڵبەتە باقی دەوڵەتەکانی تریش وەك : سوید و نەرویج و ئیتالیا و ئەرجەنتین و بەریتانیا و هتد لە هەمان بارودۆخ دا دەژین.

## د.کپ کردنی ئازادی ئینسان و تواندنەوەی ئیرادە و پلیشاندنەوەی کەسایەتی لە کۆمەڵگا مارکسیزمی یەکان دا:-

(ئەندرەژید) دەڵێت: (لە ڕووسیا هەمیشە و لە پێش هەموو شتێك دا پێویستە ئەوە لە بەرچاو بگیرێ کە سەبارەت بە هەر مەسەلەیەك و بەهەر شتێك پێویستە تەنیا یەك بیر و باوەڕ و هەڵوێست هەبێت و بەس...)[2].

هەروەها دەڵێت:

(..دام و دەزگای خوێندن و فێر کردن لە ڕووسیا تەنیا ئەو شتانە باس دەکات کە بتوانێ بیروهۆشی خەڵك ئامادە بکات کە درووود و سڵاو بۆ دیداری دەوڵەت بنێرن، وە نووکی پەروەردە و فێرکردنی ڕووسیایی تەنیا بەم مەبەستە تیژ کراوە.

...دەزانین کە بە ڕواڵەت لە ڕووسیا ڕەخنە لەخۆ گرتن (النقد الذاتي) زۆر بە گرنگ سەیری دەکرێ و دایە لەسەر زاریانە، ئەمن کە لە دوورڕا شتێکم لەو بارەوە دەبیست زۆر دڵم پێ خۆش دەبوو بیرم دەکردەوە کە ئەگەر بە دڵسۆزی بەکار بێنرێ ئاکامی زۆر چاکی دەبێ، بەڵام زۆر زوو زانیم کە ئەو ڕەخنە لە خۆ

(١) باز گشت از شوروی لاپەڕە (٣٦).

(٢) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٩٨، ٩٩).



Scanned by CamScanner

گرتنە هیچ شوێنەوارێکی نیە، بێجگە لە چەند ڕەخنەیەکی جوزئی و گچکەلۆکە، وەك: بۆچی گۆشتاوی نیوەڕۆ ناخۆش بوو؟!

بێجگە لەم چەشنە ڕەخنە گچکانە ڕەخنە لەخۆ گرتن تەنیا لەو جوغزەدا خڕ هەڵدراوە کە خۆیان یان لە یەکێکی تر بپرسن: ئایا فلان و فیسارە مەسەلە بە پێی دەستووری ڕژێم بوو یان نا؟ ئەما دەربارەی خودی دەستوور و بەرنامەی دەوڵەت هەرگیز باسێك یان ڕەخنەیەك نایەتە دی، ئەوەی کە باسی لێ بکرێ تەنیا ئەوەیە کە ئایا فلانە ئیش و فلانە قسە وەکو پەیرەوو پرۆگرامی پەیڕەوە یان نا؟ وە هاوار بە حاڵی کەسێك کە نەختێك لاقی لەو بەرەیە تێ بەرێنێ...!!)[1] .

(... ڕژێمی شیوعی پێشتگری لە دانیشتووانی خۆی دەکات لە زانینی هەواڵ و ڕووداوەکانی دنیا، وە هیچ هەواڵێك بە ئینسانی نێو وڵاتە شیوعی‌یەکان ناگات مەگەر ئەو هەواڵانە نەبێ کە ڕژێم دانیان پێدا دەنێ، بۆ وێنە ئامێری ڕادیۆ نیە غەیری ئەو جۆرانە کە توانای وەرگرتنی شەپۆلی ئیستگاکانی تریان نیە.

دیسان ئامێرەکانی شێواندن (تشویش)یش کاری خۆیان دەکەن لە ئیستگاکان دا تاکو ئەوانەی ئامێری گەورە شك دەبەن نەتوانن لە دەرەوەی ڕووسیا بەڵەد بن!

وە ئەندازەی ئەو ئامێرانەی بۆ شێواندنی شەپۆلی ئیستگاکانی دەرەوە دانراون لە وڵاتە مارکسیزمی‌یەکان دا بە دەور و بەری (٢٥٠٠) ئامێر دەگەن.

وە ئەو پارەیەی لە دروست کردنیان چووە بە (١٠٠) ملیۆن دۆلار دەگات.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣٨)



Scanned by CamScanner

هەروەها ساڵانە نزیکەی (٣٥) ملیـۆن دۆلار خـەرج دەکـەن، واتـە چوار ئەوەندی کە سەرف دەکرێ لە هـەموو ئیـستگا غـەیرە شـیوعیەیەکان دا کـە شەپۆلەکانیان دەنێرن بۆ وڵاتە شیوعی یەکان.

سەربارەی ئەوەش ڕژێمە شیوعی یەکان بەرگری هاتنە ژوورەوەی هەر جۆرە کتێبێـك دەکـەن کـە لەگـەڵ بـاوەڕی پـیرۆز (مقـدس)ی ڕژێـم دا نـالوێ و کاربەدەستانی دەوڵەت لیستەی ئەو کتێبانە ئامادە دەکەن کـە میللـەت بـۆی هەیە بیان خوێنێتەوە.

شتێکی سروشتیشە کە لە بـارودۆخێکی وادا گـەل تـا ئەندازەیـەك ڕازی دەبێت لە ڕژێم، چونکە هیچ شتێکی تر شـك نابـات لـەجێیدا دای نێـت.[1]

خوێنەری ئازیز!

پێم وایە بە خستنە ڕووی چەند نمونەیەکی دزێـو ڕەش و تـاڵ لـە ژیـانی کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی یە لارێ بووەکان لە ڕاستە شەقامی ژیان، لە بەرنامەی خوا، ماندووم کردی و دەروونم ئازار دای، بەڵام داوای لـێ بووردنـت لـێ دەکەم چونکە ناچار بووم، بۆ خـاتری وەی چـاکتر قـەدری ڕۆژی ڕوونـاکی ئیسلامەتی بزانی چەند تابلۆیەکت لـە شـەوگاری ئەنگوسـتە چـاوی ڕێـچکە دەسکردەکان بخەمە بەر نیگا، ئێستاش بۆ ئەوەی برێك دڵ و مێشکت مشت و ماڵ بکرێ و تیف تیفە بدرێ، چـەند قـسەیەکی خۆشـت بـۆ دەگێڕمـەوە کـە دانیشتووانی هەژار و برسی ڕووسیای بێ بـەش لـە ئـازادی دەربـڕینی بـەدوڕا کردوویانە بە شێوازی دەربڕینی هەست و نەستیان:

---

(١) سەیری کتێبی (لا للراسمالیة لا للمارکسیة نعم للاسلام) بکە نوسراوی هادی المدرسی لاپەڕە (١٩٣، ١٩٤).



Scanned by CamScanner

یەکەم :

- : پەیکەری ئیسقان چیە؟!

+ : بابای جوتیارە دوای ئەوەی بەروبوومەکەی تەسلیمی دەوڵەت دەکات هەروەها بەر لە تەسلیم کردنیشی !!

دووەم :

- : ئادەم و حەووا چ رەگەزێکیان هەبوو ؟

+ : بێ گومان رووسیایی بوون.

-: بۆچی؟

+: چونکە بە رووت و قووتی دەژیان و برواشیان وابوو لە بەهەشتیدان!

سێیەم :

- : سەرمایەداریەتی چیە؟

+ : بریتیە لە چەوساندنەوەی ئینسان بۆ ئینسان.

- : ئەدی شیوعیایەتی چیە؟!

+ : ئەو راست بە بەراوە ژوەوەیە: چەوساندنەوەی ئینسانە بۆ ئینسان !!

چوارەم :

- : هۆیە سەرەکیەکانی بەرەو پێش نەچوونی کشت و کاڵی رووسیا چین؟!

+ : ئەو هۆیانە بەرێز ئەمانەن: زستان، بەهار، هاوین و لە کۆتایی دا پاییز !!

پێنجەم:

- : ئایا رێ دەکەوێ فیل تووشی (قزری) ببێ؟!

+ : بەڵێ ، ئەگەر بیەوێ باری ئابووریمان بەرزکاتەوە !!



Scanned by CamScanner

شەشەم :

- : ئەگەر ئینسان مرد چی لێ دەکەن ؟!

+ : ئەگەر ئینسانی چاك بووبێ هیچ، ئەمما ئەگەر خراپ بووبێ ڕژێمی شیوعیایەتی بۆ دروست دەکەن و دەیخەنە نێوی !!

حەوتەم :

- : ئایا دەگونجێ خوا بپەرسترێ؟!

+ : هەتا بەڕێزان سەرکردەکانی حیزب هەبن...نەخێر !!

هەشتەم :

- : پاش ئەوەی ڕژێمی مارکسیزمی دەڕووخێ چ دەقەومێ ؟!

+: کۆتایی بەسەردەمی دەوڵەت دێ و چاخی مرۆڤ دەست پێ دەکات !

نۆیەم :

- : لە کۆنگرەی حیزبە شیوعی‌یەکان دا چ دەڵێین ؟

+ : دەڵێین: ئاوا کار دەکەین، ئاوا دروست دەکەین، وە ئاوا میللەتان دەخۆین !

دەیەم :

- : چەند کات پێویستە بۆ ڕووخانی شارستانەتی مارکسیزم؟

+ : هیچ.

-: بۆچی؟

+: چونکە هەر دروست نەبووە تا پێویست بە ڕووخانێ بکا !

یازدەم:

- : منداڵێك لە بابی پرسی:

٨+٨.. چەند دەکات ؟!



Scanned by CamScanner

بابی گوتی: پێش هاتنە کایەی ڕژێمی شیوعی دەی کردە (١٦)، ئەمما ئێستا نازانم، چونکە پێوەرەکان زۆر گۆڕراون و نازانم بە تەواوی ئەنجام چیە![1]

لێرەدا کۆتایی بە گەوهەری [2] یەکەمی ئەم ئایەتە مەزنە دێنین و دەچینە خزمەت گەوهەری دووەمی.

بەڵام بەر لەوەی دەست بکەین بە تێوەڕامانی گەوهەری دووەم وای بە چاک دەزانم پوختەی گەوهەری یەکەم لە چەند دێڕێك دا بخەمەوە بەرچاو:

لە لاپەڕەکانی پێشوودا دوو بەڵگەمان هێنایەوە بۆ سەلماندنی ڕاستی یەك ئەویش ئەوەیە کە بەرنامە و دەستووری ژیان بەتەنێ خوا دەتوانێ نەخشەی بکێشێ و دیاری بکات، چۆنیەتی فامرانەوەی ئەو ڕاستی یەش لە ئایەتی ﴿اهدنا الصراط المستقيم﴾ ئاوایە:

بەندەکان پاش ئەوەی گوتیان: ئەی خوایە بەس تۆ دەپەرستین و هەر هاواری تۆ دەکەین، زانیان کە پەرستنی خوا بە بێ بەرنامە و پەیڕەوێك ناچێتە

---

(١) سەیری کتێبی (لا للرأسمالية لا للماركسية نعم للاسلام) بکە نووسراوی هادی المدرسی لاپەڕە (١٤٥_١٦٢).

(٢) هەڵبەتە پێویستە خوێنەری خۆشەویست بزانێ کە ئەوەی لێرەدا باس کرا سەبارەت بە ڕژێمی سەرمایەداری و مارکسیزمی لوێچێك بوو لە ئەمطارێك و بە پشتیوانی خوای گەورە لە داهاتوودا نووسراوێکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین بۆ مەبەستە.

ئێستاش کە (٢٠٠٦/٣/٨) ە دەڵێم:

بلۆکی ڕۆژهەلات بنیات نراو لەسەر فەلسەفەی مارکیستی لە ساڵی (١٩٩١)ەوە لەبەریەك هەڵوەشاوە و بلۆکی ڕۆژئاواش بەڕابەرایەتی ئەمریکا وەردوونەخۆشی ئەخامەتییەکانی سەوقات زیاد بوونە، بە تایبەتی ئەمریکا کە لە زۆر باری کۆنخاپەتی کردن بەسەر دنیادا پشتی چەمیوەتەوە - پێم وایە- زۆری ئەماوە بە دەردی یەکێتی سۆڤیەت بچێ!!

سەر، ئینجا گوتیان: ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾ ڕێی ڕاستمان پیشان بدە، چونکە زانیان کە ڕێی ڕاستی ژیانی ئینسان هەر خوای ئینسان دەتوانێ دیاری بکات.

ئەو دوو بەڵگەیەش کە هێنامانەوە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیە بریتی بوون لە :

یەکەم: خستنە ڕووی دان پێداهێنان و ئیعتیراف کردنی چەند کەسێک لە زانا و پسپۆڕانی شارستانەتی ماددی بە هەردوو بەشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوە، سەبارەت بە نەگونجان و بە کەڵک نەهاتنی ئەو بیردۆزە و ڕێچکانەی کە ئینسان دای ناون و شارستانەتی ماددییان لەسەر بەندە.

دووەم: خستنە ڕووی ژیانی ناقۆڵا و دزێوی کۆمەڵگای ئەو شارستانەتی‌یە لە چەند لایەنێکەوە، کە بێ سەرەو بەرەیی و پەشێوی و بێ ئەخلاقی و بەد ڕەفتاری و دڕندەیی و دڵە ڕاوکێ و تاوان و خراپەکاری و بێ نرخ کردنی ئینسان چەند دیمەنێکی زەقی ئەو شارستانەتی‌یە بوون.

لە ئەنجامی ئەوەش دا بۆمان دەرکەوت: کە ڕاستە غەیری خوا لە بارانی‌دا نیە ڕێباز و دەستوور بۆ ئینسان دانێ و خۆ ئەگەر داشی نا بێجگە لە خراپەکاری و بێ سەرە و بەرەیی و کوێرەوەری هیچی دی بۆ مرۆڤایەتی نایەنێتە دی چونکە برکە گوژاڵک هەر ئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە قەڵەفسان بگرێ !!



Scanned by CamScanner

# گەوهەری دووەم

## تەنیا بەرنامە و ڕێبازی خوا ڕاست و دروستە و هەر بیروباوەڕ و ڕێچکەیەکی دیکە خوار و خێچ و ناتەواوە

چۆنیەتی دەلالەت کردنی ئەو ئایەتە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە ئاوایە:

پەروەردگار ئیسلامی شوبهاندوە بە ڕێ و بانێکی ڕاست و بێ گرێ و قۆرت، جا هەروەك چۆن کۆی : ٢+٢ دەکاتە (٤) و هەر ژمارەیەکی تر غەیری (٤) دابنێین هەڵەیە . ئەو بەرنامەیەش کە دەبێتە هۆی بەختەوەریی ئینسان لە دنیادا و سەرفرازی لە پاشەڕۆژدا تەنیا ئەو ڕێبازەیە کە لەگەڵ سروشت و واقیعی مرۆڤایەتی دا دەگونجێ ئەویش تەنیا ئیسلامە، چونکە تەنیا ئیسلام بەرنامە و پەیڕەوی خوایە (ان الدين عندالله الاسلام) ، هەڵبەتە هەر خواش ئاگا و شارەزایە بە سروشتی ئینسان چونکە بەدی هێنراوی خۆیەتی بەڵام غەیری خوا یان هاوتای مرۆڤە کە باقی ئینسانەکانن، یان کەمترە لە مرۆڤ کە ئاژەڵ و ڕووەك و ماددەی ڕەق و تەقە.

بێ گومان ئێمە لێرەدا مەودامان نیە یەك یەکی ڕێچکە و بیردۆزە دەسکردەکان بدەینە بەر نشتەری توێژینەوە و یەکالا کردنەوە، چونکە ئەم نوسراوە بۆو مەبەستە تەرخان نەکراوە[١]، بەڵام لێرەدا دوو کاران ئەنجام دەدەین:

(١) لە نووسراوەکانی تردا هەر کام لە مارکسیزم و فرۆیدیزم و داروینیزم و ئەگزیستانسیالیزم بە کورتی دراونە بەر نشتەری تاوتوێ کردنەوە و ڕەخنەیان لێ گیراوە بۆ وێنە سەیری ئەڵقەی (یەکەم و دووەم و سێیەم) زنجیرەی (دەمەتەقێ ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) بکە.



Scanned by CamScanner

نەدەکەوتن، دەست و دەم و چاوو لاقی خۆیان دەشت و بە گەردن کەچی نوێژیان دەکرد.

پێنجەم:

(عمر بن الخطاب) بۆ شارەکانی (شام) هەواڵی نارد کە ناوی هەر کام لە کوێر و بێ دەست و پێ و شەپلە لێ دراوو پیر و کەنەفت لە (دیوان)دا بنووسرێ و هەر کوێرێك ئینسانێکی بۆ تەرخان بکرێ بۆ دەست ڕاکێشانی و هەر بەدوو پیر خزمەت چییەکیان بۆ دابنرێ ، وە فەرمانیدا کە ناوی هەموو هەتیوێکی بۆ بنووسن، وە ژیانی ئەو ئافرەتە هەژارانەی (تأمین) کرد کە مێردیان نەکردوە و بێ سەرپەرشتی کەرن، وە چێشتخانەیەکی دروست کرد بۆ هەژار و نەدار و ڕێبواران !!

شەشەم:

(عمر بن عبدالعزیز) نامەی نارد بۆ (والی) یەکەی لە (مصر) گوتی: بیستوومە لە (مصر) کۆمەڵە حوشترێکی بارهەڵگر هەن و هەر حوشترێك (١٠٠٠) (رطل) ی لێ بار دەکرێ، جا ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەیشت نەبیستمەوە هیچ حوشترێك لە (٤٠٠) (رطل) زیاتری لێ بنرێ !!

حەوتەم:

(یونس بن عبید) چەند کاڵا و بەرگێکی جۆ جۆری لە کن بوون، هێندێکیان نرخیان (٤٠٠) درەم بوو، هەندێکیشیان (٢٠٠) درەم ، ڕۆژێکی بۆ خۆی چوو بۆ نوێژێ و برازاکەی لە دوکانێ دانا، دەشتەکی یەك هات یەکێك لەو دەستە جلانەی سەوداکرد کە (٤٠٠) بایی بوون، بەڵام



Scanned by CamScanner

برازاکەی یەکێکی (٢٠٠) بایی نیشان دا و ئەویش پێی قایل بوو کڕی، کابرای دەشتەکی دەستە جلەکەی بە دەستەوە گرت و ڕۆیی، (یونس) لە ڕێیە تووشی بوو و دەستە جلەکەی ناسی‌یەوە و لێی پرسی بە چەندت کڕی؟ گوتی بە (٤٠٠) درەم، یونس گوتی: تەنیا (٢٠٠) ی دێنێ بڕۆ بیدەوە بە خاوەنەکەی ، دەشتەکی‌یەکە گوتی ئەوە لە کن ئێمە (٥٠٠)یش دەکات: (یونس) گوتی بڕۆ بیدەوە چونکە ئامۆژگاری موسڵمانان چاکترە لە دنیاو لەوەی تێی‌دایە!! دوایی ناردیەوە بۆ دوکانەکەی و (٢٠٠) درەمەکەی دایەوە، وە لەگەڵ برازاکەی بوو بە دمە قاڵی‌یان و پێی گوت ئەوە بۆ شەرمت نەکرد؟ بۆ لە خوای نەترسای؟! نیوە لە نیوە قازانج بکەی؟ گوتی: من کە پێم فرۆت ئەو ڕازی بوو! ئەویش گوتی: بریا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ ویشت پێ خۆش بایە !!

**هەشتەم:**

(وفد)ی (بنی تميم) هاتە کن (عمر بن الخطاب) کە دە نێو واندا گەورەکەیان (احنف بن قيس) هەبوو کە ئەگەر تووڕە بووبا (١٠٠,٠٠٠) شمشێر بۆی تووڕە دەبوو بێ وەی بپرسن بۆچی تووڕە بووی، تەماشایان کرد (عمر) حوشتری زەکاتێ دەرمان دەکات بە (قەتران)، (عمر) گوتی: وەرە (احنف) جلەکانت دانێ و ئەو حوشترانەم لەگەڵ دەرمان کە چونکە هەقی هەتیوو هەژار و بێوەژنان و ڕێبوارانی تێدایە، پیاوێك گوتی: ئەی گەورەی موسڵمانان کۆیلەیەك ڕاسپێرە ئەو ئیشەتان لەباتی بکات (عمر) گوتی: دایکت سینگت بۆ بکوتێ، جا کێ لە من و لە (احنف) کۆیلە ترە؟ هەر کەسێك ئیشی موسڵمانان بە ئەستۆوە گرێ کۆیلەی موسڵمانانە !!



Scanned by CamScanner

## چـواردەم :

(عبدالملك بن مروان) لە دەمی حەج دا ئەمری دەکرد بانگەواز بکـرێ کە هیچ کەس فتوا نەدات بێجگە لە (عطاء بـن ربـاح) پێـشەوا و زانـای خەڵکی مەککە.

بەڵام دەزانن ئەو (عطاء) چۆن بووە ؟!

ڕەش و یەك چاوو کونە لووت فش و شەل و پرچ لوول و شەپلە لێـدرا و بووە لە کاتێك دا لە جوغزی دەرس گوتنەوەیدا دادەنیشت لە نێو هەزاران لە قوتابیانیدا وەك قەڵە ڕەشەیەکی هەڵنیشتوو لە کێڵگەی لۆکەدا خـۆی دەنواند!!

## پـازدەم :

تەنیا لە یـەك کتێبخانـەدا لـە (انـدلس) (٦٠٠,٠٠٠) بـەرگ کتێـب هەبووە کە تەنیا لیستەی ناوەکانیان (٤٤) بەرگ بووە.

وە لە (اندلس) دا (٧٠) کتێبخانەی گشتی هەبووە بێجگە لە کتێبخانە تایبەتی یەکان[1].

## شـازدەم :

(ابو بکر الصدیق) بەر لە هەڵبژێررانی بە خەلیفە چەند بێوەژنێك کـە مێردەکانیان لە ڕێی خوادا شەهید کرابوون و چەند هەتیوێك کـە بابیـان نەمابوو لە ژێر باڵیدا حەوابوونەوە و بۆ هێندێکیان شیری دەدۆشـی و بـۆ هەندێکیشیان چێشتی لێ دەنا.

(١) ئەو پازدە تابلۆیەم لە کتێبی (روائع اسلامیة) ی ابراهیم نعمە وەرگرتوە.



Scanned by CamScanner

ئینجا کاتێك بوو بە خەلیفە بیستی‌یەوە کە بێوەژنەکان خەفەتیان خواردوە چونکە لەمەودوا لەو خزمەتە گەورەیە بێ بەش دەبن کە ئەو پیاوە باشە پێش کەشیانی دەکرد، بەڵام بەهەڵەدا چووبوون.

ڕۆژێکی لە یەکێك لە دەرگاکانی دا و کچۆڵێك بە پەلە دەرگاکەی کردەوە و دەسبەجێ قیژاندی : ئەوە شیردۆشەکەیە هۆی دایە !!

دایکەکەش کە دێت دەبینێ لەگەڵ خەلیفەی گەورەدا ڕوو بە ڕوو دەبێت، بەشەرمەوە بە کچۆڵەکەی دەڵێت:

بابان وێران بۆ ناڵێی خەلیفەی پێغەمبەری خوا؟!

ئەبو بەکریش سەر نەوی دەکا و لەبەرخۆیەوە چەند قسەیەکی دەکات.

ڕەنگە گوتبێتی: لێی گەڕێ، بە خۆشەویست ترین ڕەفتارم وەسفی کردوم، ئینجا شیردۆشەکە وەك جاران‌دەست دەکاتەوە بە پیشەکەی خۆی و دەست دەکات بە شیر دۆشین بۆ بێوە ژنان و هەویر شێلان بۆ هەتیوان !![1].

حەڤدەهەم:

لە سەردەمی خەلیفایەتی (عمر بن الخطاب) دا (محمد)ی کوڕی (عمرو بن العاص) کە هاوڕێی پێغەمبەر و والی (میسر) بووە، قەمچی لە کوڕێکی هەژار دەدات چونکە لە ڕمبازێن دا ئەسپی وی وەپێش ئەسپەکەی کەوتۆتەوە و پێی دەڵێت بیگرە لە دەستی باب گەوران (ابن الاکرمین) ! کوڕەش دەچێتە شکات بۆ لای (عمر) !

---

(١) سەیری (خلفاء الرسول) ی خالد محمد خالد بکە لاپەڕە (١٣٢، ١٣٣) چاپی دووەم.

سەربانی کۆشکەکانی ئەوروپا پڕ بوون لە کونی لوولە سۆبان، بەلام کۆشکەکانی (قرطبة) بە نەخش و نیگار ڕازێنرابوونەوە ! وە ئاغا و زلە زلەکانی ئەوروپا ئیمزای خۆیان نەدەزانی بەلام مندالانی (قرطبة) دەچوونە قوتابخانان[1].

سێیەم: (الکس لوزان) فەیلەسووفی فەرەنسایی دەڵێت:

(هیچ کتێبێك نیە کە بیردۆزە زانیارییەکانی تێدا بن، هەتا ئەگەر بیردۆزە ڕیازییەکانیش بن، زانیاری بەشێکیان لێ وەدرۆ نەخاتەوە، تەنانەت ئەو کتێبانەش کە لە سەدەی بیستەم دا نوسراون، بێجگە لە قورئانی بەخشندە !![2].

چوارەم: (ڤۆلتێر) مێژووزانی فەرەنسایی دەڵێت:

هەوەڵ کات ژمێر کە لە ئەوروپا ناسرا ئەوە بوو کە (هارون الرشید) بۆ (شارلمان) پاشای فەرەنسای نارد لە ساڵی (٨٠٧)ز، بێگومان لەو دەمیدا زۆر سەرسووڕهێنەر بوو، تەنانەت دانیشتووانی کۆڕی پاشا تێیدا گێژ بوو بوون.

پێنجەم: (برتراندراسل)ی فەیلەسوف دەڵێت:

.. بەڵکو لەوڕۆژەیدا کە ئەوروپا لە بنی نەفامیدا دەژیا، زانیارییە جۆر بە جۆرەکان، فەلسەفە، هونەرە جوانەکانی شیعر لە چین و لە وڵاتە ئیسلامییەکان دا لاقیان چەقاندبوو !

ئەوروپاییەکان بە بێ شەرمییەکی تەواوەوە ئەو چاخە بە چاخی تاریك دادەنێن، لەگەڵ ئەوەش دا تاریکی تەنیا ئەوروپای گرتبۆوە، ڕاست

---

(١) سەیری کتێبی (روائع اسلامیة) بکە لاپەرە (٥٢).

(٢) (اعترافات دانشمندان بزرگ جهان) لاپەرە (١٠٢، ١٠٣).



Scanned by CamScanner

تر بلێین : ئەورووپای مەسیحی چونکە (اسپانیا) اندلس کە لە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان دا بوو، خاوەنی شارستانەتی و ڕۆشنبیری یەکی فراوان بوو[1].

شەشەم: ڕۆجیە گارودی فەیلەسووفی مارکسی فەڕەنسایی کە ماوەیەك لەمەوبەر بە شێوەیەکی ڕەسمی موسڵمانەتی خۆی خستە ڕوو، پاش ئەوەی هەر کام لە ڕژێمی سەرمایەداری و ڕژێمی مارکسیزمی دەداتە بەر نشتەری ڕەخنە و هەڵسەنگاندن و دەری دەخات کە شتاقیان ئەوەیان لە باران دا نیە بەختیاری و کامەرانی بۆ ئینسانەتی وەدەست بێنن چونکە تەنیا پشت بە بەرهەمی ماددی و تەکنۆلۆجیا دەبەستن و ئاوڕ وەلایەنی گیانی و ڕەوشت و ئەخلاق نادەن، دەڵێت:

"...لە شارستانەتی ئیسلامیدا ئەو لێك پچڕاندنە و ئەو پارچە پارچە کردنە ڕووی نەدا، لە ئیسلام دا زانیاری پەیوەستە بە دینەوە و کردەوە پەیوەستە بە باوەڕەوە، فەلسەفە لە پێغەمبەرایەتی سەرچاوەی گرتوە و پێغەمبەرایەتی بە ژیری یەوە بەستراوەتەوە، زەوی لە ئاسمانەوە دوور نیە و ئاسمان بە زەوی یەوە نووساوە، پێش کەوتنی شارستانەتیش بەرەو خوا دەڕوات...ئەم یەکتایی یە لە چەمکی شارستانەتی و لە چەمکی کۆمەڵگادا، دنیای پەرتەوازە و لێك پچڕێنراوی ئەمڕۆ زۆری حەوجێیە...ئەوەش بوو کە کەمەند کێشی کردم بەرەو تێڕوانینێکی ئیسلامی یانە لە بوونەوەر[2].

---

(1) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (58).
(2) سەیری گۆڤاری (الدوحة) بکە ژمارە (84)ی ساڵی (1982) لاپەڕە (13).

گیروگرفتی ولاّتە ئیسلامی یەکان ئەوە نیە کە لە ئاینی ئیسلامدا هۆیەکانی پێش کەوتن چەنگ ناکەون، بەلکو مەسەلە نەبوونی ئیرادە و ویستی پێویستە بۆ سوود وەرگرتن لەو هۆو ئامرازانە.

ئەمن بە تەواوی واقیع بینی یەوە دەزانم کە شەریعەتی ئیسلام هەموو بنچینە و بنەرەتە پێویستەکانی تێدان بۆ بەرەو پێش چوون و فراژوو بوونی ئینسانەتی)[1].

خوێنەی ئازیز!

ئەوەچەند دان پێدا هێنانێکی زانا وشارەزایە بێگانەکان بوون بە گەورەیی و بێ هاوتایی بەرنامەی خوا _ ڕێبازی ئیسلام_ دا، هەڵبەتە ئێمە ئامانەوێ لێرەدا بە هێنانەوەی دان پێدانانی ئەو زانایانە ڕاستی و تەواویەتی ئیسلام بچەسپێنین، چونکە ئیسلام پێویستی بە شایەتی دانی کەس ناکا و وەك زێڕی سوور وایە زێڕی سووریش کورد گوتەنی: لە ئاوری ناترسێ. بەلکو مەبەستمان لێرەدا ئەوە بوو کە دەری خەین:

قسەی ناحەزانی ساویلکە و لە دنیا بێ خەبەری ئیسلام سەبارەت بە دژایەتی نێوان ئیسلام و زانیاری و پێش کەوتن و ... هتد فرێ بەسەر ڕاستی یەوە نیە و دەعوایەکی بێ شایەدە.

ئێستاش خوێنەری خۆشەویست! لەمە زیاتر ناتوانین چیدی وە دوای گەوهەری دوومم بکەوین و ڕوونی کەینەوە کە بێجگە لە ئیسلام گشت بیردۆزەو ڕێنچکەکان قەلب و ناتەواوو کەم و کەسرن و ناچارین پەردە لەسەر گەوهەرێکی دیکەی ئەم نایەتە مەزنە هەلدەدەینەوە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (١٣٦).



Scanned by CamScanner

## گەوهەری سێیەم

## بۆچی ئیسلامەتی بە ﴿ الصراط المستقیم ﴾ ناو براوە ؟!

خوای گەورە و کاربەجێ لە کۆتایی سوورەتی (التکویر)دا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ (٢٧) لِمَنْ شَاءَ مِنكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ (٢٨)﴾ واتە: ئەم قورئانە بێجگە لە ئامۆژگاری بۆ گشت مرۆڤایەتی چی تر نیە، بۆ هەر کامێکتان بیەوێ ڕاست بێ.

بەڵێ ئیسلام بۆیە ناوبراوە بە ڕێی ڕاست چونکە بەرنامە و ڕێبازێکە لەگەڵ سروشت و ماهیەتی ئینسان دا پێکەڵ پێکە و بەرنامەو ڕێبازێکە داوا لە ئینسان دەکات کە ڕاست بێت.

١) ڕاست بێت بەرامبەر بە پەروەردگاری و بەندایەتی و فەرمانبەری بۆ بکات.

٢) ڕاست بێت بەرامبەر بە پێغەمبەر و ﷺ بە گوێرەی ڕێنموونی و ڕێ و شوێنەکەی بەڕێوە بچێ و بیکاتە نموونە و پێشەوای بەرزی خۆی لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا.

٣) ڕاست بێت بەرامبەر بە کۆمەڵی موسڵمانان و ڕێزیان لێ بگرێ و بەزەیی بەرامبەریان پێشان داو زەرەر و قازانجیان بەهی خۆی بزانێ و خەمخۆر و مشوور خۆریان بێت.

٤) ڕاست بێت بەرامبەر بە ناحەزانی ئیسلام و موسڵمانان و سەری بەرزی ئیسلامی‌یانەی بە هیچ کلۆجێك نەوی نەکات لە ئاقاریان دا و لە ژێر باری دوژمنایەتی و هەوڵ و تەقەللای دژ بە خوا و خەڵکیان دا هەرگیز پشتی نەچەمێ و دوولا نەبێتەوە.



Scanned by CamScanner

٥) ڕاست بێت بەرامبەربە ناز و نیعمەتەکانی ژیان ولە بەرژەوەندی خۆی و خەڵکی و ڕەزامەندی خوادا بەکاریان بێنێ و سوودیان لێ وەرگرێ، نەك خۆشی و لەزەتەکانی ژیان بکاتە بتێك و کڕنووشی بەندایەتی بۆ بەرێ و لەبەر تێر کردنی غەریزە و ئارەزووە شەخسی‌یەکانی ئاگای لـە خـوا و خەڵك ببڕێ.

٦) ڕاست بێت بەرامبەر بە بوونەوەر و بزانێت کە پەنجەی نیگار کێشی خوا نیگاری کێشاوەو هەر گەردیلە و مۆلەکۆل و[1] خانە و دارویەرد و تەڕو ئیشك و ئەستێرە و خڕۆکە و ڕووبار و دەریا و گـرد و نـشێو و ئـاگر و باو... هتدێکی بە زانستی بێ سنووری خوا خوڵقاوە و سۆز و بەزەیی و کاربەجێ‌یی و توانا و ئیرادەی خوا سەرپەرشتی دەکا و بەڕێوەی دەبات.

٧) ڕاست بێت لەگەڵ خەڵکی دەوروبەری دا بـە دەر و دراوسـێ و مـاڵ و منداڵ و دایك و باب و خـزم و خزێـشەوە و ئـەرکی سەرشـانی خـۆی بەرامبەر بەهەر کامێکیان بزانێ و جێبەجێی بکات.

٨) وە ڕاست بێت لەگەڵ نەفسی خۆی‌دا و نەیەڵێ هێـزی شـەیتان و دار و دەستەکەی بە پەردەی ڕەشی تاوان و سەرپێچی و بە ژەنگ و ژاری دوور لە خوایی دای بپۆشێ و کـون بـڕی بکـات و تروسـکایی ئیمـانی تێـدا بکوژێنێتەوە.

٩) لە کۆتـایی‌دا ڕاسـت بێـت لەگـەڵ ڕێبـاز و بەرنامەکـەی‌دا و تـا دوا هەناسەی ژیان و دوا تنۆکی خوێنی گەشی لە پێنـاوی دا سـەرگەرمی هەوڵ و کۆشش و رەنج دان بێ.

---

(١) مۆلەکۆل، واتە: گەرد (الجزیء).



Scanned by CamScanner

بەڵێ بۆیە خوا ناوی لە ئیسلام ناوە ﴿الصراط المستقيم﴾ چونکە هەڵوێستێکی ڕاستە لە ئاقار خوا و بوونەوەر و خەڵك و ژیان دا، ئەو کەسەش کە بە پێی وی بەڕێوە دەچێ هەڵوێستێکی بیری و کردەوەیی ڕاستی دەبێت لە ڕاست خوا و بوونەوەر و خەڵك و ژیان دا.

بەڵێ ئینسانی موسڵمان لە باتی بێ ئەمەکی و سپڵەیی و پێ نەزانی لە ئاقار خوادا سوپاس و ستایش و بەندایەتی و ڕێز و فەرمانبەری پیشان دەدات.

وە لە باتی گەڕاندنەوەی خوڵقانی بوونەوەر بۆ چەند وشەیەکی داتاشراوی بێ ئێوی وەك ڕێکەوت و سروشت و ئەزەلیەتی ماددە، دان بە پەروەردگاری زانا و توانا و کاربەجێ و بە بەزەیی‌دا دێنێ.

وە لە باتی خۆپەرستی و خەڵك نەویستی و زیان گەیاندنی بە خەڵك، خۆنەویستی و خەڵك دۆستی و سوود گەیاندن بە خەڵك هەڵدەبژێرێ.

وە لە باتی پەرستنی ژیانی دنیا و بە هیچ سەیر کردنی ژیانی دوا ڕۆژ، دنیا بە وەسیلە و جێی تاقی کردنەوە حسێب دەکا و ژیانی نەبڕاوەی دواڕۆژ و ڕەزامەندی خوا دەکاتە ئامانج و لوتکەی هیوا و ئاواتی.

وە لە باتی ئەوەی تەنیا لە گۆشە نیگایەکی تەسکەوە سەیری ئینسان بکا و بی نرخێنێ وەك مارکسیزم کە ژیانی ئینسانی دەگەڕێنێتەوە بۆ تاقە عامیلێك کە ئەویش ئابووری‌یە، بە واتایەکی دی ئینسان لە گۆشە نیگای گەدە (معدة) یەوە هەڵدەسەنگێنێ و داروینیسم کە ئینسان بە ئاژەڵێکی ڕووت سەیر دەکا و لەگەڵ کارو گایان دا حەشری دەکا و ، فرۆیدیسم کە ئینسان لە چلێتاوی جینس هەڵدەکێشێ و جگە لە پاڵنەری جینس هیچ شتێکی تر لە ئینسان دا نابینێ و (اگزیستانسیالیزم) (بوێتی) کە تەنیا بڕوای بە تاك هەیە و (دورکایم) کە بە پێچەوانەی سارتەری (وجودی)یەوە تەنیا بڕوای بە کۆمەڵ



Scanned by CamScanner

هەیە و نیتشەی ئەڵمانی کە جگە لە کوتەك و هێــز بــڕوای بــە هیــچــی دی نیــە و... هتد.

بەڵێ ئیسلام لە جیاتی ئەو تێڕوانینە لاسەنگ و لاتەڵانە بــە شــێوەیەکی هەمە لایەنە سەیری ئینسان دەکا و لەیــەك کــات دا دان دێنـــێ بەلایــەنی گیانی و مەعنەوی ئینسان دا و بە لایەنی ئابووریشی و بە لایــەنی جینســی شی و بەلایەنی ئاژەڵیشی و بەلایەنی کۆمەڵایەتیشی و بەلایــەنی تاکیــشی دا بێ ئەوەی هیچیان لەسەر حیسابی هیچیان دابنێت.

ئیسلام دەڵێت: ئینسان کائینێکی ئاڵۆز و پڕ وردەکاری‌یــەوە و هــەر لــە لایەنێك و دوان پێك نەهاتوە و ناشتوانرێ تەنیا لە گۆشەنیگای لایەنێکی‌یەوە بنرخێنرێ، بەڵکو تەفسیر کردنی ئینسان تێروانینێکی گشتی و هەمە لایەنەی گەرەکە، ئەو جۆرە تێڕوانینەش بێجگە لە خوای ئینسان لە ژێر ڕکێفی کەس دا نیە.

کەواتە بێجگە لە ئیسلام لەهیچ بەرنامــە و مەکتــەبێکی تــردا نــاتوانرێ هەڵوێستێکی ئینسانانە لە ئاقار ئینسان دا پێشان بدرێ.

هەڵبەتە کەسێکیش ئاوا بە پێی بەرنامەی خوا بژیەت ژیانێکی ڕاســت و دروست و بێ قــۆرت و گــرێ دەژیــەت و جــووڵان و بــزووتنی لەگــەڵ ڕێــڕەوی سروشتی خۆی و بوونەوەردا ڕێك دەکەوێ.



Scanned by CamScanner

# چەند ڕازێکی سەرنج ڕاکێش لەم ئایەتە مەزنەدا

## ڕازی یەکەم: لەبەکارهێنانی وشەی (الصراط)دا شێرراوەتەوە:

وشەی (صراط)یانی ڕێی پێدا ڕۆیشتن، پەروەردگار بۆیە بەرنامەی ئیسلامی وە (ڕێ)یە چواندووە تا بزانین کە هەروەك چۆن مرۆڤ ناتوانێ بە بیروباوەڕ یان بە قسەی ڕووت بە (ڕێ)یەدا بڕوات بەڵكو پێویستی بە هەوڵ و تەقەللا وتێكۆشانێكی جەستەیی و كردەوەیی دەكات، بەهەمان پێ و دانیش پابەندی بە بەرنامە و پەیڕەوی خواوە بە بیروباوەڕ و قسەی بەتەنێ نایەتە دی و ئارەق ڕشتن و ڕەكارخستنی ئەندامەكانی گەرەكە.

بەڵێ بۆ وەی ئینسان بتوانێ ڕێی خواپەرستی بگرێتە پێش پێویستی بە ڕەكارخستنی هەموو توانا و وزەیەكی ژیری و عاتیفی و جەستەیی هەیە، پێویستە بە هەموو كیانی بەسەری‌دا بڕوات هەروەك چۆن كە بە (ڕێ) یەك دا دەڕوات بە هەموو كیانی پێی‌دا دەڕوات.

## ڕازی دووەم: لە وشەی (مستقیم)دا شێرراوەتەوە:

چونكە هەروەك چۆن ئەگەر بتەوێ (ڕێ) یەكی ڕاست درێژ بكەیەوە و قۆرت و پێچانی پێ نەكەی ناچار دەبێ سەدان ئاستەنگ و كۆسپ و دۆڵ و شیوان ببڕی بە هەمان شێوەش ئەگەر بتەوێ ڕێگای ژیانت بە بێ قۆرت و قولاپ و فیسق و گرێ ببڕێ ـ كە بریتی‌یە لە خواپەرستی و موسڵمانەتی ـ ناچاری سەدان گیروگرفت و كەند و كۆسپ ببڕی و لەگەڵ سەدان كوێرەوەری و دەردە سەری و كێشە و بەرەدا ڕوو بەڕوو بێ، بەڵێ مادام بتەوێ پابەندی



Scanned by CamScanner

بەرنامەی خوا بی و لـێی لانەدەی ناچاری سەدان کەرەت لەگـەڵ بەرژەوەنـدی شەخسی و هەوا و نـەفس و شـەیتان و دوژمـن و ناحـەزانی خـوا و خـەڵك و ناهەمواری و دەردەسەری دا بە شەڕ بێی و تێك هەڵپرژێن.

## سێیەم ڕاز لە بەکارهێنانی وشەی (اهدنا)دا حەشار دراوە:

چونکە بە ڕواڵەت نابێ موسڵمان بڵێ (اهـدنا) (ڕێنمـایی‌مـان بکـە) لـە سۆنگەی ئەوەوە کە موسڵمان بە کەسێك دەگـوترێ کـە ڕێنمـایی کردنـی بـۆ هاتبێتە دی، کەواتە، بە بەکارهێنانی (اهدنا) (تحـصیل الحاصـل) دێتـە دی، بەڵام ئەگەر قووڵتر لە ئایەتەکە ورد بینەوە دەزانین کە چ (تحصیل الحاصل) لـە گۆڕێدا نین و وشەکە پڕ بە پێستی ئەو شوێنەیە کە تێیدا بەکارهاتوە، چونکە ژیانی ئینسان بریتی‌یە لە کۆمەڵێك هەڵوێست، ئینسان لـە مـاوەی ژیـانی‌دا لەهەر ڕۆژ و ساتێك دا چەند جار تووشی ڕووداوی جـۆراو جـۆر دەبـێ و هـەر ڕووداوەش هەڵوێستێکی تایبەتی گەرەکە، ئەمما دیتنەوەی هەڵوێستی ڕاست لە نێو کۆمەڵـە هەڵوێـستێکی هەڵـەدا شـتێکی ئەسـتەم و دژوارە لەبـەر ئـەوە پێویستە مرۆڤ لە هەر ڕۆژێك دا چەند جار داوا لە خـوای گـەورە بکـات کـە ڕێنمایی بکات.

جا خوا ڕێنمایی هەموامان بکات لە هەموو هەڵس و کـەوت و بـزووتن و جم و جۆڵێکی ژیانمان دا ، ڕێنمایی‌یەك کە ببێتە هۆی هێنانـە دی ژیـانێکی موسڵمانانەی خۆش و بەلەزەت لـە دنیـادا و هێنانـە دی ڕەزامەنـدی (الله) و بەهەشتی بەرین لە پاشەڕۆژدا، جا ئەی خوایە ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾.

ئەلێرەش دا کۆتایی بە تێوەڕامانمان دێنین لە دەریای دەوڵەمەندی ئایەتی شەشەمین دا و دەچینە خزمەت ئایەتی حەوتەم و کۆتایی.



Scanned by CamScanner

# تەفسیری ئایەتی حەوتەم

﴿صراط الذين انعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾ آمين

(ڕێی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ دا کردوون نەک

لێ تووڕە بوان وە نەک گومڕا بوان).

**مانای وشەکان:**

**الذين انعمت عليهم** : ئەوانەی چاکەت لەگەڵدا کردوون و ئیمانت پێ بەخشیون کە بریتین لە پێغەمبەران و صدیقان و شەهیدان و چاکان.

وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾[1] یانی: هەر کەس فەرمانبەرتی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات ئەوانە لەگەڵ کەسانێك دان کە خوا چاکەی لەگەڵ دا کردوون ، لە پێغەمبەران و سیددیقان و شەهیدان و چاکان ئەوانەش چاکترین هاوەڵ و برادەرن.

جا ئێستا بۆ خاتری وەی چاکتر مانای ﴿الذين انعمت عليهم﴾ بزانین وا باشە لە هەرکام لەو چوار دەستەیە ورد بینەوە:

١) النبيين: پێغەمبەران (عليه الصلاة و السلام) : کەسانێکن خوای کاربەجێ هەڵی بژاردوون و کردوونی بە ڕێنمایی کەری خەڵکی بۆ ڕێبازی خوا.

(١) النساء : ٦٩ .

٢) الصديقين: (راغب الاصفهاني)[١] دەڵێت: (صديقون) تاقمێكن بڕێك دەبەر پێغەمبەران دان.. وە (صدِّيق) بابایەكە زۆرڕاستی لێ دەردەكەوێ، وە گوتراوە بە كەسێك دەگوترێ (صديق) كە قەت درۆی بەزاریدا نەیەت، وە گوتراوە بە كەسێك دەگوترێ كە نەتوانێ درۆ بكات لەبەر خووگرتنی بە ڕاستگۆیی یەوە،وە گوتراوە بە كەسێك دەگوترێ كە قسەو نێو دەروونی وەك یەك بن و بە كردەوە ڕاستی خۆی بسەلمێنێ.

٣) الشهداء: دیسان (راغب) دەڵێت: شەهید ئەو كەسەیە كە خەریكی گیانەڵایە (هەڵبەتە لە ڕێی خوادا)[٢] بۆیەش وا ناونراوە چونكە فریشتەی دێنە لا، ئاماژەیە بۆو ئایەتە كە دەڵێت : ﴿ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا ﴾[٣] ، یان بۆیە وا ناونراوە كە چونكە لەو دەمەیدا بەهەشتێ بە چاوان دەبینێ[٤].

٤) الصالحين: كۆی (صالح)ە، (صالح)یش دژی (مفسد و فاسد)ە، كەواتە (صالح) ئەو كەسەیە لەهەر كارێكیدا چاكە و خێر و بەرژەوەندی مەردوم ڕەچاو كات.

المغضوب عليهم و لاالضالين: (ابو جعفر الطبري) لە تەفسیرە مەزنەكەیدا لە كاتی تەفسیر كردنی سوورەتی فاتیحەدا لە شەش حەوت ڕێگەوە نەقڵ دەكات كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((المغضوب عليهم: اليهود، الضالين: النصارى)).

---

(١) (معجم مفردات القرآن) راغب الاصفهاني ص(٢٨٥، ٢٨٦).

(٢) ئەوەی نێو دوو كەوانەكەم زیاد كرد چونكە ڕاگەین قسەكە تەواو نابێ.

(٣) فصلت : ٣٠ .

(٤) (معجم مفردات القرآن) راغب الاصفهاني ص(٢٨٦).



Scanned by CamScanner

ئێستاش کە مانای یەك یەکی وشەکانمان زانی با بچینە سەروکاری مانا گشتی فەرموویەتی: ((المغضوب یەکەی:

## گەوهەری یەکەم

ئاشکرایە کە ڕستەی ﴿صراط الذین انعمت علیهم﴾ بریتی (بدل)ە بۆ ڕستەی پێشوو ﴿أهدنا الصراط المستقیم﴾، کەواتە ئەگەر مەسەلەکە بکەینە موعادەلەیەکی ماتماتیکی ئاوای لێ دێ:

الصراط المستقیم = صراط الذین انعمت علیهم.

دەزانی ئەوەش چ دەگەیەنێ خوێنەری ئازیز و بەڕێز ؟!

ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە بەرنامەی خوا ﴿صراط المستقیم﴾ بوونی مەحاڵە بە بێ هەبوونی کۆمەڵی موسڵمان ﴿الذین انعمت علیهم﴾.

بەڵێ ڕێبازی خوا _وەهەر ڕێباز و بەرنامەیەکی تریش _ حەوجێی بە هەبوونی کۆمەڵە ئینسانێك هەیە کە دەبنە بوون و کیانێکی واقیعی و کردەوەیی بەرنامەکە.

ئیسلامەتی بەهیچ کلۆجێك بیروباوەڕ و بەرنامەیەکی تیۆری وبەی ڕووت و قووت نیە و نابێ، بەڵکو ئیسلام بریتیە لەو بیروباوەڕە واقیعی و زیندووەی کە کۆمەڵە ئینسانێك دەبنە تەرجەمەیەکی واقیعی و کردەوەیی بۆی، وە لە هەر کات و جێیەك دا ئیسلام بە شێوەیەکی کرداری ڕەنگ نەداتەوە لە کردەوە و ڕەوشت و خوو و هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی کۆمەڵە ئینسانێك دا، ناتوانین بڵێین لەو کات و شوێنەدا ئیسلام هەیە، هەڵبەتە ئەو جۆرە هەبوونەی ئیسلامیش شتێکی حەتمی و پێویستە لە هەموو چاخێك دا، وەك خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی ((لا تزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق حتى يأتي امر



Scanned by CamScanner

الله..))[1] واتە: بەردەوام تاقمێك لە ئۆممەتم لەسەر هەق دەمێننەوە هەتا ڕۆژی دوایی دێت بە فەرمانی خوا.

## گەوهەری دووەم

زانرا کە ئەو خوا پێداوانەی قورئانی مەزن فەرمانمان پێ دەکات شوێن پێیان هەلگرین پێغەمبەران و صدیقان و شەهیدان و چاکانن.

گومانیشی تێدا نیە کە لە پێش هەموو ئەوانەوە پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ هاوڕێکانی دێن، کەواتە پێویستە لەسەر ئینسانی موسڵمان کە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەت دانێ بۆ پێغەمبەر و هاوڕێکانی چونکە ئەوان پێشەوای مەن و هۆی گەیاندن و بەستنەوەمانن بە خواوە.

جا لێرەدا یاسایەکی فرە بایەخ دار دەسگیر دەبێت ئەویش ئەوەیە کە ئەوانەی تانە و تەشەر و توانج و پلار دەگرنە هاوڕێیانی پێغەمبەرمان و بە خراپە باسیان دەکەن، ئەوانە تاوانێکی یەکجار گەورە لە دەفتەری کردوەکانیادا تۆمار دەکەن.

موسڵمان دەبێ موسڵمانانی برا و خوشکی دڵنیا بن لە دەست و زمانی وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمورویەتی : ((المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده))[2]، جا بە تایبەتی کە ئەو موسڵمانانە هاوەڵ و برادەری پێغەمبەری پێشەوا و بناغە دارێژی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی بوو بن.

جا خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت یان گێڕی لەوانەی دەکەونە شوێن هاوەڵ و یارانی پێغەمبەر و بە زمانی حاڵ و گوتار ڕێز و حورمەتیان دەپارێزن. ئامین.

---

(١) مسلم ڕیوایەتی کردوە.

(٢) (بخاری) و (مسلم) ڕیوایەتیان کردوە.



Scanned by CamScanner

## گەوهەری سێیەم

مەبەست لە وشەی (أنعمت) لەم ئایەتەدا نیعمەتی موسڵمانەتی و بڕوا دارێتی یە، واتە هەرچەند بە ڕواڵەت وشەی نیعمەت چەمکێکی گشتی هەیە و هەموو ناز و نیعمەتێک دەگرێتەوە بەڵام لێرەدا تایبەتە بە نیعمەتی موسڵمانەتی یەوە، چونکە ﴿الذين انعمت عليهم﴾ لەگەڵ ﴿غير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾دا ڕوو بە ڕوو دەبێت، جا ئەگەر بێت و وشەی نیعمەت بە ناز و نیعمەتی ماددی لێك بدەینەوە ناچارین ﴿ المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾یش بەو کەسانە لێك بدەینەوە کە لە بەهرە و نیعمەتەکانی خوا بێ بەشن بێگومان ئەم مانایەش لێرەدا ناگونجێ، چونکە خوای کاربەجێ لە سوورەتی (فجر)دا فەرموویەتی: ﴿ فأما الانسان اذا ما ابتلاه ربّه فاكرمه ونعمه فيقول رب اكرمني، واما اذا ابتلاه فقدر عليه رزقه فيقول رب اهانني، كلا... ﴾[1].

لێرەدا دەبینین کە خوای مەزن ئینکاری ئەوە دەکات کە پێ بەخشینی دارایی و نیعمەتی دنیایی بەڵگەی ڕەزامەندی خوا بێت لە بابای پێ بەخشراو، وە کەم کردنەوەی ڕۆزی نیشانەی نارەزامەندی بێت و دەڵێت نەخێر وا نیە.

## گەوهەری چوارەم

بێگومان کەسێك وەبەر دەستەی ﴿الذين انعمت عليهم﴾ بکەوێ تازە مەحالە بچێتە بیزی ﴿المغضوب عليهم ولا الضالين﴾ بەڵام بە هۆی باسکرانی ئەو دوو تاقمە لێرەدا چەند شتێکە:

---

(١) فجر ١٦، ١٧ .



Scanned by CamScanner

١) ئیمان و بڕوای ئینسان تەواو نابێ هەتا ئومێد و مەترسی هەردووك تێدا نەیەنەدی، ئومێد و هیوای گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی بەرین، وە مەترسی سزای خوا و چوونە دۆزەخ.

بۆیە پێویست بوو بابای موسڵمان وێڕای باسکرانی پێڕی بەهەشتیان لە لای، هەواڵی پێڕی دۆزەخیانیشی بکەوێتە بەر گوێ بۆ خاتری وەی لە باتی تاقە پاڵنەرێك دوو پاڵنەر پاڵی پێوە نێن، پاڵنەری بە هەویا بوونی بەهەشتێ و گەیین بە ڕەزامەندی خوا، وە پاڵنەری ترسان لە جەهەندەمێ و ڕزگار بوون لە قەهر و سزای خوا.

بەڵێ ئینسان پێویستە بە دوو باڵی ترس و هیوا (الخوف و الرجاء) بەرەو خوا بکەوێتە ڕێ.

٢) مرۆڤی موسڵمان پێویستە وێڕای هەبوونی خۆشەویستی بەرامبەر بە پێڕی خواپەرستان و بڕواداران بوغزاندن و ڕق و قینیش شك بەرێ سەبارەت بە پێڕی خوا نەناسان و بێ باوەڕان، بۆیە پەروەردگار لە وەسفی هاوڕێیانی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: ﴿اشداء على الكفار رحماء بينهم﴾[1] یانی: لە ئاقار کافر و خوانەناسان دا توند و تیژن و لە نێو خۆشیان دا میهرەبان و بە بەزەیین.

٣) ئینسانی بڕوادار پێویستە هەروەك چۆن تاقمی خواپەرستان دەناسێ و دەزانێ کێن و مەبەستیان چیە پێویستە تاقمی ناحەزانیشی بناسێ و سەروبەریان لێك بکاتەوە.

---

(١) الفتح : ٢٩ .



Scanned by CamScanner

# گەوهەری پێنجەم

**ڕاز و نهێنی باسکرانی پێڕی بڕواداران بە یەک سیفەت و باسکرانی تاقمی دوور لە خوایان بە دوو سیفەت چییە؟**

بۆ ئەو پرسیارە دەتوانین دوو وەڵامان بخەینە ڕوو:

یەکەم: خوای بێ هاوتا دەمەوێ تێمان بگەیەنێ کە هەق یەکێکە و جۆراوجۆر نیە، بەڵام ناهەق (باطل) بە پێچەوانەوە، وەک لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله...﴾[1] یانی: ئەوە ڕاستە شەقامی منە پێیدا بڕۆن و بە ڕێچکەکاندا مەڕۆن لە ڕێی خوا هەڵەتان دەکەن.

بەڵێ هەق تەنیا یەکێکە ئەویش بەرنامە و پەیڕەوی خوایە و بەس، بەڵام ناهەق زۆرە و زۆر چەشنی هەیە، هۆی ئەو دیاردەیەش ئەوەیە کە سەرچاوەی هەق یەکێکە ، کە خوای باڵا دەست و زانایە، بەڵام سەرچاوەی ناهەق زۆرن، چونکە سەرچاوەی ڕێچکە دەسکردەکان بریتییە لە هەوا و ئارەزوو و بۆچوونی ئینسانەکان، ئاشکراشە هەرئینسانێک هەوا وئارەزوو و بۆچوونێکی تایبەتی وسەربەخۆی هەیە.

دووەم : ئینسانەکان بە شێوەیەکی گشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە.

١) موسڵمانانی ڕێنمایی کراو.

٢) لاڕێ بووانی سەر لێ شێواو.

---

[1] الأنعام : ١٥٣ .



Scanned by CamScanner

لە ئایەتی ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾دا بەشی یەکەمی ئینسانەکان باسکراوە.

لەم ئایەتەش دا بەشی دووەمیان چونکە ﴿المغضوب علیهم﴾ ئەوانەن کە بیروباوەڕێکی ڕاستیان هەیە بەڵام بە پێی ئەو بیروباوەڕە بەڕێوە ناچن وکردەوەو ڕەفتاری ناڕاستیان هەیە.

﴿الضالین﴾ یش ئەوانەن کە ڕێ و ڕەسم و بەرنامەیەکی هەڵەیان هەڵبژاردوە، واتە بیروباوەڕ و ئیدۆلۆژییەکی چەوت و بێ خێریان هەیە، هەڵبەتە کورد گوتەنی: نەکاریتە لە کفری هەڵدەکەوێ وە نە گۆزەی پڕ لە ژەهریش ئاوی لێ دەڕژێ، بابایەکیش بیروباوەڕێکی هەڵە و بێ خێری هەبێ کردار و ڕەفتاری ڕاستی لێ چاوەڕوان ناکرێ[1].

## گەوهەری شەشەم

لە دەمی تەفسیر کردنی وشەکانی ئەم ئایەتەدا گومان (طبري) توێژەوەی بەناوبانگی قورئان لە تەفسیرە مەزنەکەیدا لە شەش حەوت ڕێگەوە نەقڵ دەکات کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((المغضوب علیهم : الیهود، الضالین: النصاری)) .

ئێستا با بزانین ئەم فەرمایشتە چۆن لەگەڵ مانای گشتی ئایەتەکەدا دەسازێ، ..لەهەموان ڕوونە کە ئینسان لە دوو بەشان پێك هاتوە:
یەکەم: گیان (روح) .
دووەم: لەش (مادده).

---

(١) لێرەدا ووشەی ﴿غیر المغضوب علیهم ولا الضالین﴾ بە مانایەکی تر لێك دراونەوە جیا لەوێ پێشوو.



Scanned by CamScanner

مەبەستی بنەڕەتی ئایین ئەوەیە کە هاوئاهەنگی و هاوسەنگی (تعادل) بێنێتە دی لە نێوان گیان و لەش دا، چونکە هەموو جۆرەکانی لەڕێ لادان و سەرگەردانی و گومڕایی دەگەڕێنەوە بۆ تێك چوونی هاوسەنگی نێوان گیان و لەش.

جا لەبەرئەوەی جووەکان چاکترین نوێنەری ئەو ڕێڕەوەن کە هاوسەنگی نێوان ڕووح و مادده دەشێوێنێ لە ئینسان دا بە زیادەڕەوی کردن لە لایەنی ماددیدا لەسەر حیسابی ڕووح خوای زانا باسی کردوون بە وشەی ﴿غیر المغضوب علیهم﴾ .

وە چونکە نەصرانی‌یەکان ڕاست ترین نوێنەری ئەو ڕێڕەوەن کە هاوسەنگی ئینسان تێك دەدات بە زیادەڕەوی کردن لە لایەنی ڕووحی‌دا لەسەر حیسابی لایەنی ماددی، خوای کاربەجێ ئەوانیشی باس کردوە بە ﴿الضالین﴾.

کەواتە ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەم فەرمایشتەدا دەتوانین ئاوا تەفسیری ئەم ئایەتە بکەین:

ئینسانەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

بەشێکیان کە موسڵمانن ئەوانەن کە هاوسەنگی و ڕێك و پێکی‌یان هێناوەتە دی لە نێوان ئەو ڕووح و ماددەیەدا کە لێ‌ی پێك هاتوون.بەشەکەی دیشیان کە ناموسڵمانن ئەوانەن کە هاوئاهەنگی ڕێك و پێکی‌یان تێك داوە لە نێوان لەش و ڕووح دا ، جا یان بە زیادەڕەوی کردن لە لایەنی ماددەی‌دا لەسەر حیسابی ڕووح کە جووەکانن، یان بە زیادە ڕەوی لە لایەنی ڕووحی‌دا لەسەر حیسابی لەش کە نەصرانی یەکانن .



Scanned by CamScanner

# گەوهەری حەوتەم

شکی تێدا نیە کە هەر پیت و بڕگە و وشەیەکی ئەم قورئانە مەزنە بە تەرازوو و کێشان و پێوان لەجێی خۆیدا ڕۆنراوە و لە هیچیدا گوتزەکاری بەکارنەهێنراوە، (سبحان الله).

لەم ئایەتەش دا کە جوو و مەسیحی یەکان لە ئاقار موسڵمانەکان دا رادەگیرێن و قەرار دەگرن نابێ بە خرت و خۆڕایی و بە هەوەنتە بێ، دەبا بزانین چ ڕاز و نهێنی یەك لەوەدا پەنهان کراوە و حەشار دراوە !

١- ئەگەر چاوێك بە سوورەتەکانی قورئانی قسە لەجێدا بگێرین دەبینین لە چەندین جێگەدا باسی فێڵ و تەڵەکە و دوژمنایەتی جوولەکە و دیانەکان دەکات سەبارەت بە میللەتی ئیسلام بۆ وێنە:

لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم﴾ ، (١٢٠).

واتە: جوولەکە و دیانەکان بە هیچ ڕەنگێك لێتان ڕازی نابن و واز نایەنن هەتا نەکەویە شوێن ئایینەکەیان.

هەروەها لە هەمان سوورەت دا دەفەرموێ: ﴿ وقالوا لن يدخل الجنة الا من كان هوداً او نصارى﴾، (١١١).

وە گوتیان هیچ کەس ناچێتە بەهەشتێ جگە لە جوو و دیانەکان .

لە سوورەتی (المائدة)ش دا دەفەرموێ: ﴿ وقالت اليهود والنصارى نحن ابناء الله واحباؤه قل فلم يعذبكم بذنوبكم﴾، (١٨).

واتە: جوو و دیانەکان گوتیان ئێمە کوڕانی خوا و خۆشەویستانی وین، بڵێ ئەدی بۆ بەهۆی تاوانەکانتانەوە سزاتان دەدات.



Scanned by CamScanner

لە هەمان سوورەت دا دیسان دەفەرموێ: ﴿ یا أیها الذین آمنوا لا تتخذوا الیهود والنصاری اولیاء...﴾ (٥١).

یانی: ئەی بڕواداران جوو و دیانەکان مەگرن بە دۆست.

٢- ئەگەر سەیرێکی واقیعی مێژووش بکەین دەبینین کە هیچ گەل و نەتەوەیەک هێندەی جوو و دیانەکان ئازاری مسوڵمانانیان نەداوە و زیانیان پێ نەگەیاندوون.

فێڵ و تەڵەکە و هەوڵی ڕۆژ و شەوی جووەکانی هەرسێک تیرەی (بني النضیر) و (بني قنیقاع) و (بني قریظة و جووەکانی (خیبر) و (فلسطین) دیمەنێکی زەقن لە مێژووی ئیسلامی‌دا.

هەروەها جەنگی ڕۆمەکان و شەڕی درێژ خایەنی خاچ پەرستەکان و فێڵ و تەڵەکەی لە ژمارە نەهاتووی دیانەکانیش لە کەس پەنهان نین.

٣- بۆ خاتری وەی چاکتریش لە دوژمنایەتی جوو و دیانەکان حاڵی بین سەبارەت بە موسڵمانان پتر قسە لەجێی قورئانمان بۆ ڕوون بێتەوە وای بە چاک دەزانم دەستی خوێنەری بەڕێزم بگرم و گەشتێکی چەند دەقەیی پێ بکەم لە نێو بیشەڵانی فێڵ و تەڵەکە و پیلانی جوو و دیانەکان دا، بۆ و مەبەستەش تەنیا دوو سەرچاوەی ئەو دوو نەتەوەیە هەڵدەبژێرم لە نێو دەیان سەرچاوەیان دا:

یەکەم: کتێبی : (بروتوکولات حکماء صهیون) یان (الخطر الیهودي)

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە کۆمەڵێک نەخشە و پیلانی جووەکان بۆ ژێر دەست کردنی هەموو گەلە غەیرە جووەکان، کە لە (٢٤) کۆڕدا گوتراون و ڕێک خراون. هەڵبەتە پڕ بە دڵ حەزم دەکرد کە بۆ خۆم یان یەکێکی دی بۆی لوابا

هەموو کتێبەکەی وەرگێڕابایە سەر زمانی کوردی بۆ خاتری وەی گەلی کوردی خۆشەویستمان بە زمانەکەی خۆی ئاگاداری فێڵ و تەڵەکە و پلانی سەهیۆنیزمی جیهانی بووبایە، بەڵام هەرچۆنێك بێ چەند وێنەیەکی لێ دەخەینە بەرچاوی خوێنەران، کەمیش نیشانەی زۆری یە :

## گوڵبژێریکی کتێبی ( برۆتۆکۆلات )

١- لە (برۆتۆکۆل)ی یەکەم دا دەڵێین:-

(... سیاسەت بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ڕەوشت و ئەخلاق دا ناگونجێ، ئەو سەرکردەی پابەندە بە ڕەوشتەوە سیاسی یەکی هەلکەوتوو و لێزان نیە، لەبەر ئەوە لەسەر کورسی حوکم چەسپاو نیە.

بابای حوکم خواز ناچارە پەنا بەرێتە بەر فێڵ و ڕیابازی، چونکە ڕەوشتە بەرزەکانی مرۆڤایەتی وەك دڵسۆزی و دەست پاکی لە سیاسەت دا دەبنە ڕەوشتی نزم و نالەبار.

... پێویستە ئەوانە خەسڵەتی وڵاتە غەیرە جووەکان بن، بەڵام ئێمە ناچارین هیچ کاتێك بەو ڕەوشتانە پابەند نەبین...

هەروەها لەهەمان پرۆتۆکۆل هاتوە:[1]

(... وە لە نێو نەصرانی یەکان دا کەسانێك هەن کە شەراب گومرای کردوون، وە گەنجەکانیان وەك شێتیان لێ بەسەر هاتوە بەهۆی ئەو داوێن پیسی و خراپە کاری یەی کە مامۆستایانی ئێمەو خزمەت کارەکانمان و کارەکەرەکانمان لە ماڵە دەوڵەمەندەکان داو ئافرەتانمان بۆیان هێناونە کایەوە...).

(١) سەیری سەرچاوەی ناوبراو بکە (بروتوکول) ی یەکەم، لاپەڕە (١٠٦-١٠٩).



Scanned by CamScanner

٢- له (برۆتۆكۆل)ی دووەمیش دا هاتوە:[١]

(...وا مەزانن كە قسەكانمان چەند وشەیەكی بێ نێون، دیقەت بگرن: سەركەوتنی داروین و ماركس و نیتشە، هەر لەبەرایی‌دا نەخشەمان بۆ كێشا بوو، هەڵبەتە شوێنەواری بێ ئەخلاقیانەی ئەو چەشنە بیردۆزانە (بیردۆزەی ماركسیزم و داریونیسم و نیتشە) لە بیر و باوەڕی گەلە ساویلكەكان (غەیرە جووەكان) دا زۆر ئاشكرا دەبێت).

٣- له (بروتوكۆل)ی سێیەمیش گوتراوە:[٢]

(... ئێمە گەلەكان دەخەینە ژێر ڕكێفی خۆمانەوە بەهۆی سوود وەرگرتن لە هەستی حەسوودی و بوغزو قین، كە لە ئەنجامی هەژاری و تەنگ و چەڵەمەدا لە دایك دەبن، وە سوود وەرگرتن لە هەمان هەست و ئەست شێوازی مە دەبن بۆ ڕامالینی هەموو ئەوانەی لە ڕێمان دا دەبنە پەرچ!).

واتە لە ڕێی پەیدا كردنی حەسوودی و دووبەرەكی و یەكتر بوغزاندن لە نێوان گەلان دا و بەهۆی خولقاندنی هەژاری و كوێرەوەری ئەو گەلانە دەخەینە ژێر ڕكێفی خۆمانەوە.

٤- له (بروتوكول)ی چوارەم دا دەڵێن:

(..لە سۆنگەی ئەوەوە پێویستە لەسەرمان كە هەموو جۆرەكانی ئیمان و بڕوا بڕووخێنین، جا هەرچەندە ئەنجامی كاتی‌ی ئەو هەڵوێستەش بێ گمیاندنی كۆمەڵێك لامەزەب و بێ بڕوایە، ئێمە زۆر گوێی نادەینێ..)[٣].

(١) سەرچاوەی پێشوو (بروتوكول)ی دووەم، لاپەرە (١١٣).
(٢) سەرچاوەی پێشوو (بروتوكول)ی سێیەم، لاپەرە (١١٦).
(٣) سەرچاوەی پێشوو (بروتوكول)ی چوارەم، لاپەرە (١٥٢).



Scanned by CamScanner

٥- لە (بروتوکول)ی پازدەمیش دا گوتراوە:

( ئێمە لە کاتێك دا دەبینین هەموو جیهان دووچاری دڵە ڕاوکێ و پەژارە بووە ئەوە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە پێویست بوو ئاوا تووشی دڵەڕاوکێ و خەم و خەفەتی بکەین.. بۆ وەی پتەوی و خۆڕاگری یەکەی بشکێنین.)[1].

٦- لە (بروتوکۆل)ی حەڤدەم دا دەڵێین:[2]

(ئێمە گرنگی‌یەکی زۆرمان تەرخان کردوە بۆ کەم کردنەوەی ڕێزی پیاوانی ئایینی لە گەلە غەیرە جووەکان دا لەبەر چاوی خەڵکی، بەوەش سەرکەوتنمان وەدەست هێناوە کە زیان بگەیەنین بە ئایینەکەیان، ئەو ئایینانەی کە کۆسپێکی سەختن لە ڕێگەمان دا..).

خوێنەری ئازیز !

ئەوانە چەند نموونەیەك بوون لە فێڵ و تەڵەکە و پیلانی (سەهیونیزم)ی جیهانی نەك هەر دژ بە ئیسلام و موسڵمانان، بەڵکو دژ بە هەموو مرۆڤایەتی .
ئێستاش با بچینە سەروکاری فێڵ و تەڵەکە و پیلانی مەسیحیەکان دژ بە ئیسلام و موسڵمانان :

(١) سەرچاوەی پێشوو (بروتوکۆل)ی پازدەم، لاپەرە (١٥٧).
(٢) سەرچاوەی پێشوو (بروتوکۆل)ی حەڤدەم، لاپەرە (١٦٧).



Scanned by CamScanner

دووەم : کتێبی ( الغارة علی العالم الاسلامي )( هێرش بردنە سەر جیهانی ئیسلامی) :

کە بریتی‌یە لە باسێکی دوور و درێژ سەبارەت بە چالاکی و هەوڵ و تەقەللای جووڵانەوەی (تبشیر) (بە مەسیحی کردن) لە جیهانی ئیسلامی‌دا، کە گۆڤاری (مجلة العالم الاسلامي) فەڕەنسایی بڵاوی کردەوە لەساڵی (١٩٣٠)ی زایینی‌دا.

هەڵبەتە لەو کتێبەدا نەخشە و پیلانی مەسیحی‌یەکان خراوەتە ڕوو سەبارەت بە چۆنیەتی تێکۆشان و چالاکی مەسیحی‌یەکان لە جیهانی ئیسلامی‌دا، بێ گومان زۆرم حەز دەکرد کە ئەو کتێبە بە دەست و پەنجەیەکی ئیسلامی کورد زمان وەرگێڕرابایە سەر زمانی کوردی، بۆ خاتری وەی گەلی کوردی خۆشەویستمان بە زمانەکەی خۆی نەخشە و تەڵەکە و پیلانی مەسیحی‌یەتی جیهانی دیبایە دژ بە ئیسلام و موسڵمانان.

## گوڵبژێرێکی کتێبی (الغارة علی العالم الاسلامي)

ئێستاش لەم دەرفەتە تەسکەدا گوڵبژێرێکی ئەو کتێبە دەکەین و چەند نموونەیەکی لێ دەخەینە ڕوو:

١- لە ژێر سەردێڕی بڵاو کردنەوەی مەسیحایەتی لە (ئەفریقیا)دا گوتراوە: [١]

مستر (بولس) گوتوویەتی: ئایینی ئیسلام تاقە کۆسپی سەر ڕێگەی بڵاو کردنەوەی مەسیحایەتی‌یە لە (ئەفریقیا)، وە مرۆڤی موسڵمان تاقە دوژمنی سەرسەختی مەیە چونکە بڵاو بوونەوەی (ئینجیل) نە نەفامی

(١) (الغارة علی العالم الاسلامي) لاپەڕە (١٥).



Scanned by CamScanner

دانیشتووان نە بت پەرستییان نە تێکۆشانی گەلە مەسیحیەکان و غەیرە مەسیحی یەکان بەرهەڵستی بۆ پەیدا ناکەن.

٢- لە ژێر ناوونیشانی : کۆنگرەی قاهیرەی ساڵی (١٩٠٦)دا گوتراوە: [١]

(..لە (٤)ی (ابریل)ی ساڵی (١٩٠٦) گۆنگرەکە دەست پێ کرا لە ماڵی (عرابی باشا) وە ژمارەی نوێنەرانی (تبشیر)ی ئەمریکایی لە هینـد و سوریا و وڵاتە عوسمانی یەکان و فارس و میسرەوە هاتبوون (٢١) بوون، وە نوێنەرانی (تبشیر)ی ئینگلیزی (٥) بوون، وە لەو گۆنگرەیەدا نوێنەرانی ئیسکت لەندا و ئەڵمانیا و هولندا و سوید و دانمارك بەشداریان کردبوو، وە (زویمر) سەرۆکی کۆنگرەکە بوو.

بەرنامەی کۆنگرەکەش بەم جۆرە بوو:

کورتەیەك دەربارەی سەرژمێری موسڵمانان لـە دنیـادا، ئیـسلام لـە ئەفریقیادا، ئیسلام لە ژێر ڕکێفی عوسمانیدا ، ئیسلام لە هینددا، ئیسلام لە ئێران دا، ئیسلام لە ئەفغانـستان دا، ئیـسلام لـە چـین دا، ئـەو بـڵاو کراوانەی کە پێویستە لە نێو موسڵمانان دا بڵاو بکرێنەوە چ موسڵمانانی ڕۆشنبیر و چ عەوام، ئینسان کردن بە مەسیحی، هەڵگەڕانەوە لـە ئـایین، شێوازەکانی فریاکەوتنی ئەوانەی بوونە مەسـیحی، کاروبـاری ئافرەتـانی ئیسلامی، چەند باسێك کە پەیوەستن بە پەروەردە کردنی (مبشر)ەکـان و پەیوەندی نێوانیان و چۆنیەتی فێرکردن لە ئیسلام دا.

هەموو ئەم باسانەش لە کتێبێـك دا کۆکراونـەوە بـە نـاوی (وسـائل التبشیر بالنصرانیة بین المسلمین) شێوازەکانی بە مەسـیحی کـردن لـە نێـو موسڵمانان دا .

(١) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٩).



Scanned by CamScanner

٣- (..دوایی (زویمر)ی قەشە کتێبێکی دەربارەی بڵاو کردنەوەی مەسیحایەتی بڵاو کردەوە بە ناوی (جیهانی ئیسلامی هاوچەرخ).

لە بەشی یەکەمی ئەو کتێبەدا باسی ئـەو ڕێگەیـە کـراوە کـە پێویـستە بگیرێتە بەر لە مەیدانی بە مەسیحی کردن (تبشیر)دا.

لە بەشی دووەم و سێیەم دا باسی ئەو کۆسپانە کراوە کە دەبنـە پـەرچ و تانە لە ڕێی مەسیحی کردنی عەوامەکان داو چەند شێواز و ئامرازێـك بـاس کراون کە دەبنە هـۆی سـەرنج ڕاکێـشانی موسـڵمانان و خۆشەویـست کردنـی (مبشرُ)ەکان لە کن موسڵمانان.

گرنگترین ئەو ئامراز و هۆیانەش ئەمانەن:

١) مۆسیقا لێدان چونکە ڕۆژهەڵاتیەکان زۆریان مەیل لێیە.

٢) دامەزراندنی دام و دەزگا پزیشکی‌یەکان لە نێو موسڵمانان دا.

٣) فێر بوونی (دیالێکت) و زاراوەکانی عەوام.

٤) خوێندرانی قورئان تا بزانن چی تێدایە.

٥) گفتو گۆ کردن لەگەڵ عەوامی موسڵمانان بە پێی ئاستی ژیری‌یان.

٦) خوێندنەوەی وتارەکان بە دەنگێکی نەرم و فەسیح.

٧) نابێ وشەی بێگانە لە ووتارەکان دا بەکار بهێنرێ.

٨) پێویستە زۆر گرنگی بە هەڵبژاردنی باسەکان بدرێ.

٩) پێویستە شارەزایی نەفسیەتی ڕۆژهەڵاتی‌یەکان بن.

نووسەر ئەم دوو بەشەی کتێبەکەی بەوە کۆتایی پێ هێنـاوە کـە زۆربـەی ئەوانەی بوونە مەسیحی عەوام و نەخوێندەوارەکانن.



Scanned by CamScanner

لە بەشی چوارەم دا باسی ئەو کۆسپ و تەگەرانە کراوە کە لە ڕێی بە مەسیحی کردنی موسڵمانە ڕۆشنبیرەکان دا هەن.

لە بەشی پێنجەم دا نووسەر باسی ئەوەی کردوە کە لە کۆنگرەدا باس کراوە سەبارەت بەو بڵاو کراوانەی پێویستە لە نێو موسڵمانان دا بڵاو بکرێنەوە بۆ وەی بیان کەی بە مەسیحی.

نووسەر دەڵێت: دکتۆر (اراهاس) کە پزیشکی (تبشیر)ە لە شام دەڵێت: (۳۲) ساڵم بەسەردا تێپەڕیوە خەریکی ئەو پیشەیەم (پیشەی بە مەسیحی کردن) هەتا ئێستا بێ هیوا نەبووم تەنیا دوو جاران نەبێ، ئەویش لە کاتی بەرگری کردنی دەوڵەتی عوسمانی یان یەکێك لە شێخەکان لە دووان لەوانەی دەهاتنە لام.

وە ئەو دکتۆرە سەرژمێرێکی هێناوە سەبارەت بە وانەی دەچنە لای گوتوویەتی: ٦٨ ٪ یان موسڵمانن و نیوەی ئەوانەش ئافرەتن، وە یەکەمین ساڵی هاتنی هامۆشۆکەرانی گەیشتە (۱۷۵) و لە کۆتایی ساڵی نیش کردنیدا گەیشتوونە (۲۵۰۰).

ئینجا دکتۆر ئاوا کۆتایی بە قسەکانی هێناوە:

(پێویستە لەسەر پزیشکی (تبشیر) هیچ کاتێك فەرامۆش نەکات کە ئەو (مبشر)ە بەر لەوەی پزیشك بێ !!).[1]

٤- کاروباری ئافرەتان لە (تبشیر)دا:[2]

ئەم باسە بایەخێکی تەواوی پێ درابوو لە نێو ئەندامانی کۆنگرەی ناوبراودا چونکە تایبەتە بە نیوەی موسڵمانانی دنیا، (المس ولسون) گوتی:

(۱) کتێبی ناوبراو، لاپەڕە (۱۹، ۲۰، ۲۱، ۲۲، ۲۳، ۲٤).

(۲) سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (۲٤).



Scanned by CamScanner

ژنانی (مبشرە) پەنا دەبەنە بەر قوتابخانە و عیادە پزیشکی‌یەکان و سەردانی دێیە جووتیاری‌یەکان تاکو مەسیحایەتی بلاوکەنەوە.

٥- کۆنگرەی ادنبرج سالی (١٩١٠)[1].

ئەم کۆنگرەیە لە مانگی سبتمبری سالی (١٩١٠) بەسترا .....
نیشەکانی ئەو کۆنگرەیە لە (٩) بەرگ دا بلاو کرانەوە.

لەو کۆنگرەیەدا (١٢٠٠) نوێنەر بەشداریان کرد، کە لەنێو وان دا (٥٠٢) یان ئینگلیز بوون و (٥٠٥) یان ئەمریکایی بوون تەنانەت (مستر روزفلت) سەرۆك کۆماری ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایی پێشوو یەکێك بووە لە نوێنەرە ئەمریکایی‌یەکان بەلام نامەیەکی ناردوە و عوزری هێناوەتەوە لەبەر ئامادە نەبوونی.

وە گۆڤاری (الشرق المسيحي) دەلێت:

(تبشیر)ی ئینگلیزی و ئیرلەندی سالێ (٢,١٠٠,٠٠٠) جونیە لە رێی (تبشیر)دا خەرج دەکەن، ئەمریکا و کەنەداش سالی (٢,٠٠٠,٠٠٠) جونیە خەرج دەکەن.

ئوستراليا و ئەفریقا و ئاسیا و هۆلەندا (٣٠٠,٠٠٠) (جنیە) خەرج دەکەن، وە باقی دام و دەزگاکانی (تبشیر) لە باقی کەرتی ئەورووپادا (٧٠٠,٠٠٠) (جنیە) خەرج دەکەن.

لە هەمان گۆڤاردا هاتوە:

کە سوپای (تبشیر) دەگاتە (٩٨,٣٨٨) مبشر، چەند لیژنەیەك پالپشتیان دەکەن ئەندامەکانیان دەگەنە (٥,٥٠٠,٠٠٠) کەس، وە ئەو

[1] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٠).



Scanned by CamScanner

ژن و پیاوانەی تەورات بڵاو دەکەنەوە و بەشداری دەکەن لە بە مەسیحی کردن و ئامۆژگاری‌دا دەگەنە (٩٢,٩١٣) کەس، وە پەیمانگا کڵێسایی‌یەکان دەگەنە (١٦,٦٧١)...وە ژمارەی ئەو مامۆستا و قوتابیانەی لە ژێر چاودێری (مبشرین) دان دەگەنە (١,١١٠,٦٠٢) ، وە (٨١) قوتابخانە و زانکۆیان لە ژێر دەست دا هەیە و (٧,٩٩١) قوتابی تێدایە و (٤٨٩) قوتابخانەی دینیان هەیە بۆ فێر کردنی مەسیحایەتی و دەرچواندنی مامۆستایان لە (مبشر)ان کە (١٢,٥٤٣) قوتابی‌یان تێدایە.

دیسان (١,٥٩٤) قوتابخانەی ئامادەیی‌یان هەیە (١٥٥,٤٢٠) قوتابی‌یان تێدایە، وە (٢٨,٩٠١) قوتابخانەی سەرەتایی‌یان هەیە ژمارەی قوتابی‌یەکانی (١,١٦٥,٢١٢) دەبێ، جگە لە (مبشر)ەکان (١١٣) قوتابخانەی باخچەی ساوایانیان هەیە کە (٤,٧٠٣) منداڵی تێدایە. دیسان (٥٥٠) خەستەخانەیان دروست کردوە لەگەڵ (١٠٢٤) دەرمانخانە (٤,٠٠٠,٠٠٠) کەس هاموشۆیان دەکەن...وە (٢٦٥) پەناگایان دروست کردوە بۆ هەتیوان و (٨٨) بۆ ئەوانەی بەڵەکن و (٢١) بۆ منداڵانی بەڵەک، وە سەرپەرشتی (٢٥) قوتابخانەی کوێران و (١١) پەیمانگای فریاکەوتن و (١٠٣) پەناگا بۆ تریاکی‌یەکان و (١٥) پەناگا بۆ بێوەژنان دەکەن.

ئەوە هەمووی ساڵی (١٩٠٢) بووە. خۆ ئەگەر بەراووردی پێ بکرێ لەگەڵ سەرژمێری ساڵی (١٩١١)دا هەڵکشینێکی زەبەلاح دەبینرێ لە هەموو شتێك دا.

٦- کۆنگرەی (لکنو) سالی (١٩١١)ی ز.

(مبشر)انی ولاتە ئیسلامیەکان دووەمین کۆنگرەی گشتی‌یان لە (لکنو الهند) بەست لە (٢١)ی ینایری سالی (١٩١٨) واتە (٥) سال پاش بەسترانی کۆنگرەی قاهیرە، هەلبەتە سەرۆکی ئەم کۆنگرەیەش (زویمر) ی قەشە بوو.

لەو کۆنگرەیەدا (١٦٨) نوێنەر و (١٣) میوان بانگ کرابوون.

١) توێژینەوە و گفتوگۆ کردن سەبارەت بە بارودۆخی ئەمڕۆ.

٢) هاندان بۆ فراوان کردنی مەیدانی فێر کردنی (مبشر)ەکان و فێر کردنی ئافرەت.

٣) ئامادە کردنی هێز و ئامرازی تەواو و بەرز کردنەوەی ئاستی خەبات کردن.

خوێنەری ئازیز ئەوە مشتێك بوو لە جەوالێك لە فێل و تەلکە و پیلانی مەسیحیەتی جیهانی دژی ئیسلام و موسلمانان !!



Scanned by CamScanner

# لە کۆتـایی دا

## خوێنەرانی ئازیز و بەڕێزم :

سوپاس بۆ خوای خاوەن بەخشش و چاکە کە یارمەتی داین کاتێکی خۆش پێکەوە بەسەربەرین لەبن سێبەری یەکێك لە درەختە پڕ پیت و پیرۆزەکانی باخی قورئانی مەزن دا، یارمەتی داین گەشتێکی خۆش بکەین بە نێو دەریای دەوڵەمەندی پڕ گەوهەری یەکێك لە سووڕەتەکانی قورئان دا.

سوپاس بۆ خوا کە توانیمان (٣٣) دانە گەوهەری بە نرخ و گرانبایی بە دەسمایەی زانیاری کەم و هیچ بە بەرەوە نەبوومان لە کۆگای ئاوەدانی سوڕەتی فاتیحە بکڕین !

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە تا لە گۆشەیەکی دیکەی بەرنامەی خوادا بە دیدارتان شاد دەبمەوە، خوا حافیزیتان لێ دەکەم بتان سپێرم بە باوەشی پڕ سۆزو بەزەیی پەروەردگاری مەزن و باڵا دەست .

ئەمما بەر ئەوەی لێك جوێ بینەوە با وێکڕا ئەو فەرمایشتە پیرۆزەی پێغەمبەرمان ﷺ بەزار بڵێین و بە دڵ سەرنج بدەین:

((اللهم اني اعوذ بك من قلب لا يخشع ، ومن دعاء لا يسمع ، ومن نفس لا تشبع، ومن علم لا ينفع، اعوذ بك من هؤلاء الاربع))[1].

ئەی خوایە پەنات دێنمە بەر، لە دڵێك کە _لێت_ ناترسێ و ناچلەکێ، وە لە پاڕانەوە و سکاڵایەك کە نابیسترێ و قبووڵ نابێ، وە لە نەفسێك کە تێر

---

(١) ترمذی و نسائی لە (ابن عمر)ەوە ڕیوایەتیان کردوە.



Scanned by CamScanner

# فەرهـەنگیلـەی پوختـەیەک دەربارەی ئیسـلام

## پیتـــی ( ئـ )

ئاوەزژیری : بیروهۆش

ئاقار: ئاقاست ڕاست بە ڕاست، بەرامبەر

ئاوابەم شێوەیە : بەم جۆرە

ئاستەنگ : لەمپەر تەگەرە، کۆسپ

ئاوروچکە : ئاگرێکی بچووک

ئاماژە : ئیشارە

ئێرەیی : حەسوودی

ئێرەکانە : ئێرە ، ئەم شوێنە ئەنگوستە چاوتاریک و تەڵـــەم، تاریکی‌یەکی‌دا ئەگەر پەنجەت بە چاوان دا بکـــەن نەی بینی .

ئەنگاوتن : پێکان لێدان

ئەبڵەق بوون : چاو زەق بوون لە ترس و حەژمەتان

## پیتـــی ( ب )

بەرهەست : هەست پێ کراو . (محسوس)

بە هەڵێم : زەبر بە دەست ،گورج و گۆڵ

بە هەویا: بەتەما ، بە ئومێد

بێ خەوش: بێ گەرد ، بێ لەکە

برێك : تۆزێك، هەندێك، نەختێك

بۆ خاتری وەی : بۆ ئەوەی

بێ ئەمیەت : بێ بایەخ، بێ نرخ.

برست :. هێز و توانا، وزە

بارتەقا : ئەندازە

بەراوە ژوو : پێچەوانە

بێ ڕەزا : زەبەلاح، گەورە، بێ ئامان

بەتەنێ : بە تەنیا، بە تەنها

بەرینگ پێ گرتن : بەخە پێگرتن، بەرۆك پێگرتن، دەگۆ ڕاچوون .

بەو پێودانە : بەو شێوەیە، بەو دەستوورە

بۆ دەتانێ خستن : بۆ سەلماندن، قەناعەت پێ هێنان

بارێ بنەوە : لای بنەوە، لای ژێرەوە

بریکار : برێتی، جێگر، (بدیل).

بەچاو ئەنگاوتن : بینین، دیتن.

بۆوە : بۆ ئێوە.

بزر بوون : وون بوون، گوم بوون.

بوغزاندن : ڕق لێ هەستان ، دزان.

بەرلەوەی پێش ئەوەی.

بیور تەور.

بە شێنەیی : بە هێواشی، بە ئارامی



Scanned by CamScanner

## پیتی ( پ )

پشك: بەش ، پارچە ، پارچە گۆشتی گچکە.

پاتاڵ : ماڵات، ئاژەڵ، ولسات.

پەزمەندە کردن : کۆکردنەوە، وەسەرێك نان.

پاڵەپەستۆدان : وەپێش خۆ دانی یەکێك بە پاڵ، پاڵ پێوە نان بەرەو پێشەوە.

پەرەم پەرەم : پارە پارە، لەت لەت ، پارچە پارچە.

پێڕۆ : پیادە، سەڵتەزەلام.

پەسلان : دوا ڕۆژ ، قیامەت.

پراکتیك کردن : جێبەجێ کردن، (تطبیق).

پێ پیلکە : پلیکانە

پەرتەوازە : پرژو بلاو، بێ سەرەوبەرە.

پێڕۆچکە : تازە پێ هەلگرتوو،منداڵی تازە فێرە ڕۆ یشتن بوو.

پێهەلا چوون : بەرز بوونەوە، بالا چوون.

پێکەڵ پێك : هاوسەنگ، هاوئەندازە، پێکاوپێك.

پتر : زیاتر .

## پیتی ( ت )

تێك ترینجاو : تێك پەستێوراو، پێکەوە چەسپ کراو.

تێکەوە راشەقاندن : هەژاندن، راوەشاندن.

تێك هەڵپرژان : تێك هەڵگلان، لە گژیەك راچوون.



Scanned by CamScanner

ترومبێل : ئۆتۆمۆبیل، سەیارە ، ماشێن.

تێڕادێن : تێراپەڕموون.

تێکەوە پێچران : کۆکرانەوە پێچرانەوە.

تێک گیران : تێک ئالقان.

تێوەڕامان : سەرنج دان، وردبوونەوە.

تەبایی : ئاشنایی، برایەتی، ڕێك و پێکی، پێکەوە هەلکردن.

تاف : دەم، کات ، هەرەت.

تفنك : کونە لووت.

## پیتی ( ج )

جویێ کردنەوە : جیاکردنەوە، جودا کردنەوە.

جحێل : گەنج ، لاو ، هەرزەکار.

جلێتاو : لێزماو، باتلاغ.

## پیتی ( چ )

چاو لە قووچ نان : چاو نووقاندن.

چۆرتم : گەروگرفت، تەنگ و چەڵەمە.

چێرە گرتوو : موچڕ، سوور بوو لەسەر شتێك.

چەپلەك : ناشێ، نەزان، ناکارامە.

چما : بۆچی، لەبەرچی، لۆ.

چەمك : واتا، مەبەست، (مفهوم).

چیدی برناکا : چی‌تری لە توانادا نیە، بڕ کردن: توانا بەسەرداشکان.



Scanned by CamScanner

## پیتــی ( ح )

حەوجێ : ئاتاج، پێویست.

خەفە بوون : کوژانەوە، خامۆش بوون.

خوتخوتە : وەسوەسە، دنەدان بە لای خراپەدا.

بەخرت و خۆڕایی : لەخێش و پێشەوە، بێ سوچ و بەهانە.

خۆی خڕ هەڵداوە : خۆی ئامادە کردوە قمی لێ خۆش کردوون

خڕ لەسەر ئەوەن : تێکڕا لەسەر ئەوەن.

## پیتــی ( د )

دزێو : ناقۆڵا، ناشیرین، ناجوان.

داکۆکی : (تاکید).

دایم و دەرەم : بەردەوام، هەموو کاتێك.

دەمە زەرد کردنەوە : تیژ کردنەوە.

دەرنەبردن : وەستان، نەتوانین، برست لێ بڕان.

دەسەریەوە ناچێ : لێ ی قبوڵ ناکرێ، وازی لێ ناهێنرێ.

دانوویان پێکەوە ناکوڵێ: پێکەوە مەدار ناکەن، پێکەوە هەڵناکــــەن، پێکەوە ناسازێن.

دەقانێ خستن : سەلماندن، ئیقناع بوون.

دەی ئاژوێ : لێ ی دەخوڕێ.

دەبەرڕا چوون : بەگژدا چوون، مل ملانێ لەگەڵ دا کردن، خــــۆ دەبەرڕا کردن.

دەمە دمێ : مشت و مڕ، وتووێژ، شەرە قسە.



Scanned by CamScanner

دڕدۆنگ : گوماندار، دڵ کرمێ، دوو دڵ.

دەلاقە : پەنجەرە.

## پیتی (ز)

زراو چوون : تۆقین، ترسانێکی زۆر.

زەڕەبین : وردبین، میکرۆسکۆب.

زیز بوون : توورە بوون، قەڵس بوون، پۆز بوون.

زەین : ژیری، بیروهۆش .

زەوت نەبوون : مەرزەم نەبوون، کۆڵ نەدان، واز نەهێنان.

زەبەلاح : زۆر گەورە، بێ ڕەزا.

## پیتی (ژ)

ژیار : شارستانەتی ، (الحضارة).

ژیکەڵە : جوانکیلە ، قشت و لەبار.

ژار : ژەهر.

## پیتی (ڕ)

ڕۆهێشتن : قووت دان، شت نەودیو کردن لە گەروو.

ڕەچاو کردن : لەبەرچاو گرتن.

ڕاپازنەراو : گوشراو.

ڕاز : نهێنی.

ڕەکار خستن : خستنە ئیش.



Scanned by CamScanner

ڕێشمە : جڵەو ، ئەوسار.

لە ڕاستێك ڕا هاتن : دەگژیەك ڕاچوون، مل دەبەر ملی یەك نان

ڕێی ناکەوێ : لێی ناوەشێتەوە، بۆی نیە، حەددی نیە.

ڕۆنان : دانان.

ڕەوینەوە : پرینگانەوە، دوورکەوتنەوە.

ڕیز پەڕ : دەگمەن، بیژۆك، (شاز).

ڕێکار : ئاست (مستوی).

## پیتی ( س )

سامەرەستویی : موچڕی، سووری لەسەر شت.

ساتمە بردن : هەڵەنگوتن، لێرەدا مەبەست بەهەڵەدا چوونە.

سکە : پارە (عملة)، دراو.

سەرە پیتکە : سەرەپەنجە.

سەرەخەری : عینادی، نەسەلماندن، بۆ دەتانێ نەخستن.

سەرانگوتلك : سەرنوتڵك، زیلدان، گوفەك.

سێنایی : ئاسان.

لە سۆنگەی ئەوەوە : بەهۆی ئەوەوە، لە ئەنجامی ئەوەوە.

سپیایی : شیر و بەرهەمەکانی شیر.

سەری دنیایەی لێ وێك دێتەوە: دنیای لێ تەنگ دەبێ،کینایەیە بۆ خەم و پەژارەی زۆر.

سەرتاپا : سەر لەبەر، تێکرا.

سەنگەر : سپێر.



Scanned by CamScanner

## پیتی ( ش )

شتاقیان : هیچ کامیان (زیاتر بۆ دوو شت بەکاردێ).

شەقاو : هەنگاو، لۆقاو.

شەك : کەل و پەل.

شۆق : تیشك، ڕووناکی.

شێوێ شێتەی : چێشتی بابای شێت، کینایەیە بۆ شتی تێکەڵ و پێکەڵ و بێ سەرەوبەرە.

## پیتی ( ق )

قوچکە : نیشانەی سەر ڕێگا .

قایل بوون : ڕازی بوون.

قەلەفسە : بەری ڕووەکی گوژاڵك، (حنظلة).

قامك : پەنجە.

قەڵس : تووڕە، ناڕازی، ناسەرسەنگ.

قوتار بوون : ڕزگار بوون، دەرباز بوون.

قم بوون : نقووم بوون، وون بوونی تەنێك لە نێو تەنێکی تردا.

قاورمە : گۆشتی سوور کراوە.

## پیتی ( ڤ )

ڤامرانەوە : وەرگران، لێ ی دەڤامرێتەوە: لێ ی وەردەگێڕێ.

ڤیسق کردن : قۆرت کردن، پێچ کردنەوە.

ڤیتی ویە : سرووچی ویە، خەتای ویە، هزی ویە.



Scanned by CamScanner

فیتوو : فیتە، فیکە.

فابریقە : کارخانە، کارگە.

گۆزین : تاین، فلانەشتی نەزانراو.

فرچکیان پێوە گرتوە : خوویان پێوە گرتوە، بە ساوایی باریان پێوە گرتوە

فرووزایی بە نابینێ : هیچ نابینێ، حەشتەبای نابینێ.

## پیتـــی ( ك )

کەڕەت : جار.

کوڵ و دۆیە خۆی لێ گرت : تۆڵەی خۆی لێ کردەوە، لێی وەڕەز بوو.

کێهە : کامە

کوان : دومەڵ.

## پیتـــی ( گ )

گوژاڵك : جۆرە ڕووەکێکە بەرەکەی وەك شەمامە وایە، بەڵام تا بڵێی تاڵ و ناخۆشە، بەری ئەو ڕووەکە پـــێی دەگوترێ (قەلەسەفە) بە عارەبی (حنظلة).

گۆزین: تاین ، فلانەشتی نەزانراو.

گاڵە دراو : داخراو، قفڵ دراو.

گەرەکە : پێویستە.

گەواهی : شایەتی.

گچکە : چووکەڵە، بچووك، چووك.



Scanned by CamScanner

# پیتــی ( ل )

لاتەڵ : لاسەنگ .

لەباتی : لەجیاتی، لەبری، لەجێی.

لێکدا لیکدا : خێرا خێرا، جار لە دوای جار، بەردەوام.

لەمەڕ من : نی من، هی من.

لەکن وی : لە لای وی، لە نزیك وی.

لینگان : لاقان، قاچان.

لە بنەو پاڵەوە : لە نزیکەوە.

لێ خەفتان : هەوڵ بۆ دان، بە دوادا گەڕان.

لێی دەدڵی : ناگرێ گوێی ناداتێ ،فەرامۆشی دەکا و لـــە دڵ دا ڕق و قینــی لێدا ناگرێ.

لێکـدی : لەیەکتر

لێوەشاوە : لە باران دا هەبوو، شایستە.

لوێچێك : چەنگێك، لوێچ ئەو ئەندازەیەیە کە لە نێوان لەپــی دەست و پەنجەکانیدا جێی دەبێتەوە.

لامەجوومی : سەرەخەری، ئینکاری.

لێی دەگێڕنەوە : بەشداری دەکەن، لێ گێرانەوە: بەشداری کردنی ی یەکێك لە خۆشی یان ناخۆشی یەکێکی تردا.

لێزمە : ڕێژنە، لێشاو، لوزەو.

لام سە للایی : سەرسەرەکی، هاکەزایی، گرنگی نەدان بە شت .



Scanned by CamScanner

## پیتــی (م)

مەلاو مەل : پراوپڕ، دارماڵ، قەڵا پچنە، لێواولێو.

مشوور لێ خواردن : خەم لێ خواردن، بە تەنگەوە بوون.

## پیتــی (ن)

نامۆ : غەریب، نەناسراو.

نالوێ : ناگونجێ، ناسازێ.

نەختێک : تۆزێک، هەندێک، کەمێک.

## پیتــی (و)

وەرسووڕێ : بگەڕێوە، ڕوو وەرگێڕە، بادەوە.

وێڕای ئەوەش : لەگەڵ ئەوەش دا.

وێ چواندن : پێ چواندن، (تشبیه).

وێکڕا : پێکەوە.

وەبەرخۆدان : گرتنە نێو خۆ.

وەسەر خۆنایەنێ: گوێی ناداتێ، ئەمیەتی پێ نادات.

وێ چووتر : لەبارتر، گونجاوتر.

وەپاڵ درێ : بدرێتە پاڵ.

وەرێ کەوتن : کەوتنە ڕێ.



Scanned by CamScanner

## پیتی (هـ)

هەلکشین : بەرز بوونەوە، زیاد بوون.

هەلاواردن : جیاکردنەوە.

هەلّ کوتانە سەر: ڕاکردنە سەر، هێرش بردنە سەر

هەتلە بوون: لە ڕێ لادان، ڕێ ون کردن.

هەلەنگاوتن: لابردن، لادان، ڕوو پێ وەرگێڕان.

هەلوەداسەر: گەردان.

هەلتریزان: هەلّ خلیسکان.

هەلکردن: مەدار کردن، گونجان.

## پیتی (ی)

یەکەباریێ خۆم: بەش بە حالی خۆم.



Scanned by CamScanner

# نێوەرۆک

پێشکەش بێ ........................................ ٦
پێشەکی چاپی نوێ ........................................ ٧
پێشەکی چاپی یەکەم ........................................ ١١
ئەم کتێبە و سورەتی فاتحە ........................................ ١٩
سەرنج دانێکی گشتی لەم سورەتەدا ........................................ ٢٣
ئێستا با تۆزێك بە وردی سەرنج بدەین ........................................ ٢٧
مانای دەقاو دەقی سورەتەکە ........................................ ٣٠
چەند تێبینیەك دەربارەی ئەم سورەتە ........................................ ٣٠
تەفسیری ئایەتی یەکەم ........................................ ٤١
گەوهەری یەکەم :
خواناسی و خواپەرستی شتێکی خوارسك و سروشتیە لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا ........................................ ٤٦
بەڵگەی یەکەم: هەموو پەیدا بوونێك ، پەیدا کەرێکی هەیە........................................ ٤٩
بەڵگەی دووەم : رێك و پێکی و یاسا بێ یاسا دانەر نابێت ........................................ ٦٤
بەڵگەی سێیەم : هەر شتێك بوون و نەبوونی یەکسان بێ پێویستی بە بەدیهێنەرێك هەیە ........................................ ٨٣
گەوهەری دووەم :
( بسم الله ) کردن لە دەمی دەست پێکردنی هەر کارێکدا ........................................ ٩٠
گەوهەری سێیەم : سیفەتە بەرزەکانی خودا سبحانە وتعالی ........................................ ٩١
تەفسیری ئایەتی دووەم ........................................ ٩٥



Scanned by CamScanner

گەوهەری یەکەم : پەروەردیگاریەتی خوا ........................ ٩٦
گەوهەری دووەم : سوپاس و ستایش بەس لایەقی خوایە ........................ ٩٨
گەوهەری سێیەم : بەرزی پلەی پەروەردەکەران لە تەرازووی ئیسلامدا... ١٠٦
شێوازی پەروەردە و خەڵك بانگ کردن بۆ ئیسلام ........................ ١٠٨
گەوهەری چوارەم : هەتا زانیارتر بن خواناس تر دەبن ........................ ١٢٠
گەوهەری پێنجەم :
پەیوەندی نێوان خواو ئینسان لە ڕوانگەی بەرنامەی خواوە ........................ ١٢٣
تەفسیری ئایەتی سێیەم : ........................ ١٢٥
گەوهەری یەکەم : درەوشانەوەی سۆزو بەزەیی خودا لە کائنات ........................ ١٢٦
گەوهەری دووەم :
دروست کرانی بوونەوەر ئەنجامی سۆزو بەزەیی خودایە ........................ ١٣٦
گەوهەری سێیەم :
جۆری پەیوەندی نێوان خوا و بەندە لە ڕێبازی ئیسلام دا ........................ ١٥١
تەفسیری ئایەتی چوارەم : ........................ ١٥٨
گەوهەری یەکەم : ڕۆژی قیامەتێ چیەو چۆن دێتە پێش ؟ ........................ ١٥٩
گەوهەری دووەم : ئەنجامی ڕۆژێ قیامەتێ چیە ؟ ........................ ١٦٥
گەوهەری سێ یەم :
چۆن دەیسەلمێنین کە ڕۆژی دوایی شتێکی حەتمی و پێویستە؟! ........................ ١٧٦
گەوهەری چوارەم :
تاو تەنسیری بڕوا بوون بە پاشەڕۆژ لە ژیانی ئینساندا ........................ ١٨٣
تەفسیری ئایەتی پێنجەم ........................ ١٩٥
گەوهەری یەکەم : خواپەرستی ( عبادة) ........................ ١٩٥



Scanned by CamScanner

گەوهەری دووەم :

خواپەرستی لە ئیسلامدا لەسەر بنەمای خۆشەویستی ڕۆنراوە .......... ٢٠٣

گەوهەری سێیەم :

نزیك كەوتنەوە لە خوا بە كتوپڕی نایەتە دی و خۆڕاگری پێویستە .... ٢٠٨

گەوهەری چوارەم :

ئەركی بەندە بەرامبەر بە خواو ئێ خوا بەرامبەر بەوی ............... ٢١٢

گەوهەری پێنجەم :

پوخت ترین شێوەی خوا بە یەكگرتن ( التوحید ) ................ ٢١٧

گەوهەری شەشەم :

بڕواو كردەوە لێك جویێ نابنەوە ........................ ٢١٩

گەوهەری حەوتەم :

بۆچی ئیسلام گرینگی بە یەكیەتی و پێكەوە جۆش درانی كۆمەڵەی موسوڵمانان دەدات ؟ ........................ ٢٢٩

گەوهەری هەشتەم :

ئیمان و بڕوا تاقە بنچینەی كۆمەڵگای ئیسلامیە .............. ٢٣٢

تەفسیری ئایەتی شەشەم .............................. ٢٣٨

گەوهەری یەكەم :

بەرنامە و ڕێبازی ژیان پێویستە تەنیا لە لایەن خواوە نەخشەی بۆ بكێشری و داڕێژرێ ........................................ ٢٤١

بەلگەی یەكەم :

بێزاری و نارەزای دەربڕینی زاناو مشور خۆرانی وڵاتە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی یەكان سەبارەت بەو بارودۆخەی تێیدا دەژین و بەو ڕێ و ڕەسم و دەستوورانەی



Scanned by CamScanner

حوکمیان بەسەر دا دەکەن ........................ ٢٤١

بەڵگەی دووەم :

ناخۆشی و پر تەنگ و چەڵەمەیی و سەر لێ شێواوی ژیانی دانیشتووانی شارستانیەتیە ماددی دوور لە خواو تا ئیسلامی ئەو رۆژگارە ......... ٢٥٨

گەوهەری دووەم :

تەنیا بەرنامەو رێبازی خوا ڕاست و دروستەو هەر بیروباوەر رێچکەیەکی دیکە خوارو خێچ ناتەواوە ........................ ٢٨٩

بەڵگەی یەکەمی راستی ئەو قسەیە : خستنە ڕووی چەند تابلۆیەکی دڵ بزوێن لە شارستانەتی ئیسلامی ........................ ٢٣٥

بەڵگەی دووەم : خستنە ڕووی ئیعتیراف پێ کردن و گەواهی دانی شارەزایان و لێکۆڵەرەوانی بێگانە سەبارەت بە بێ هاوتایی ئیسلام ........................ ٢٩٩

گەوهەری سێیەم :

بۆچی ئیسلام بە ( الصراط المستقیم ) ناوبراوە ........................ ٣٠٥

چەند رازێکی سەرنج راکێش لەم ئایەتە مەزنەدا ........................ ٣٠٩

تەفسیری ئایەتی حەوتەم ........................ ٣١١

گەوهەری یەکەم ........................ ٣١٣

گەوهەری دووەم ........................ ٣١٤

گەوهەری سێیەم ........................ ٣١٤

گەوهەری چوارەم ........................ ٣١٥

گەوهەری پێنجەم ........................ ٣١٧

گەوهەری شەشەم ........................ ٣١٨

گەوهەری حەوتەم ........................ ٣٢٠



Scanned by CamScanner

گولبژێرێکی کتێبی ( برۆتۆکۆلات ) ........................ ٣٢٢
گولبژێرێکی کتێبی ( الغارة على العالم الاسلامي) .................. ٣٢٥
لە کۆتایی دا ................................. ٣٣٢
فەرهەنگیلە ................................. ٣٣٤
نێوەرۆک ................................. ٣٤٦



Scanned by CamScanner